ناوی کتێب: مێژووی وێژەی کوردی - بەرگی سێیەم
نووسینی: سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٧٢٢
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + فەرهاد ئەکبەری
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٩٤٣ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# پێشەکی

هەر نەتەوەیەک بەهۆی وێژەو زمانەوە زیندووە و ئەوانەی کە بەوێژە و زمانی گەلەکەیان ڕاژەیان کردووە، دیارە هەتا هەتایە لە دڵی خەڵکدا دەژین و نامرن و ئێمەش دەبێ شوێنەوارەکانیان ببووژێنینەوە و لەسەر ڕێی ئەوان بڕۆین.

چەند ساڵ لەمەوپێش بەناوونیشانی: «مێژووی وێژەی کوردی»یەوە، دوو بەرگ پەڕتووکم بەچاپ گەیاند کە داگری سەرگوروشتە و بەسەرهاتی هەندێ هۆنەر و نووسەر و وێژەوان و مێژووزان و فەرهەنگنووسی کورد بوون و لە هۆنراو و نووسراوی هەر کامیان وێنەیەکم هێنابووە و لەسەریان کۆڵیبوومەوە، لەبەرئەوەی لە ماوەیەکی کەمدا چاپەکەی تەواو بوو ئەوا لێرەدا بەرگی سێیەم و ئەو دوو بەرگەکەی ترتان پێشکەش دەکەم کە داگیری بەسەرهات و هۆنرا وو نووسراوی هۆنەران و وێژەوانان و نووسەرانی کوردە کە بەپێی ساڵی لەدایکبوونیان چۆنییەتیی ژیان و هۆنراوەکان و نووسراوەکانیانم خستووەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

ئەڵبەت گەلی کورد هۆنەر و وێژەوان و نووسەری زۆر و بێتو بمانەوێ باسی هەموویان بکەین هەر لێیان نابینەوە بۆیە ئەمەش دەڵێم کە بزانن هۆنەر و وێژەوان و نووسەرەکانمان هەر ئەمانە نین، بەڵکو ئەوەندە هۆنەر و نووسەر وێژەوانمان لێ هەڵکەوتوون کە هەر بۆ نووسینی ناوەکانیان دەتوانین چەند نامیلکە بنووسین و لەگەڵ ئەمەیشە خوا یاربێ و تەمەن ئەمەگ بنوێنێ تێ دەکۆشم کە لە داهاتوودا باسی چەند هۆنەر و بوێژێکی تر بکەم بەتایبەت ئەوانەی کە دیوان و نووسراوی چاپکراویان هەیە، چونکە گەلێ لە هۆنەران و بوێژان کە ناویانم بیستووە سەبارەت بەبەسەرهاتیان هیچ چەشنە بەڵگەیەکم بەدەستەوە نییە تا لە بارەیانەوە شتێ بنووسم و ئیتر هیوادارم لە کەموکوڕیی کارەکەم چاو بپۆشن، چونکە هەر ئەوەم لە دەست هاتووە و ئەوەم پێ کراوە کە تەنیا مەبەستم ڕاژە و سەرکەوتنی نەتەوەی کوردە.

تاران- مانگی خەرمانان ٢٠٠٢

سەدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)

# مێژووی زمانی کوردی

ئەوەی کە ڕوون و ئاشکرایە زمانی کوردی یەکێ لە زمانەکانی هیندوئەورووپاییە و لەگەڵ زمانەکانی تری ئارییایدا خزمایەتیەکی نزیکی هەیە و لە ڕاستیدا دەتوانین بڵێین کە ئەمە هەر ئەو زمانەیە کە مادەکان قسەیان پێ کردووە و چونکە نەژادی کوردەکان دەچێتەوە سەر مادەکان و زۆربەی مێژوونووسانی کورد و بێگانەش لەسەر ئەوەن کە مادەکان باپیرە گەورەی کورد. پرۆفیسۆر سپایزر لای وایە کە هۆزەکانی لۆلۆ و گووتی و کاسی و سۆباری هەرکام زاراویەکی تایبەتیان هەبووە کە زمانەکەیان دەچێتەوە سەر زمانی مادی، بەڵام تا ئێستا هیچ چەشنە بەردەنووسراوێک بەزمانی مادی نەکەوتووەتە دەست تا ئەوەمان بۆ ڕوون بێتەوە، جگە لە چەند وشەیەکی مادی نەبێ کە هیرۆدۆت لە مێژووەکەیدا هێناویە و ئەو وشانەش ئێستاش لە زمانی کوردیدا بەکار دەبرێن.

گەلێ لە مێژوونووسان لەسەر ئەو بڕوایەن کە زەردەشت کتێبەکەی خۆی کە ناوی ئاڤێستایە بەزمانی مادی نووسیویە و مێژوونووسانی کوردیش هەر لەسەر ئەو بڕوایەن، بەڵام هەروەها وتمان ئێمە بەردەنووسراوێکی مادیمان بەدەستەوە نییە تا ئەم مەسەلەمان بەدروستی بۆ دەرکەوێ.

دارمستتر و هوارت لایان وایە کە زەردەشت بەزمانی مادی دواوە و ئاڤێستاشی هەر بەو زمانە نووسیوە کە ئەم زمانە ئێستا لە هەورامانداا باوە و ئەگەر ئاڤێستا لە لای کوردێکی هەورامی بخوێنرێتەوە بەتەواوی لێ تێ دەگا و لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە کورد لە نەژاد مادەکانن.

پرۆفیسۆر سایس دەڵێ مادەکان یەکێ لە هۆزەکانی کوردن و لە خۆرهەڵاتی ئاشووردا دەژیان و وڵاتەکەیان تا باشووری دەریای خەزەر درێژەی هەبوو و زمانەکەیان ئارییە و ژان دۆمرگانیش دەڵێ زمانی کوردی یەکێ لە زمانەکانی هیند و ئەورووپاییە.

سەبارەت بەمادی بوونی زەردەشت، پلینووسی گەورە کە لە ساڵی ٢٣ تا ٧٩ی بەر لە زاینیدا ژیاوە لە یەکێ لە نووسراوەکانیدا کە ناوی مێژووی خۆرسکییە لە جزمی سێیەمیدا دەڵێ: زەردەشت لە بنەماڵەی مادە و هێرتسفلدیش لای وایە کە زەردەشت لە ڕەسەنی مادە و ئاڤێستای بەزمانی مادی نووسیوە. زەردەشت لە گاتاکاندا دەڵێ: من لە بنەماڵەی

سپیتمەم و بەپێی قسەی هێرتسفلد بنەماڵەی سپیتمە، یەکێ لە بنەماڵەکانی مادەکە لە شاری ڕەگایارەی دەژیان و ئەمانە سەرەتا لە ئاوربایگان بوون.

وڵاتی ماد کە لە باکووریترین شوێنەکانی ئاوربایگانەوە دەست پێ دەکات بەرەو باشوور و باکووری خۆرئاوایی و خۆرئاوا دەکشێتەوە و بریتییە لە تەواوی مەڵبەندەکانی ئاوربایگان و کوردستانی گەورە، وە شارەکانی هەمەدان و زەنگان و یەزدو ئەسپەهان و ڕەی و نەهاوەند کە لە درێژایی مێژوودا بەهۆی پەیوەندیی مێژوویی و ڕامیارییەوە بەناوی مادی گەورەو گچکە و عێراقی عەجەم و عێراقی عەرەب ناسراوە، بەشێکن لە وڵاتی ماد.

ئەو ڕووداوانەی کە لە درێژایی مێژوودا لە کوردستان قەوماون، بیرەوەری و یادگارێکی زۆریان بەجێ هێشتووە و بوونەتە هۆی ئەوە کە کوردستان بەش بەش بێتەوە و تووشی سەدان تەنگوچەڵەمە و گیروگرفت و شەڕوشۆڕ و هەنگامە بێ کە ئێستاش هەر نوقمی ئەو گیروگرفتانەیە مێژووی هاتنی ئارییەکان بۆ وڵاتی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ پێنج هەزار ساڵ لەمەوپێش تەنانەت مێژوونووسان ئەم مێژووەش دەبەنەوە بۆ ڕۆژگارێکی زۆر دواتر کە ئەمانە پاشان دەوڵەتی ماد و پارسیان دامەزراند و لە ڕاستەقینەدا مادەکان یەکەمین هۆزی ئاریایی بوون کە دەوڵەتی مادیان پێک هێنا و پاشان بەسەر دەوڵەتی ئاشوور و بابل زاڵ بوون و پەرەیان دایە دەوڵەتەکەیان.

دامەزرانی دەوڵەتی ماد و زاڵبوونی بەسەر دەوڵەتی ئاشووردا گەورەترین ڕووداو و کارەساتی ئەو دەورەیە دێتە ژمار. ئەم ڕووداوە لە ساڵی ٦١٢ی بەر لە زاین ڕووی داوە، بۆیە کوردەکان مێژووی خۆیان دەبەنەوە سەر ئەو ڕووداوە.

ئەوەی کە بۆ خۆرهەڵاتناسان و لێکۆڵەران ڕوون بووەتەوە ئەوەیە کە کورد دەچێتەوە سەر مادەکان و هەر لەو مەڵبەندەدا دەژی کە مادەکانی تێدا ژیابوون، وە ئەگەر لە داهاتوودا بەردە نووسراوێک لە مادەکانەوە بکەوێتە دەست، ئەوەمان بەتەواوی بۆ ڕوون دەبێتەوە و ئێستاش لە ڕووی زمانی کوردییەوە، دەتوانین ئەوە بسەلمێنین و بڵێین کە زمانی کوردی لە بارەی زمانناسییەوە، لەگەڵ زمانی ئاڤێستایی و پارسیی کۆن و پەهلەوی گەلێ نزیک و هاوچەشنە.

زمانی مادی کە زمانی زگماکی خەڵکی کوردستان و ئاوربایگانە بەهۆی ئەوەی دەورو زەمانێکی دوورودرێژی بەسەردا تێ پەڕیوە گەلێ لکی لێ جیابووەتەوە کە پەیوەند و خزمایەتییان هیچ کاتێ لەناو ناچێ، وە لە نووسراوەکانی مێژوونووسانی ئیسلامیدا بەناوی فەهلەویات ناسراوە، چونکە لە ڕابردوودا بەدانیشتوانی کوردستان و ئاوربایگان، فەهلە و پەهلەیان وتووە و پاشان بەو زمانەی وا قسەیان پێ کردووە پەهلەویان وتووە و بەو

هۆنراوانەی کە هۆنیویانەتەوە فەهلەویاتیان وتووە، ئەڵبەت ئەو زمانەش کە ئەشکانییەکان قسەیان پێ دەکرد پەهلەویان پێ دەوت کە لەگەڵ ئەو پەهلەوییەدا تۆفیری هەیە.

ئەو بەرهەمانەی کە لە هۆنەرانی ڕەیەوە بەجێ ماون ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە زمانی مادی تا سنووری ڕەییش ڕۆیشتووە و شار بەشار و دێ بەدێ گۆڕاوە و تەنانەت ئەو شوێنەوارانەی کە لە خەڵکی قەزوێنەوە کەوتووەتە دەست ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە زمانی مادیی باکووری کاری کردووەتە سەر زمانی ئەوانیش و ئێستاش گەلێ وشەی کوردی لە زمانی قەزوێنییەکاندا بەکار دەبرێ کە ڕیشەکەیان هەر لە کوردیدا پەیدا دەبێ، هەروەها زمانی کوردی لەسەر زمانی خەڵکی مەلایر و نەهاوەند و ساوە و تویسرکان و شمیران و دەماوەندیشدا کاری کردووە و ئێستاش گەلێ وشەی کوردی بەکاردەبەن و لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە زمانی کوردی لە شار و ناوچەکانی ئێران گەلێ پەرەی سەندووە و پەلی هاوێشتووەتە گەلێ شوێن و جێگە و مەڵبەندا.

زمانی ئازەریی کۆن کە تا ئەم دواییە هەر بەکار دەبرا و ئێستا لە هەندێ دێ و ناوچەی ئاوربایگاندا بەکار دەبرێ، هەر ئەو زمانەیە کە شێخ سەفیەدینی ئاردەوێلی هۆنراوی پێ هۆنیوەتەوە و لکێکە لە زمانی کوردی و لە ڕابردوودا زۆربەی خەڵکی ئاوربایگان بەو زمانە دەدوان، بەڵام ئێستا بەداخەوە زمانی توورکی بووەتە جێنشینی و ئەو زمانە بەرە بەرە خەریکە لەناو دەچێ.

کوردەکان بەهۆی ئەوەی لە مەڵبەندێکی کوێستانی و شاخاویدا ژیان دەبەنە سەر زمانەکەیان پارێزراوە و کەمتر وشەی بێگانەی تێ کەوتووە و ڕەنگ و بۆنی ئارییایی خۆی پاراستووە.

زمانی کوردی کە داگیری چەند زاراوە و شێوەیە، میر شەرەفخانی بتلیسی دابەشی کردووەتە چوار زاراوە کە بریتین لە: کرمانجی، لوڕی، کەلهوڕی، گۆرانی، وە ئەم زاراوانە لە درێژاییی ڕۆژگاردا گۆڕانێکی زۆریان بەسەردا هاتووە و بەهۆی گۆڕانی باری کۆمەلایەتی و ڕامیاری و ئابووری و مەڵبەندەکان و دراوسێیەتی و تێکەڵیان لەگەڵ زمانەکانی تردا، بەچەند ناوچەیەکی ناوچەیی و پێنج زاراوە دابەش بووە. ئەم پێنج زاراوە گەورەیە بریتین لە: ١- زاراوەی کرمانجیی باکووری کە ئەم مەڵبەندانە دەگرێتە بەر: ماکۆ، قووچان، ورمێ، بارزان، دهۆک، ئاکرێ، مووسڵ، قارس، دیاربەکر، وان، ئەرزڕۆم، بتلیس، ئەخلات، قامشلی. ٢- زاراوەی کرمانجیی باشووری ئەم مەڵبەندانە دەگرێتەوە بەر: سنە، مەریوان، جوانڕۆ، سەقز، بانە، سابلاخ، سەردەشت، هەوشار، حەریر، ڕەواندز، هەولێر، پژدەر، کەرکووک، سلێمانی، هەڵەبجە، پێنجوێن. ٣- زاراوەی گۆرانی ئەم مەڵبەندانە

دەگرێتە بەر: ژاوەرۆ، هەورامانی تەخت، نەوسوود، پاوە، ئیلان پێ، بینگول ، خەڕپووت، مووش، تاپیان. ٤- زاراوەی لەکی کە ئەم مەڵبەندانە دەگرێتە بەر: کرماشان، مایدەشت، کولیایی، دینەوەر، قەسری شیرین، خانەقین، مەندەلی، بەدرە، کووت. ٥- زاراوەی لوڕی کە مەڵبەندەکانی دزفوول، شاری کورد، چوارمەحاڵ، پشتکۆ و ئیلام، ئەلشتەر، خۆڕەماوا و ناوچەکانی تری بەختیاری دەگرێتەبەر. دیارە هەریەکە لەو پێنج زاراوە بناغەییە، بەبێ دەستووری زمانەوانی شێوەگەلێکی زۆریان لێ دەبێتەوە کە بوونەتە زمانی وتووێژی دانیشتوانی ناوچەکانیان.

تا ئەو جێگایە کە ئێمە ئاگامان لێیە تا ئێستا ڕێزمانێکی ڕێکوپێک بۆ هیچ کام لەو پێنج زاراوە کوردییە نەنووسراوە و ئەگەریش لەلایەن چەند زانایەکی کورد و نا کوردەوە نووسرابێ، نیوە و ناتەواوبووە، وەیان لەبارەی ڕێزمانییەوە شێوەیەک لە شێوەکانی یەکێ لەو پێنج زاراوەوە نووسراوە و، بەداخەوە ئەو ڕێزمانە نیوە و ناتەواوانەش لەناو خوێندەوارەکانمان بڵاونەکراونەتەوە. جا هەر لەبەرئەوەیە کە وردمان کردەوە و دەبینین زمان لە نووسیندا تووشی گرێ و قۆرتی زۆر بووە و هەر نووسەرێک بەئارەزووی خۆی وشە و ڕستەی دروست یا نادروست بەکار دەهێنێ.

ئەڵبەت هەندێ کەس وەکو: نووری عەلی ئەمین، تۆفیق وەهبی، ڕەشید کورد، وریا عومەر ئەمین، ئەحمەد حەسەن، جەمال نەبەز، کوردستان موکریانی، سەعید سدقی، ئەوڕەحمانی حاجی مارف. قەناتی کوردۆ، جگەرخوێن سەبارەت بەڕێزمانی کوردی گەلێ شتیان نووسیوە، بەڵام ئەوانە ناتوانن ببنە ڕێزمانی تەواوی زاراوەکان و شێوەکانی کوردی و دەبێ بەهۆی زانایانی کوردەوە کە لە ڕێزمانی کوردیدا شارەزاییان هەیە ڕێزمانێکی کوردی بۆ تەواوی زاراوەکانی کوردی بنووسرێ تا کورد و نا کورد کەڵک و سوودی لێ وەرگرن.

یەکێ لە زمانە کۆنەکانی ئێرانی زمانی پەهلەوییە کە سرجۆن مالکوم لە پەرتووکی مێژووی پارسدا دەڵێ: ئەو هۆزانەی کە لە کوردستاندا نیشتەجێن هەموویان بەزمانی پەهلەوی دەدوون و گەلێ لە خۆرهەڵاتناسانی تریش هەر لەسەر ئەو بیروڕایەن و لە ڕاستەقینەدا زمانی پەهلەوی هەر لە زاراوەی گۆرانی و لوڕی دەچێ وشەکانی گەلێ بەم زاراوانەوە نزیکن و دەتوانین ئەو دوو زاراوەیە بەپاشماوەی زمانی پەهلەوی دانین.

ئەو کەسانەی کە بەزمانی پەهلەوی دواون ئیبنی خوردادبە و هەندێ لە جوگرافیزانان بەمەڵبەندەکە یان وڵاتی پەهلەوی زمانیان وتووە. واتە: ئەو مەڵبەندەی کە بەزمانی پەهلەوی قسە دەکەن. ئەم ناوە تا چەند سەدە لە دوای ئیسلام بەناوی کوێستان لە مێژووەکاندا نووسراوە و پاشان بەناوی هەورامان ناسرا، وە لەدوای چەند سەدەیێ تر بەناوی

هەورامانات یادکراوە، ئیبنی خوردادبە دەڵێ لەم شارانەدا بەزمانی پەهلەوی قسە دەکەن: دینەوەر، سووورە بەرد، شارەزوور، هەورامان، هەمەدان، ڕەی، ئەسپەهان، ماسیدان، قەزوێن، کەواتە زاراوەی گۆرانی دەچێتەوە سەر زمانی پەهلەوی. ئاشکرایە زاراوەکانی زمانی کوردی لە بنەڕەتا دەچنەوە سەر یەک وشەکانیان لە سەرچاوەیەکەوە هاتوون و لەگەڵ زمانە کۆنەکانی ئێرانیدا وەکو: ئاڤێستایی و پەهلەویی کۆندا هاوچەشنن و تۆفیرێک لە نێوانیانا نابینرێ.

ئەو خۆرهەڵاتناسانەی کە سەبارەت بەزمانی کوردی لێکۆڵینەتەوە، لێکۆڵینەوەکەیان تا ئێستا بەجێیەک نەگەیشتووە چونکە ئەوانە شارەزاییان لەمەڕ بەهەمووی زاراوەکانی کوردی نەبووە کەچی لێکۆڵینەوە لە بارەی زمانی کوردییەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ چەند هەزار ساڵ لەمەوپێش پێویستی بەوە هەیە کە ئاشنایی بەزمانی ئاڤێستایی و پەهلەوی و پارسیی کۆن و تەواوی زاراوەکانی کوردی هەبێ تا بتوانێ لە زمانی کوردی بکۆڵێتەوە.

مینۆرسکی دەڵێ: هەندێ لایان وایە کە کوردەکان دەچنەوە سەر کاردۆخییەکان کە لە ساڵی ٤٠١ی بەر لە زاین لەگەڵ گزنفۆندا بەشەڕ هاتوون، بەڵێ ئەمە دروستە و دەتوانین بڵێین کە کوردەکان لە ڕەسەنی ئاریاین و زمانیان دەچێتەوە سەر هیندوئەورووپایی و لە ترۆمی مادن.

ئیدمۆنسیش دەڵێ: ئێستا بۆ تەواوی زانایان دەرکەوتووە کە زمانی کوردی زمانێکی ئارياییيە و زمانێکە کە کەمتر وشەی بێگانەی تێ کەوتووە و داگیری چەندین زاراوەیە و هەر زاراوەیەکی چەند شێوەی لێ جیا دەبێتەوە.

ئەو پەڕتووکانەی کە بەزمانی کوردی بەیادگار ماونەتەوە لە ئەژمار بەدەرن و زۆربەیان وێژەیین و بەداخەوە گەلێکیان لە چاپ نەدراون و هەروا ماونەتەوە و هیوادارین لە داهاتوودا هەموویان بخرێنە ژێر چاپ تا هەموو کەڵک و سوودی لێ وەرگرن.

گرنگترین و کۆنترین پەڕتووکێک کە لە دەوری ئیسلامەتیدا بەیادگار ماوەتەوە و لەم دواییەدا لە چاپ دراوە، پەڕتووکی دەورەی بالوولە کە لە سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچیدا بەزاراوەی گۆرانی هۆنراوەتەوە و داگری پانزە بەند سرووده و هەموویان دە هیجایین و لەسەر ڕێ و ڕەوشتی یاری (یا کاکەیی) هۆنراونەتەوە کە گەلێ گرنگ و بایيدارە و لەم پەڕتووکەدا سەبارەت بەگەلێ مەبەست وەکو: حەوتەوانە: حەوت تەن، جام، جامی جەم. زەروان، ساوەر، ئەرژەنگ باس کراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ئاینە کۆنەکانی ئێران.

هەروەها پەڕتووکێکی تریش کە بەیادگار ماوەتەوە ناوی ماریفەت و پیر شالیارە کە بریتییە لە هۆنراوەکانی پیر شالیاری یەکەم کە لە سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچیدا

ژیاوه و داگیری پانزه بەند هۆنراوی گۆرانییە و لەسەر ڕێ و ڕەوشتی زەردەشتی هۆنیویەتەوە و مەبەستی ئەوە بووە کە خەڵک هەر لەسەر ئەو ئاینە بڕۆن و بیپارێزن و هەروەها دوو پەڕاوی تر لە سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچیدا بەناوی جیلوه و مەسحەفارەش بەزاراوەی کرمانجیی باشووری و کرمانجیی باکووری نووسراوە کە پەیوەندییان بەئێزیدییەکانەوەیە و ئەم دوو پەڕتووکە لە باری ناوەڕۆکەوە لەگەڵ یەکدا جیاوازییان هەیە. لە پەڕاوی جیلوەدا دیاردی کراوەتە هێز و دەسەڵات و مانەوە و گەورەیی و خوایەتیی خوا، بەڵام لە پەڕاوی مەسحەفارەشدا سەبارەت بە بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی و دەریاکان و بابی مرۆ و خێر و شەڕ و نوێژ و ژنهێنان باس کراوە و گەلێ پەڕاوی تریش هەن کە لەبەرئەوەی پێویستی بەنووسینی کتێبێکی گەورە هەی،ە ئەوەیە لێرەدا چاوی لێ دەپۆشین.

سەرچاوەکان

١- کورد و کوردستان، نووسینی حەمەومین زەکی- بەغدا ١٩٣١.
٢- خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان نووسینی حەمەومین زەکی بەگ- بەغدا ١٩٣٠.
٣- خولاسەی مەسئەلەی کورد لە فەرەنسییەوە، وەرگێڕاوی ڕەفیق حیلمی- مووسڵ ١٩٣٤.
٤- چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد نووسینی د. کەمال مەزهەر- بەغدا ١٩٨٥.
٥- خونچەی بەهارستان، نووسراوی حسێن حوزنی موکریانی- حەلەب ١٩٣٥.
٦- کرد و پیوستگی نژادی و تاریخی او، تالیف رشید یاسمی- تهران ١٣١٦.
٧- شرفنامه، تالیف امیر شرف خان بدلیسی باهتمام محمد عباسی - تهران ١٣٦٢.
٨- الامراد تالیف مینورسکی ترجمه معروف خزنەدار- بغداد ١٩٦٨.
٩- تاریخ لامارات والدول الکردیه - محمدأمین زکی - قاهره ١٩٤٨.
١٠- القضیه الکردیه، تالیف دکتور بلج شیرکوه - قاهره ١٩٣٠.
١١- اللغه الکردیه، التوزیع الجغرافی للهجاتها تالیف فؤاد حمه خورشید - بغداد ١٩٥٩.
١٢- فرهنگ ماد، تألیف صدیق صفی زاده- تهران ١٣٦١.
١٣- کردی بیاموزیم، تألیف صدیق صفی زاده- تهران ١٣٦١.

# کەلەپووری نەتەوایەتی

مەڵبەندی پان و بەرینی کوردستان کە گەلێ عێل و خێڵ و هۆزی جۆربەجۆری لە داوێنی خۆیا پەروەردە کردووە جگە لەوەی کە چەند سەدەیەک مێژووی هەیە، وەکو کاروانسەرایەکە کە کاروانەکانی بریتییە لە هۆزگەلی جۆر بەجۆری کورد لە ناویدا باریان خستووە و لەگەڵ یەکدا هەڵسوکەوتیان هەیە و هەر ئەوەیە کە لێکۆڵینەوە و تۆژینەوە لە بارەی بیروبڕوای خەڵکەکەیەوە نە تەنیا لە باری زانستی و ڕەوانناسییەوە سەرنجڕاکێشە، بەڵکو گەلێ مەبەستی نادیاری پیتۆڵی و مێژوویيمان لەمەوە بەی دەبەین بە بەسەرچاوەی ڕێ و ڕەوشت و ئاینەکان و ئەفسانە و چیرۆکەکان و بیروبڕوای جۆر بەجۆری گەلی کورد لە درێژاییی مێژوودا. هەر ئەم چەشنە بیروڕایەیە کە خەڵک پەروەردە دەکا و ئەوان بەخێو دەکا و ئومێد و ترسیان لە دڵدا دێنێتەدی و ئەمەش بەگەورەترین و کۆنترین دڵنەوایی ئادەمیزاد دێتە ژمار و، هێشتا لەناو زۆربەی خەڵکدا ئەم چەشنە ڕێ و ڕەوشتانە باون و خەڵک دەتوانێ لە هەموو شتێک چاوبپۆشێ، بەڵام ناتوانێ لە کەلەپووری نەتەوایەتیی خۆی دەست هەڵگرێ و بایەخی پێ نەدا.

کەلەپووری نەتەوایەتی لە زاراوی زانستیدا فۆلکلۆری پێ دەوترێ و فۆلکلۆر بەواتای کەلەپووری کۆمەڵەو بریتییە لە بیروبڕوای خەڵک و ئەفسانەکان و چیرۆکەکان و مەتەڵەکان و پەندەکان و بەندوباوی کۆمەلایەتی و بەیت و ڕاز و ئەم جۆرە شتانە.

ئەوەی کە ڕوون و ئاشکرایە وێژەی پێشکەوتووی هەر گەل و نەتەوەیەک پایە و بنەڕەتێکی هەیە کە ئێستا فۆلکلۆر یا کەلەپووری نەتەوایەتیی پێ دەڵێن. کەلەپووری نەتەوایەتی کە داگری زاراو و بەند و مەتەڵ و چیرۆک و گۆرانی و ئەفسانە و ئەم جۆرە شتانەیە، نوێنگەی هەڵسوکەوتی ڕاستەقینە و چۆنییەتیی ژیانی خەڵکە و ئەم مەبەستانەش پێشینەیەکی کۆنیان هەیە و لە هەزارانساڵەوە پشت بەپشت و ڕەچەڵەک بەڕەچەڵەک ماونەتەوە و سینگ بەسینگ هاتوونەتە خوارەوە و لەبەرکراون و لە ڕاستەقینەدا گەنجینەیەکی باییدارن و دەتوانین بۆ دانانی مێژووی زانیاری مێژووی کۆمەلایەتی و شارستانییەت، کەڵک و سوودی لێ وەرگرین.

بەشێک لە فۆلکلۆر بەناوی بەیت ناسراوە کە بریتییە لە ڕووداوی نەتەوایەتی و چیرۆکی

دڵداری و مێژوویی و ئاینی کە گەلێ جوان و دڵ ڕاکێشەرن و هەندێ لەو بەیتانەیان لەگەڵ شانامەی فیردەوسی و ئیلیاد و ئۆدیسەی هۆمیرو هاملتی شکسپیردا پێک گرتووە و لە ڕیزی ئەو شاکارانەدا هێناویاننە ئەژمار.

هەروەها وتمان بەیت بریتییە لە ڕووداوێکی بەزمی یا ڕەزمی کە بەیت وێژی نەخوێندەوار لە چوارچێوە و ڕستەگەلێکی ڕازاوەدا بەبەزم و ئاهەنگێکی تایبەتی ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە، واتە ئاهەنگێ کە شایانی ئەو ڕووداوەبێ دەیخوێنێتەوە. بەیت وێژی بەهرە و بەشێکی هونەرییە و هەموو کەسێک ئەو بەهرە و بەشیە نییە و، لە ڕۆژگارە پێشووەکاندا فەرمانڕەوایانی ئەردەڵان و سانانی هەورامان بەیت وێژ و ڕاز وێژی گەورە گەورەیان هەبووە و زۆربەی شەوان لە دیوەخانەکانیاندا بەیت وێژی و ڕاز وێژییان بۆ کردوون.

بەیتەکان بەیەکێ لە بەشەکانی گرنگی وێژەی کوردی دێنە ژمار و ئەم بەیتانە کە زۆربەیان دەگەڕێنەوە بۆ سەدەکانی پێشوو سەرچاوەیان جۆر بەجۆرە و لەوانەیە لە ئەفسانە و ڕووداوێکی نەتەوایەتی و مێژووییەوە هاتبن و، یا بیرەوەریەکی تێکشکان و سەرکەوتنێک بن، وەیا لە ڕووداوێکی ئاینییەوە سەرچاوەکانیان گرتبێ، بەڵام هەرچێک بێ ئەو بەیتانە بریتین لە ئومێد و شادی و شیوەن و ئارەزووگەلێکی بێ سەرئەنجامی گەلی کورد و گەنجینەیەکی بایەدارن و دەتوانین لە باری مێژوویی و وێژەیی و کۆمەڵایەتی و ئاینییەوە کەڵکیان لێ وەرگرین.

زۆربەی بەیتەکان بەهۆنراو و پەخشانن و دانەر و مێژووی دانانیان ڕوون نییە و وا دیارە کە ئەو شوێنەوارانە لە دوای ئیسلام دانراون، چونکە سەرچاوەی ئەم بەیتانە جۆر بەجۆرە و ڕەنگە ئەفسانەیەک یا ڕووداوێکی مێژوویی و نەتەوایەتی یا کارەساتێکی ناوخۆیی یا بیرەوەریەکی نادیار یا تێکشکان و پیرۆزی و یا بیروبڕوایەکی ناوخۆیی سەرچاوەی ئەم بەیتانە بێ، بەڵام ئەم بەیتانە هەرچی بێ بریتییە لە بیروبڕوای گەلی کورد.

زۆربەی بەیتەکان بەهۆنراو و پەخشان دەست پێ دەکرێن و پتر لەناو عێلات و هۆزەکانی کوردا باون و زۆربەی دێ نشینان ئەم بەیتانەیان لە بەرەو کورد لە بەیتدا زۆر دەوڵەمەندە و هەندێک لەم بەیتانەی هەر لە مێژەوە لەناو خەڵکدا ناسراون و بەیت وێژەکان هەموو دەم ئەو بەیتانە بۆ خەڵک دەخوێننەوە تا لەبەریان کەن و لەبیرنەچنەوە و ئەمەش بەڕاسپێری خۆیان دەزانن.

لە ڕۆژگارانی پێشوودا فۆلکلۆر بەلای زاناکانەوە بایی و بایەخێکی زۆری نەبوو، وە کەمتر ڕوویان تێ دەکرد بەڵام لەم ساڵی دواییدا کۆمەڵێک لە زانایانی ئوروپایی پاش وردبوونەوە و تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بۆیان دەرکەوت کە فۆلکلۆری هەر گەل و

کۆمەڵێک، بەهەموو چەشنەکانییەوە، بۆ ناساندنی ئەو گەل و نەتەوە و پیشاندانی کەلەپوورە نەتەوایەتییەکانی لە ڕێڕەوی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری و زانیاریدا نەخش و دەورێکی گرنگ دەگێڕێ، ئەوسا ئەو زانایانە دەستیان کردە کۆکردنەوە و نووسینەوەی کەلەپووری نەتەوایەتی، وە تا ڕادەیەک ئێستاکە گەلێ لە زانایان وڵاتە و وڵات و شارە و شار دەگەڕێن و لەناو گەل و نەتەوە جۆر بەجۆرەکانی جیهاندا دەسووڕێنەوە و لەگەڵ شارەزایانی ئەو گەل و نەتەوایانەدا کۆ دەبنەوە و لە بارەی هەموو چەشنە فۆلکلۆرێکی ئەو گەل و نەتەوایانە پرسیار دەکەن و دەیاننووسنەوە و لێیان دەکۆڵنەوە.

کەلەپووری نەتەوایەتی، هەروەها وتمان کە بەرهەمی هەزاران ساڵی هەر گەل و کۆمەڵێکە بریتییە لە : وێژە و نیگار و گەمە و یاری و گۆرانی و هەڵپەڕکێ و چەشنەکانی خواردنەوە و خواردەمەنی و نەریتی کۆمەڵایەتی و کاسە و کەوێلی ناو ماڵ و بیروبڕوای کۆن و ڕاو و چەک و پیشەکان و ئەستێرەوانی و گەلێ مەبەستی تر.

نەتەوەی کورد لەبەرئەوەی گەلێکی کۆنەو پێشینەیەکی مێژوویی دووروودرێژی هەیە لە چاوی فۆلکلۆرەوە دەوڵەمەندە، بەڵام بەداخەوە بەهۆی ئەوەوە کە ژیانێکی دانەمرکاو و شپرزەی بووە، نەیتوانیوە تا ئێستا ئەو گەنجینە نەتەوایەتییەی خۆیە بەتەواوی کۆبکاتەوە و لە ژیانی خۆیا کەڵک و سوودی لێ وەرگرێت.

فۆلکلۆری کوردی لەگەڵ ئەوەشدا کە بەشی زۆری لە سینگی پیرەمێردان و پیرەژناندا بووە و لەناوچووە، بەڵام لە هەر بابەتێکەوە ئەوەندەی ماوەتەوە کە ئەگەر زاناکان و نووسەران بۆ کۆکردنەوەی دەستوبرد بکەن و هەریەکەیان لە ڕادەی توانایی خۆیاندا بۆ پاراستنی تێ بکۆشن لەوانەیە کە گەلەکەمان لە گشت بارەیەکەوە بێ نیاز بکات و لە ڕێبازی ژیاندا پێش بکەوێ.

فۆلکلۆر گەلێ شت دەگرێتەوە و ئەوەی کە لە باو و باپیرانمانەوە بۆمان بەجێ ماوە دەگرێتەوە، وەکو: وێژە و ساز و ئاواز و هەڵپەڕکێ و سەما و هونەری وێنەکێشی و نەخش و نیگار و پەیکەرتاشین و بیناسازی و پیشەکان و بەڵگەنامە و هونەرە جۆراوجۆرەکان دەگرێتەوە و لە ڕاستەقینەدا فۆلکلۆر شێوەی ژیانی کۆنی پێش هەزاران ساڵی باووباپیرانمان بۆ دەردەخات و و پلەی شارستانییەت و خوو ڕەوشت و بیروبڕوایان پیشان دەدات.

فۆلکلۆری وێژە کە بریتییە لە چیرۆک و هۆنراو و پەند و مەتەڵ و گاڵتەوگەپ و ئامۆژگاری و وتەی جێگر و نەخش و نیگار و یارییەکان و ساز و گۆرانی و خۆراک و خواردەمەنی و نەریتی کۆمەڵایەتی و کاسە و کەلوپەلی خێزان و تیمارکردن و بیروبڕوای کۆن و

خانەسازی و ڕاو و چەک و پیشە و پیشەسازی و کەلوپەلی ئاژەڵ و ئەستێرەوانی و ئەم جۆرە شتانە.

کەواتە لەسەر هەموو نووسەران و وێژەوانان و زانایانی کورد، پێویستە کە فۆلکلۆر و کەلەپووری نەتەوایەتیی کورد خێرا کۆ بکەنەوە و لەسەری بکۆڵنەوە تا لەمە زیاتر تیانەچن و بەفیڕۆ نەڕۆن چونکە ئەوانە پەیوەندییان بەگەلەکەمانەوە هەیە و ئەگەر ئێمە ئەم کارە نەکەین، ئەم کارە ئیتر بۆ وەچەکانی تر ناکرێ، چونکە فۆلکلۆر ڕۆژ بەڕۆژ لەناو دەچێ و بەرەبەرە لەبیر دەچێتەوە.

هەروەها دەزانین کە شارستانییەتی ئەمرۆ پەردەیەکی داوە بەڕووی ژیانی هەموو کۆمەڵانی جیهاندا و بەرە بەرە گۆڕانێکی وەها دێنێتە سەریا کە هەموو شتێکی لەبیر دەباتەوە و کەلەپوورەکەی بەجارێ لەناو دەبا کەواتە هەرچی زووە دەبێ کەلەپوورەکەمان کۆ بکەینەوە تا لەمە زیاتر لەناو نەچێ بەتایبەت بەیتەکانمان کە هەر کامیان بەشاکارێکی وێژەیی دێنە ژمار، دەتوانین لەوانە گەلێ کەڵک و سوود وەرگرین. ئەڵبەت لەم دواییەدا هەندێ لە نووسەرانمان خەریکی کۆکردنەوەی بەیتەکانی کوردی بوون کە لەناو ئەوانەدا دەتوانین لە: حاجی جندی، عەرەب شەمۆ، محەمەد تۆفیق وردی، عوبەیدوڵڵای ئەیووبیان، قادری فەتاحی قازی، عەبدولحەمیدی حسەینی و ئەحمەد بەحری ناوببەین کە لەم بارەوە گەلێ ئەرک و ڕەنجیان کێشاوە و هیواداریین کە لاوان بکەونە خۆیان و ئەم ئەرکە بگرنە ئەستۆ تا کەلەپووری نەتەوایەتیمان لەمە زیاتر لەناو نەچێ.

سەرچاوەکان

١- دابونەریتی کوردان نووسینی مەلا مەحموودی بایەزیدی- بەغدا ١٩٨٢.
٢- سەرنجێک لە دەروازەی فۆلکلۆرەوە- هەولێر ١٩٦٣.
٣- دەرگەهەک بۆ فۆلکلۆری کوردی نووسینی خاڵە حسێن - بەغدا ١٩٨٥.
٤- فۆلکلۆری کوردی نووسینی محەمەد تۆفیق وردی- بەغدا ١٩٦١.
٥- کۆمەڵەتێکستی فۆلکلۆری کوردی نووسینی قەناتی کوردۆ و بەغدا ١٩٧٦.
٦- گوڵبژێرێک لە فۆلکلۆری کوردیدا نووسەرانی سەعدوڵڵا شێخانی- بەغدا ١٩٨٥.

# پەندی پێشینان

ئاشکرایە بەرەی مرۆ لە ڕۆژگارێکەوە لە ژیانی خێزانییەوە، پێی ناوەتە ژیانی هۆزایەتییەوە و لە ژیانی هۆزایەتیشەوە هاتووتە ناو کۆڕ و کۆمەڵەوە، هەموو چەشنە تاڵی و شیرینیەکی ژیانی چەشتووە و هەموو جۆرە کارەسات و ڕووداوێکی تاقی کردووەتەوە و لە ئاکام و ئەنجامی ئەو کارەساتانە کە ئێستاش لە ئێمە ڕوو دەدەن و، لە ژیانی ڕۆژانەی خۆماندا هەستیان پێ دەکەین تێ گەیشتووە و سوود و زیانی ئەو ئاکام و ئەنجامانەی بەوردی لێک داوەتەوە و بۆ ئەوە ئەو سوود و زیانانە کە لەو کارەساتانە دێنە دی بکەونە پێش چاو و پیشان بدرێن تا باشتر کار بکەنە سەر مرۆ، باپیرەکانمان بۆ هەریەکە لەو کارەساتانە کە لە ڕێگای کردەوە و وتەوە لە بنیادەم دەقەومێن شتێکی لەباریان دۆزیوەتەوە و ڕژاندوویانەتە قالبی ڕستەیەکی کورت و جوانەوە و ئەو ڕستەیە دەم بەدەم پارێزراوە و پشت بەپشت هاتووەتە خوارەوە تا گەیشتووەتە ئێمە و لە ئێمەشەوە دەگاتە بەرە دواییەکان.

پەندی پێشینانی هەر گەل و نەتەوەیەک پیشاندەری بیروڕای ئەو گەل و نەتەوەیەن و کۆمەڵناسان لەم ڕێگەوە دەتوانن بەئاکار و خوو و خدەی کۆمەڵێک پەی ببەن. هۆنەران و هەستیارانی گەورەی کوردیش لە پەندی پێشینان بەهرە و سوودێکی زۆریان بردووە و لەناو هۆنراوەکانیاندا هێناویانن.

داهێنەران و بە دیهێنەرانی ئەم پەندانە لە هیچ کوێی جیهاندا نەناسراون و دیارە ئەو پەندانە بەهۆی پێویستیی ژیان و هەڵسوکەوتی خەڵکەوە، بەدی هاتوون و ئەو پەندانە هەر لە مێژەوە سینە بەسینە هاتوونەتە خوارەوە تا گەیشتوونەتە ئێمە.

لەم دواییەدا هەندێ لە زانا و وێژەوان و نووسەرەکانمان لە بارەی پەندی پێشینانەوە گەلێ شتیان نووسیوە و هەریەکەیان بەگوێرەی سەلیقەی خۆی لە پەندی پێشینان دواوە و لە چاوی مانا و ناوەڕۆکەوە کردوونیە چەند بەشەوە.

بەو جۆرەی کە ئێمە بیرمان لە مانای پەند کردووەتەوە، پەند ئەوەیە کە ئامۆژگاریەکی ڕوون و ڕاستەوخۆ بەخەڵک ڕابگەیەنێ و، دەتوانین بڵێین پەند پەیامێکە کە خەڵک وریا دەکاتەوە و دەیخاتە ڕێی ڕاست، بۆ ئەوەی ژیانی بەڕاستی و دروستی ببڕێ و لە هەموو کارێکدا یارمەتیی بدا.

ئەو پەندانەی کە ئامۆژگاریێکی گۆشەیی دەگەیەنن سێ جۆرن جۆری. یەکەم بریتییە لە قسەی نەستەق واتە قسەی جوان و ژیرانە، وە ماناو ناوەڕۆکی قسەی نەستەق کە پوختەی بەرهەمی تاقیکاری و لێکدانەوەی وردی چینە ژیر و تێگەیشتووەکانی کۆمەڵە و لە ڕواڵەتدا مەبەستێکی دیاریکراو دەگەیێنێ، بەڵام لە ڕاستەقینەدا هەموو مەبەستێکی هاوچەشن دەگرێتەبەر وەک ئەوە دەوترێ لە سەرنجی خۆی دەڕوێ.

جۆری دووەم، بریتییە لە توانج یان تەنز، توانج ئامۆژگارییەک لە پەنای ناوەڕۆکێکی گاڵتەیی و جەفەنگی یان ناوەڕۆکێکی ڕاستەقینە ڕادەگەیەنێ وەکو ئەوە دەوترێ:

دەریا بەدەم سەگ پیس نابێ یا دەڵێ: قەل بەقەلی دەوت ڕووڕەش.

جۆری سێیەم بریتییە لە مەتەڵ کە بەرهەمی کورتکراوی ڕووداوێکی ڕاستەقینە یان دەست هەڵبەستە کە مانایەکی گشتیی لێ دەردەکەوێ: ئینجا وردبوونەوە لەو مانایە دەبێتە هۆی وریابوونەوەی مرۆ سەبارەت بەسوود و زیانی هەموو ڕووداوێکی هاوچەشنی ئەو ڕووداوە ڕاستەقینە یان ئەو ڕووداوە دەست هەڵبەستە. کەوابوو هەموو مەتەڵێک لە ڕووداوێکەوە وەرگیراوە و هەندێ جار بەهۆی وردبوونەوە لەو مەتەڵە کە ئەو ڕووداوەمان بۆ دەردەکەوێ وەک دەڵێ: کاڵەک خۆری یان بێستان ڕن، وەیا دەڵێ: بانێکە و دوو هەوا. دیارە هەریەکە لەو مەتەڵانە ڕووداوێکی تایبەتیان هەیە.

پەندی پێشینان پتر لەناو خوێندەواران و وەرزێران و جووتیاراندا باوە و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم پەندانە لەناو خەڵکدا بەدی هاتوون، بۆیە خەڵک پابەندی ئەو پەندانەن و دەیانکەن بەپشتیوانی قسەکانیان و لە ڕاستەقینەدا پەندی پێشینان ئەو وتە کورتانەن کە بیرێکی مەبەستداریان تێدا چەسپیوە و هەندێ لەو پەندانە بەپەخشانن و هەندێکی بەهۆنراو هۆنراونەتەوە.

پەندی پێشینانی کوردی هێشتا بەتەواوی کۆنەکراونەتەوە و ئەو کەسانەی کە پەندی پێشینانی کوردییان کۆکردووەتەوە بریتین لە: مەلا مەحموودی بایەزیدی و ئیسماعیل حەقی شاوەیس و مەعرووف جیاوگ، شێخ محەمەدی خاڵ، حاجی جوندی، دکتۆر جەمال نەبەز، ئایەتوڵڵای مەردووخ، عەلائەدینی سەجادی، عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی، حاجی تۆفیقی پیرەمێرد، قادری فەتاحی قازی، دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، جگەرخوێن، ئوردیەخانی جەلیل، جەمیل کەننە، قەناتی کوردۆ، عوسمان شاربازێڕی، جەمال بابان، خورشید بابان، جەلیل جەلیلی، حەمەی مەلا کەریم، مستەفا بەرزنجی.

ئاشکرایە لەناو کوردەواریدا گەلێ پەند و مەتەڵی تریش هەیە کە بەداخەوە تا ئێستا بەتەواوی کۆنەکراونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ کاریان لەسەر کراوە و گەلێ کەس خۆی

لەسەری ماندوو کردووە.

پەندی پێشینان ڕستەگەلێکی کورتی ماناداری زانایانەیە کە بەهۆی جوانییەوە لەناو خەڵکدا باوبوون و هەمووان بەکاری دەبەن و کەڵکیان لێ وەردەگرن و زۆربەشیان کێش و سەروادارن و قسەیان پێ دەڕازێتەوە و لە ڕاستەقینەدا پەندی پێشینان قسەگەلێکی کورت واتادارە و خەڵک بەکاریان دەبەن.

پەندی پێشینان سامانێکی دەوڵەمەندی وێژەی کوردییە کە لەوەدا چەشنی بیرکردنەوەی گەلی کوردمان لە باری کۆمەڵایەتییەوە بۆ دەردەکەوێ و هەروەها گەل نەوە و وەچەکانی خۆی بەهۆی ئەم پەندانەوە گەورە دەکا بۆیە ئەم پەندانە پشت بەپشت و سینگ بەسینگ هاتوونەتە خوارەوە و هیچ چەشنە گۆڕانێکیان بەسەردا نەهاتووە و لە ڕاستەقینەدا بەرهەمێکی زۆر کۆن و سادەی فەلسەفەی ڕاستەقینەیە کە هەموو کردەوەیەکی باش و خراپی مرۆ هەڵدەسەنگێنێ و ڕەوشت و ئاکارو ژیری چۆنییەتیی ژیانی بنیادەم دەخاتە ڕوو.

پەندی پێشینان بەئەندامی بنەڕەتیی هەر زمانێک دێتە ژمار کە باری لە ڕێ و ڕەوشتەکانی کۆمەڵ و مێژووی گەلێک بەکۆڵ دەکێشێ و لە ڕاستەقینەدا دەتوانین پەندی پێشینان بەبناغەی وێژەی کوردی دابنێین کە لێرەدا چەند پەندێک دێنین تا بۆ هەموو دەرکەوێ کە ئەم پەندانە چەندە باییدارن و چەند پڕ مانان کە مرۆ دەتوانێ لە بارەی هەر پەندێکەوە نامیلکەیەک بنووسێ:

ڕۆشنیی مانگ سەر لە ئێوارە دیارە، پیاوی پیر کەوچکی ماڵە، نە پێڵاوی تەنگ نەماڵی بەجەنگ، بانێکە و دووهەوا، بەقسەی خۆش مار لە کون دێتە دەر، کوتەک دەزانی قۆناغ لە کوێیە، ساڵ بەساڵ خۆزگە بەپار، ئاسنی سارد بەفوو گەرم نابێ، ئاوەکەی واڕژاوە، تۆ ئاخا و من ئاخا ئەی کێ جێمان بۆ ڕاخا، ئەسپی پێشکەشی دیانی ناژمێرن، ئەگەر زۆر بوو قەواڵە بەتاڵە، من بۆ تۆمە تۆ بۆ کێتە، برابوو بەبرازا کار لەکار ترازا، برەک تابۆز نەبێ لێ نادا، برامان برایی کیسەمان جیایی، بۆیە پێت ئێژم کاکە چۆلەکەم بۆ بگری، دەریا بەدەم سەگ چەپەڵ نابێ، کچم لەگەڵ تۆمە بووکێ گوێت لێ بێ، لە تەک گورگا گۆشت ئەخواو لە تەک مەڕا شین دەکا، دۆستت هەزاربێ کەمە، دوژمنت یەک بێ خەمە، زمسانان پینە و پەڕۆ، بەتاوسانان ورد ورد بڕۆ، چەم بێ چەقەڵ نابێ، خاڵۆ وەلەدە، خزم گۆشتت بخوا، ئێسکت ناشکێنی، خوا بدا مەرگم، زاوا نەکا بەرگم، ئاوێ بڕوا بۆ ڕۆخانە، خوێش بیخوا نەک بێگانە، حەوتی بمرێ لە باوان، سورمەی نابڕێ لە چاوان، دەستی ماندوو لەسەر زکی تێرە، هەموو ڕێگایەک دەچێتە بانە، مارانگاز لە خشەی مێرووله دەترسی،

زمان بوەستێ سەر رەحەتە، بۆ ریش چوو سمێڵی نایە بان، ئەو شوێنە خۆشە کە دڵی تیا خۆشە، گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێ.

سەرچاوەکان


١- قسەی پێشینان - نووسینی ئیسماعیل حەقی شاوەیس - بەغدا ١٩٣٣.

٢- گوتنی پێشینا - نووسراوی جگەرخوێن - شام ١٩٥٧.

٣- گۆرانی و حیکاتێد کوردی قەناتی کوردۆ- ئێرەوان ١٩٦٩.

٤- پەندی پێشینان کۆکردنەوەی شێخ محەمەدی خاڵ بەغدا ١٩٥٧.

٥- پەندی پێشینان کۆکردنەوەی ئوردویخانی جەلیل - ئێرەوان ١٩٦٩.

٦- پەندی پێشینان نووسراوی عەلی مارف شارەزووری- بەغدا ١٩٨١.

٧- پەندی پێشینان لە شیعری کوردی دا- نووسینی کەریم شارەزا- بەغدا ١٩٨٣.

٩- پەندی کوردی نووسینی عومەر دەشتەکی- بەغدا ١٩٨٠.

١٠- هەزار بێژ و پەند نووسراوی مەعرووف جیاوک- بەغدا ١٩٣٨.

# ڕێ و ڕچەی یاری

یارییەکان کە یارسانیشیان پێ دەڵێن، ئەو کەسانەن کە لە سەر ڕێ و ڕچەیەکی زۆر کۆنی باووباپیریان دەڕۆن و بناغەی ڕێ و ڕچەکەیان لەسەر دوونا دوون دانراوە، کە ئارییەکان هەر لە مێژەوە بڕوایان پێی بوو، ئێستاش گەلێک لە نەتەوە ئارییەکان هەر لەسەر ئەم ڕێ و ڕچەیەن.

بەپێی پەڕتووکی سەرئەنجام، ئەم ڕێ و ڕچەیە هەر لە ڕۆژی بەرینەوە هاتووەتە دی و خەڵک سەریان پێ سپاردووە، بەڵام بەپێی ئەو بەڵگانەی کە لەدەستدایە ئەم ڕێبازە لە سەدەی دووەمی کۆچیدا بەهۆی بالوولی ماهییەوە هاتووەتە دی کە گەلێ لە بیرو بڕوای ئایینە کۆنەکانی کوردستان وەکو: زەردەشتی و مەزدەکی و مانەویی تێدایە و هەروەها گەلێ مەبەستی ئایینەکانی ئیسلام و جوولەکە و فەلەشی تێ کەوتووە و لەم دەورەدا بالوول و یارەکانی چۆنییەتیی ڕێبازەکەیان بەهۆنراوی گۆرانی هۆنیەوە و لە سەرتاسەری لوڕستان و کرماشاندا بڵاویان کردەوە و ناویان نا دەورەی بالوول کە گەلێ گرنگ و بایدارە.

لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا ڕێ و ڕچەی یاری پەرەی سەند و سان سەهاکی بەرزنجی و یارەکانی لە هەورامان و شارەزووردا گەلێ تێ کۆشان و ڕێبازەکەیان پەرەدا، وە ڕێ و ڕەوشتەکانی یارییان خستە قاڵبی هۆنراوی گۆرانییەوە و ناویان نا، سەرئەنجام کە گەلێ مەبەستی ئاینی لەم پەڕاوەدا نووسراون.

لە یەکێ لە نامیلکەکانی یاریدا نووسراوە کە بنیادەم هەر لە سەرەتای بەدیهاتندا تا ڕۆژی دوایی هەزار و یەک لەش دەگۆڕێ و بەگۆڕانی هەزار و یەک لەش گیانی نەمر دەبێ و دەڕواتە شارەزوور کە بەهەشتە و ئەوانەش وا خراپن گیانیان دەڕواتە لەشی گیاندارانی دڕندە و جانەوەرەکان و لەپاش گۆڕانی هەزار و یەک لەش دەچنە دۆزەخ و هەموو دەم سزا دەدرێن و هەر لەسەرگەردانیدا دەمێننەوە.

لە یەکێ لە پەڕتووکەکانی تری یاریدا نووسراوە، ئەوەی کە لەم جیهانەدا دەبینرێ بنج و بناوانی دەگەڕێتەوە بۆ جیهانێکی ترو خەڵکی ئەم جیهانە نوێنگەی خەڵکی جیهانێکی ترن و بەرەی مرۆ کە لەم جیهانەدا ژیان دەباتە سەر هەموو وەچە و ڕەچەڵەکی ئەو جیهانەن و

پەیوەندیی بەجیهانێکی ترەوە هەیە و لەم جیهانەدا مێوانن و لەپاش ماوەیێکی تر دیسان دەگەڕێنەوە بۆ مەڵبەندی بنەڕەتیی خۆی و ئەگەر لەم جیهانەدا کردەوەی باش بێ لەپاش هەزار و یەک دوون نەمر دەبێ و مرۆ کاتێ کە دێتە جیهانەوە گیانی هەموو شتێک دەزانێ، بەلام لەشی دەبێتە بەرهەڵستی و هیچی ناکەوێتە بیرو دەبێ دیسان ئەو شتانەی کە دەیەوێ فێریان ببێ و کەڵکیان لێ وەرگرێ.

سان سەهاک لەپاش ئەوەی ڕێ و ڕچەی (یاری)ی پەرەی پێ دا و ڕازەکانی (یاری)ی بەچەشنی یاسا و ڕەوەند دەرهێنا و ڕای گەیاندە یاران و هاوەڵان و لایەنگرانی خۆی ئەوسا یارن و پێڕەوانی خۆی بەچواردە تاقم دابەش کرد و بۆ هەر کامیان ئەرکێکی دانا کە ناوی ئەو چواردە تاقمە بەم چەشنەیە: هەفتەن، چل تەن، هەوتەوانە، یارانی قەوەڵتاس، حەفتا و دوو پیر، حەوت خەلیفە، حەوت مجێور، حەوت حەوتەوان، چل چل تەنان ، نەوەد و نۆ پیری شاهۆ، شەست و شەش خولامی پشتێن زێڕین، هەزار و یەک بەندەی وەک خواجە، بەیوەر هەزار بەندە، بەیوەند بەندە.

لەناو ئەم چواردە تاقمەدا، حەوتەن و چل تەن و حەوتەوانە و حەفتا و دوو پیر لە تاقمەکانی تر پیرۆزتر و سەرکەوتووترن و بەپێی پەڕاوی سەرئەنجام حەوتەن کە لە بنەڕەتا حەوت فریشتەن، پاسەوانی ئاسمان و مانگ و خۆر و ئەستێرەکان و هەوا و با و زەوی و ئاو و گیا و ئاگر و ئاسنیان پێ سپێرراوە گیانی ئەم فریشتانە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا چوونە لەشی: پیر بنیامین و پیر داود و پیر مووسا و دایە ڕێزوار و مستەفا دەودان و شا ئیبراهیم و بابە یادگار.

حەوتەوانە بریتییە لە حەوت فریشتە کە بەپێی پەڕتووکی سەرئەنجام لە تیشکی خوا بەدی هاتوون و ئەرکی ئەوان ڕێنوێنیی بەندەکانی خوایە و ئەم حەوت فرێشتەیە لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا چوونە لەشی حەوت پیاوی پاک و پارێزگار و ناوەکانیان بەم چەشنەیە: سەی محەمەدی بەرزنجی، سەی میر ئەحمەدی میرسوور، سەی شەهابەددینی شارەزووری، سەی ئەبولوەفاء، سەی مستەفای شارەزووری، حاجی سەی باوەیسی، شێخ حەبیب شا.

بەپێی پەڕتووکی سەرئەنجام هەر کام لە پەیڕەوان و لایەنگرانی یاری دەبێ بەیەکێ لە بنەماڵەکانی یاری سەر بسپێرن و پیر و دەلیلێکیان هەبێ و ئەم مەسەلەش ئەوەندە گرنگە کە تەنانەت سان سەهاک، پیر بنیامین و پیرداودی بەدەلیلی خۆی بۆ سەر سپاردن هەڵبژارد و ئێستاش دەلیل دەبێ لە وەچەی حەفتا و دوو پیر و بنەماڵەکانی یاری بێ و لە هەر دەورێکدا هەر یارییەک دەبێ پیر و دەلیلێکی هەبێ.

بنەماڵەکانی یاری کە لەسەدەی هەشتەمی کۆچی تا سەدەی دوانزەمی کۆچیدا کە

لەلایەن سان سەهاک و ڕێبەرانی تری یارییەوە بەدی هاتوون و بەناوی سەیی ناسراون و سەیی بەکەسێک دەوترێ کە لەو بنەماڵانەبێ و ئەرکی ئەو خوێندنی دوعا و نزایە لەسەر قوربانییەکان، چونکە هەر قوربانییەک کە بکرێ دەبێ دوعای لەسەر بخوێنن و بنەماڵەکانی یاری ئەمانەن: بنەماڵەی شا ئیبراهیمی، بنەماڵەی بابە یادگاری، بنەماڵەی خامۆشی، بنەماڵەی عالی قەلەندەری، بنەماڵەی میر سووری، بنەماڵەی مستەفایی، بنەماڵەی حاجی باوەیسی، بنەماڵەی زەنووری، بنەماڵەی ئاتەش بەگی، بنەماڵەی شاهەیاسی، بنەماڵەی بابە حەیدەری.

بەپێی پەڕاوی سەرئەنجام هەر یاریەک دەبێ سەربسپێرێ و بۆ سەر سپاردن پێویستە دانەیەک گوێزی هیندی و دەستماڵ و هەنار و نەوات و دراو و کارد و کەڵەشێر و مەنێک برنج و چارەکێک نان و کەمێک خوێ هەیە کە لەپاش فەراهەمکردنی ئەم پێویستییانە، برنج و ڕۆن و کەڵەشێرەکە لێ دەنن و پاشان پیر و دەلیل ڕێ و ڕەوشتی سەرسپاردنی منداڵەکە ئەنجام دەدەن.

یارییەکان هەر حەوتەیەک دەبێ لە شوێنێکدا بەناوی جەمخانە کۆبنەوە و لەوێدا خەریکی پەرستنی خوا و خوێندنی سروودگەلێکی ئاینی بن و تەنبوور لێ بدەن و ئەم جەمەش نابێ کەمتر لە سێ کەس بێ و ژنان لەم جەمەدا مافی بەشدارییان نییە، بەڵام دەتوانن لە پشتی جەمەکەوە دانیشن و گوێ بۆ قسەکانی پیر ڕاگرن.

ئەو کەسانەی کە دێنە ناو جەمەوە دەبێ پشتێن ببەستنەوە، چونکە بەستنی پشتێن پێویستە و بەبێ پشتێن بەستن کەسێک مافی ئەوەی نییە بێتە ناو جەمخانەوە و لەکاتی هاتنە ناو جەمخانەوە، دەبێ پشتێنەکانیان گرێ بدەنە یەکەوە و بەچەشنی چەمەرە بەدەوری یەکدا دانیشن.

بەپێی پەڕتووکی سەرئەنجام هەر یارییەک دەبێ لە ساڵدا شەش ڕۆژ ڕۆژوو بگرێ تا بەخوا نزیک بێتەوە و ئەم شەش ڕۆژەش لە دووجاردا دەگیررێ. ڕۆژووی جاری هەوەڵ ڕۆژووی مەڕ نوێیە کە لە دوانزەیەمی چلە گەورەی زستانەوە تا چواردەیەمیەوەیە و جاری دووەم لە چواردەمی چلە گەورەی زستانەوەیە تا حەڤدەمی، وە لە دوای گرتنی ئەم ڕۆژووانە سێ مسقاڵ زێڕ بەناوی سەرانە دەدەنە بنەماڵەکانی پیر و دەلیل کە دووبەشی ئەو زێڕانە دەگاتە بنەماڵەی پیرو بەشێکی تری دەگاتە بنەماڵەی دەلیل.

نیاز و قوربانی کردن لەناو یارییەکاندا زۆر گرنگە و بەپێی پەڕاوی وردە سەرئەنجام لە نێوان یارییەکاندا نەزرو نیاز هەیە کە بریتین لە: خزمەت، نیاز، شوکرانە، قوربانی.

قوربانییەکە دەبێ بەناوی خواو ڕووەو ڕووگە سەرببڕن و خوێنی قوربانییەکە دەبێ

بشارنەوە و ئێسقانەکانی دەبێ بەجۆرێ لە گۆشتەکەی جیاکەنەوە کە نەشکێ و زراوەکەی و سپڵەکەی و ڕیخۆڵە کوێرە و گوێچکەکانی دەبێ لە شوێنێکدا بشارنەوە تا هیچ جانەوەرێک دەستی پێیان نەگا.

ڕێ و ڕچەی یاری لەسەر چوار پایە دانراوە کە بریتین لە: پاکی و ڕاستی و لەناوبردنی فیز و هەواو بەخشش کە هەر یارییەک لەسەر ئەم چوار پایە لە ژیاندا بەکاربباو لەو چوار ڕێگەیە لانەدا و لە سەری بڕوا.

یارییەکان لەگەڵ ئەوەی ئاین و ڕێ و ڕچەیەکی کوردییان هەیە، گەلێ ڕاژە و خزمەتیشیان بەزمانی کوردی کردووە و هەر لەسەدەی دووەمی کۆچییەوە تا ئاخر و ئۆخری سەدەی سێزدەیەم گەلێ پەڕتووک و نامیلکەیان بەزاراوەی گۆرانی نووسیون و بەیادگار بەجێیان هێشتوون کە ئەو پەڕتووکانە لە: دەورەی بالوول، دەورەی بابە سەرهەنگ، دەورەی شاخوەشین، دەورەی بابە ناووس، دەورەی بابە جەلیل، دەورەی پیرعالی، دەورەی دامیار، سەرئەنجام، وردە سەرئەنجام، دەورەی حەوتەوانە، بارگە بارگە، گڵێم وە کۆڵ، دەورەی چلەن، دەورەی عابدین، دەورەی قرمزی، دەورەی حەیدەری، دەفتەری پردیوەر، دەفتەری ساوا، دەفتەری دیوان گەورە، زوڵاڵ زوڵاڵ، کەلامی سەی خامۆش، کەلامی عێل بەگی، کەلامی خان ئەڵماس، کەلامی شاتەیموور، کەلامی شێخ ئەمیر، کەلامی زولفەقار، کەلامی قاسد، کەلامی نەورۆز، کەلامی حەیدەری، کەلامی جەناب، کەلامی موجرم، کەلامی دەروێش ئوجاق، کەلامی دەروێش قولی.

تەواوی ئەو پەڕتووکانە بەهۆنراوی دە هیجایی هۆنراونەتەوە و بەیادگار ماونەتەوە. سەرئەنجامێکی تر هەیە کە بەشێوەی پەخشانە و داگری بیست و یەک بەندە و هەر بەندێکی لەسەر مەبەستێکی ئاینی نووسراوە کە گەلێ گرنگ و بایداره.

سەرچاوەکان

١- گۆران نووسینی پرۆفیسۆر مینۆرسکی وەرگێڕاوی د. ناجی عەباس- گەلاوێژ ژمارە- ١٩٤٣.

٢- کورد نووسینی مینۆرسکی وەرگێڕاوی حەمە سەعید کەریم- بەغدا ١٩٨٤.

٣- شاهنامە حقیقت اثرحاج نعمت الله جیحون آبادی بەکوشش دکتر محمد مکری- تهران ١٩٦٤.

٤- سرودهای دینی یارسان، ترجمە ماشاء الله سوری- تهران ١٣٤٤.

٥- برهان الحق، تالیف نور علی الهی- تهران ١٣٤٣.

٦- رموز دینی یارسان تالیف سید قاسم افضلی- تهران ١٣٤٥.

٧- مشاهیر اهل حق، تالیف صدیق صفی زادە (بۆرەکەیی) تهران ١٣٦١.

۸- بزرگان یارسان، تالیف صدیق صفی زاده- تهران ۱۳۵۲.
۹- نوشته‌های پراکنده درباره یارسان، تالیف صدیق صفی زاده- تهران ۱۳۶۱.
۱۰- دوره هفتوانه جزوی ازنامه سرانجام تالیف و تفسیر صدیق صفی زاده- تهران ۱۳۶۰.
۱۱- الکاکائیه فی التاریخ، تالیف عباس العزاوی- بغداد ۱۹٤۹.

# پەڕتووكی سەرئەنجام

لەبەرئەوەی هەندێک لە نووسەران، سەبارەت بەپەڕتووكی سەرئەنجام بەهەڵە دواون و هیچ چەشنە زانیارییەكیان لە بارەی ئەم پەڕتووكەوە نییە، ئەوە بوو كە بڕیارم دا لەم بارەوە وتارێک بنووسم و لەسەر ئەم پەڕتووكە بكۆڵمەوە. سەرئەنجام ناوی یەكێ لە پەڕتووكەكانی ئاینی یارییە كە لەسەدەی هەشتەمی كۆچیدا بەهۆی سان سەهاک و یارەكانییەوە، بەزاراوەی گۆرانی هۆنراوەتەوە. ئەم پەڕتووكە داگری شەش بەشە بەناوانی: دەورەی حەوتەوانە، بارگە بارگە، گڵێم وەكۆڵ، دەورەی چلتەن، دەورەی عابدین، وردە سەرئەنجام، دەورەی حەوتەوانە لەبارەی قوربانی و خێر و خێرات و ڕاز و نیاز و گەشت و گێڵی فریشتەكانە لە حەوت چینی ئاسمانەكاندا و هەروەها سەبارەت بە بەدیهاتنی ئاسمان و زەوی و مەشیە و مەشیانە دەدوێ. مەشیە و مەشیانە بریتییە لە ئادەم و حەوا.

ئەو هۆنەرانەی كە هۆنراوەكانی ئەم بەشەیان هۆنیونەتەوە بریتین لە: سان سەهاک، پیربنیامین، پیرداود، پیرمووسا، پیرڕەزبار، پیرشالیاری هەورامی، پیرنەدری شاهۆیی، پیرڕۆستەمی سۆ، پیرنەقی هەورامی، پیرنیگادارتانی، سەی محەمەدی شارەزووری، پیرئیسماعیلی كۆلانی، سەی محەمەدی گەورە سوار، سەی ئەبولوەفا، سەی مستەفا، سەی میر ئەحمەد، سەی شەهابەدین، سەی حەبیب، سەی باوەیسی، خەلیفە عەزیزی سلێمانی، خەلیفە محەمەد، خەلیفە شاشا، خەلیفە شەهابەدین، خەلیفە باپیر، خەلیفە ئەمیر، خەلیفە جەبار، مستەفا دەودان، شا ئیبراهیمی ئێوەت، سەی ئەحمەدی بابەیادگار.

بەپێی پەڕاوی سەرئەنجام خوای مەزن بەشێک لە ڕۆحەكەی خۆی جیاكردەوە و ئەوسا چەندین فریشتەی بەناوانی: حەوتەن و چل تەن و چل چل تەن و حەوت خەلیفە و حەوتەوانە و بەیوەر هەزار خولام و بەیوەن خولامی بەدی هێناو پاشان چووە ناو دوڕێک لەپاش ماوەیەک لە دوڕەكە هاتە دەرو ئەوسا دوڕەكە تەقی و لە تەقینەوەی دووكەڵێک هەڵسا و ئاسمان و زەوی و ئەستێرەكان و مانگ و خۆر و شەو و ڕۆژی بەدی هێناو پاشان لەگەڵ یەكێ لە فریشتەكانیدا بەناوی بنیامین كەوتە گەڕانی حەوت چینی ئاسمان و لە هەر چینێكی ئاسماندا فریشتەكان كۆ دەبوونەوە تا خوا بێتە ناویان و هەر كە ئاواتیان دەهاتەدی یەكێكیان خۆی دەكردە قوربانی.

بارگە بارگە بەشی دووەمی پەڕتووکی سەرئەنجامە کە لەبارەی بارگە و خێوەتەکانی خواییبە کە لە وڵاتەکانی جۆر بەجۆری ئێران و جیهاندا هەڵدراوە و هەروەها لەبارەی گەڕانی گیانی فریشتەکانە لە لەشی پێغەمبەران و پاشایان و پیاوە گەورەکان و پارێزگاراندا ئەم بەشە بەهۆی حەفتا و دوو پیرەوە کە هەموویان هۆنەر و زانا هۆنراوەتەوە. بارگە بارگە بریتییە لە حەفتا و دوو پارچە هەڵبەست کە هەر پارچە هەڵبەستێکی بەشێوەیێکی جوان لەسەر مەبەستێک هۆنراوەتەوە و دیاردی بەگەڵێ لایەنی ئەفسانەیی و میتۆلۆژیایی و ئاینی دیاردی کراوە. ناوی حەوتاودوو پیر بەم جۆرەیە:

پیر سلێمانی سیستانی، پیر قابیل سەمەرقەندی، پیر ڕوکندین، پیر میکائیل دەودانی، پیر نالیی مۆردینی، پیر تایەری ئەسپەهانی، پیر شەمسی عەلەمدار، پیر کەمالی مامۆلانی، پیر ڕاستگۆی قەرەداغی، پیر تەقیی شاهۆیی، پیر حەیدەری لوڕستانی، پیر نەڕە بالامۆی، پیر ئەحمەدی لوڕستانی، پیر تاجەدینی فارس، پیر حسێنی کاشانی، پیر مەحموودی بەغدادی، پیر عەبدولعەزیزی بەسرەیی، پیر ئیبراهیمی جاف، پیر سلێمانی ئەردەلانی، پیر خالقی ئاردەوێلی، پیر مەنسووری شووشتەری، پیر عیسا شوقاقی، پیر حەیدەری کەل مەیدانی، پیر مالکی گۆران، پیر مامڵی مایدەشتی، پیر ناسری بەختیاری، پیر عیسا بساکانی، پیر خەلیلی مووسڵی، پیر جافری کوردستانی، پیر حەمزەی بیری شاهی، پیر حسێنی ئەستەمووڵی، پیر ئەلیاسی مۆریاسی، پیر فەیرۆزی هندی، پیر هەیاسی مەغربی، پیر ئیگادارتانی، پیر قەمەر سەراو قوماشی، پیر تامازی کرمانی، پیر تەیمووری هەورامانی، پیر ڕەحمەتی بومبەیی، پیر قوبادی دێوانە، پیر کازمی کەنگاوەری، پیر دانیالی دالاهۆیی، پیر مووسا میانەیی، پیر سوورەی هندلەیی، پیر سادقی مازەندەرانی، پیر نیعمەتی تەبەردار، پیر دلاوەری دەرەشیشی، پیر حەیاتی ماچینی، پیر قانوونی شامی، پیر حاتەمی هەمەدانی، پیر محەمەدی شارەزووری، پیر ناریی هەورامی، پیر ئیسماعیل کۆلانی، پیر نازداری شیرازی، پیر نەریمانی شاهۆیی، پیر تەیاری خوەراسانی، پیر عنوان کەعبەیی، پیر ئەحمەدی گەنجەیی، پیر ئەحمەدی برساهی، پیر نادری قەرەپاپاقی، پیر شالیاری هەورامی، پیر مەحموودی لوڕستانی، پیر نەجمەدینی پارسی، پیر نەقیی تووکانی، پیر هاشم ڕژوی، پیرەمێردی هۆردینی، پیر بابە غەیبی هاواری، پیر شەمسەدین، پیر عەزیزی هۆنەدانە، پیر فەتالیی سەحنەیی، پیر ڕۆستەمی ڕسۆ.

گلێم وەکۆڵ کە بەشی سێیەمی پەڕتووکی سەرئەنجامە، سەبارەت بەخەباتەکان و هەڵسوکەوتەکان و ڕەنجەکانی پیر بنیامینە لە یەمەن کە ماوەیەک جلوبەرگی ئەستووری کردووەتەبەر لە یەمەندا خەریکی ئاو فرۆشی بووە و پاشان لەگەڵ هەندێ لە یارانیدا

سواری کەشتیەک بووە و لە دەریای ئەسکەندەریەوە تێ پەڕیوە و لەپڕ بایەک هەڵی کردووە و بووەتە تۆفان و دانیشتووانی کەشتییەکە چەند ڕۆژێک لە سەختی و برسیەتیدا ژیانیان بردووەتە سەر تا پیر بنیامین لەگەڵ خوادا کەوتووەتە ڕاز و نیاز و سەرئەنجام لەو تۆفانە ڕزگاریان بووە و چوونەتە مەڵبەندەکەی خۆیان و بەدیتنی سان سەهاک شادبوون.

هۆنراوەکانی ئەم بەشە بەهۆی دوانزە هۆنەرەوە هۆنراوەتەوە کە بریتین لە: سان سەهاک، پیر بنیامین، پیرداوود، سەی میر ئەحمەد، سەی مستەفا شارەزووری، سەی محەمەد شارەزووری، سەی ئەبولوەفا شارەزووری، سەی شەهابەدینی شارەزووری، سەی حەبیب شا، حاجی سەی باوەیسی، هووسپە، هوورز.

دەورەی چل تەن کە بەشی چوارەمی پەڕتووکی سەرئەنجامە، سەبارەت بە بەدیهاتنی چل فریشتە دەدوێ کە ئەمانە هەر لە ڕۆژی بەرینەوە بۆ ڕازداری خولقێنراون و لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا چوونە لەشی چل پیاوی پارێزگار و خەڵکیان بۆ یەکتاپەرستی هان داوە و ئەم بەشەش بەهۆی چل هۆنەرەوە هۆنراوەتەوە کە لەوانەدا سەبارەت بەگەورەیی و مەزنی و بەخشندەیی خوا باس کراوە.

هەروەها سەبارەت بەتاریکی و ڕۆشنی و چاکە و خراپەش باس کراوە. ناوی ئەو چل هۆنەرە بەم جۆرەیە: دەمام، شەمام، قامووس، ئەژدەر، ئەنوەر، نگین، گەوهەر، مسکین، مۆمن، سەفیر، کەبیر، ناری، سابق، قانوون، سەیاد، لامی، پێشەنگ، ئەوڕەنگ، خەزاوی، شمشاڵ، سیقاڵ، عەزازیل، ئیدراک، خونجی، مەستی، غازی، وردی، نیشان، چەرگا، سەقا، مەرزی، بیا، تەوار، سەراف، سروور، تۆفیق، ڕەزتاب، قەندیل، شەمیل.

دەورەی عابدین کە بەشی پێنجەمی سەرئەنجامە، بریتییە لە ڕاز و نیازەکانی عابدینی جاف کە سەبارەت بەگیان و ڕۆح و پیاوچاکان دواوە و ئەم بەشە پتر بەهۆنراوی حەوت هیجاییە و لەسەر شێوەی جافی هۆنراوەتەوە کە هەندێ هۆنراوی سان سەهاک و پیر بنیامین و پیر مووسایشی تێدایە.

وردە سەرئەنجام کە بەشی شەشەمی پەڕتووکی سەرئەنجامە بریتییە لە هەندێ مەبەستی ئاینی وەکو جەم و جەمخانە و گوێز شکاندن و سەرسپاردن و ناونانی منداڵ و ژن خواستن و پاڕانەوە و پەند دادانی گیانی مردووان و ئەم بەشەش بەهۆی چوار هۆنەر هۆنراونەتەوە کە بریتین لە: سان سەهاک، پیر بنیامین، پیر مووسا، مستەفا دەودان، پەخشانەکانی ئەم جزمە بەفارسی نووسراون.

سەرچاوەکان

١- دەورەی حەوتەوانە (دەستنووس).

٢- بارگە بارگە (دەستنووس).

٣- دەورەی گڵێم وەکۆڵ (دەستنووس).

٤- دەورەی چل تەن (دەستنووس).

٥- دەورەی عابدین (دەستنووس).

٦- وردە سەرئەنجام (دەستنووس).

٧- کورتەی پەڕتووکی سەرئەنجام (دەستنووس).

٨- دەفتەری پردیوەر (دەستنووس).

## بۆچ هۆنراو بەزاراوەی گۆرانی هۆنراوەتەوە

ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە کە زۆربەی هۆنەرانی کورد هەر لەسەدەی دووەمی کۆچییەوە تا سەرەتای سەدەی سێزەهەمی کۆچی، هۆنراویان بەزاراوەی گۆرانی هۆنیوەتەوە، ئەمەش هۆی ئەوەبووە کە خەڵکی مەڵبەندی شارەزوور و ئەردەڵان بەزاراوەی گۆرانی و شێوەکانی دواون و جگە لەوەش ڕێ و ڕچەی یاری (کاکەیی) کە لە لوڕستان و هەورامانـدا پەیدابووە، لەبەرئەوەی شا خوەشینی لوڕستانی و سان سەهاک و یارەکانی بەزاراوەی گۆرانی دواون ئەوەیە کە ئەم زاراوەیان کردووەتە زاراوەیەکی ئاینی و تەواوی پەڕتووکە ئاینییەکانیان بەو زاراوە نووسیون و تەنانەت لە سەدەی دووەمی کۆچیدا کە بالوول و یارەکانی سەریان هەڵداوە زۆربەی هۆنراوەکانیان بەگۆرانی وتووە و شاخوەشین و یارەکانیشی کە لە لوڕستاندا ژیاون هەر بەگۆرانی دواون و نووسراوەکانیشیان هەر بەگۆرانی بووە کە ئێستا هەموویان لەبەردەست دایە.

جا هەر هۆنەرێکی تری کورد لە هەر مەڵبەندێکی کوردستاندا کە ژیاوە لاسایی ئەو هۆنەرانەی کردووەتەوە و هەر بەگۆرانی هۆنراوی هۆنیوەتەوە و تەنانەت ئەو زاراوانەیان بەکاربردوون کە هۆنەرانی گۆران لە هۆنراوەکانیاندا بەکاریان بردوون چونکە ئەو زاراوەیان بەزاراوەیەکی زانستی داوەتە قەڵەم و تەنانەت هەندێک لە لێکۆڵەران و نووسەران ئەو زاراوەیان بەپاشماوەی زمانی ئاڤێستایی و پەهلەوی داناوە.

جگە لەوەش زاراوەی گۆرانی دەچێتەوە سەر زمانی ئاڤێستایی کە زەردەشت پەڕتووکی ئاڤێستای پێ نووسیوە و زۆربەی مێژوونووسانی کورد و بێگانەش هەر لەسەر ئەو بیروڕایەن کە زمانی ئاڤێستایی زۆر لە زاراوەی گۆرانی دەچێ، دەقاودەق گۆرانییە و زۆربەی هۆنراوەکانی زەردەشتیش لە گاتەکاندا هەر لە زاراوەی گۆرانی دەچێ و لەسەر هێجا هۆنراونەتەوە بۆیە هۆنەرانی کوردیش هەر لەسەرەتاوە بەم زاراوە هۆنراویان هۆنیوەتەوە.

ئەوەش دەبێ بڵێین هەورامان کە مەڵبەندێکی شاخاوییە هیچ نەتەوەیەک خۆی بۆ نەکوتاوە و بەم هۆیەوە هەورامییەکان جگە لە زمانەکەی خۆیان ئاشنایەتییان بەزمانەکانی تر نەبووە تا هۆنراوی پێ بهۆننەوە و هەرکە دڵ و دەروونیان هاتووەتە جۆش و خرۆش

بەزمانەکەی خۆیان مەبەستەکەیان دەربڕیوە و بەخەڵک ڕایان گەیاندووە و سانەکانی هەورامانیش کە لە هەوراماندا فەرمانڕەواییان کردووە، هۆنەرانیان هان داوە کە بەزمانی زکماکی خۆیان هۆنراو بهۆننەوە.

شێخەکانی هەورامانیش کە پێڕەوی ڕێ و ڕچەی نەقشبەندی بوون زۆربەیان خۆیان هۆنەر بوون و مەلاکان و دەروێشەکانی خۆیان هان داون کە بەزاراوەی گۆرانی هۆنراو بهۆننەوە بۆ وێنە مەولەویی نەمر کە خەڵکی تاوەگۆز بووە، بەشێوەی جافی دواوە، بەڵام بەشێوەی هەورامی دەستی کردووەتە، هۆنراو هۆنینەوە تا گەیشتووەتە ئەو پلەوپایە بەرزە.

والییەکانی ئەردەڵانیش کە زۆربەیان هەر بەهەورامی دەدوان، هۆنەرانیان هان دەدا کە بەزاراوەی گۆرانی هۆنراو بهۆننەوە تەنانەت هەندێ لە والییەکان وەکو کەڵباڵی خانی ئەردەڵان و خەسرەو خانی ئەردەڵان و ئەمانوڵلاخانی ئەردەڵان، خۆیان هۆنەربوون و هەر بەهەورامی هۆنراویان هۆنیوەتەوە.

ئێستاش زۆربەی هۆنەرانی کرماشانی و ئیلامی و هەوشاری و لوڕستانی هەر بەزاراوەی گۆرانی هۆنراو دەهۆننەوە، چونکە بەزاراوەیەکی پیرۆزی دادەنێن کەچی خەڵکی ئەو مەڵبەندانە هیچ کامیان لەسەر ڕێ و ڕچەی یاری نارۆن، بەڵام هەر حەز لە زاراوەی گۆرانی دەکەن و بەو زاراوە هۆنراو دەهۆننەوە و کەواتە بنەڕەتی وێژەی کوردی لەسەر زاراوەی گۆرانی دانراوە، بۆیە گەلێ وشەی گۆرانی کەوتووەتە ناو زاراوەکانی تری کوردییەوە و گەلێ لە هۆنەرانی کوردی مەڵبەندەکانی تری کوردستان وەکو: تایەربەگی جاف و مەلای جەباری و حەریق و مەولانا خالد و وەلی دێوانە و مەستوورە خانمی کوردستانی لەگەڵ ئەوەی بەزاراوەکانی خۆیان هۆنراویان وتووە بەزاراوەی گۆرانییش هۆنراویان هۆنیوەتەوە.

لەم دواییەدا سێ قەواڵەی کۆن کە لەسەر پێست نووسراون لە هەوراماندا دۆزراونەتەوە و ئەم قەواڵانە کە لەسەدەی یەکەمی پێش زاییندا نووسراون، کەوتوونەتە دەستی دوکتۆر سەعید خانی کوردستانی و ئەویش ئەوانەی داوەتە پرۆفیسۆر مینس کە تەرجەمەیانی کردووە. وەکو دەڵێن یەکێک لە سۆفییەکانی عەلائەدینی نەقشبەندیی بەناوی سۆفی عەبدوڵلا ڕۆژێکیان دەڕواتە لای شێخ و پێی دەڵێ کە لەسەر کێوی سوورێندا تاشە بەردێکی دیوە کە وێنەی پیاوێکی لەسەر کەنراوە و تیرێکی بەدەستەوەیە و بەرەو خۆی دەیهاوێژێ و پاشان بۆ شێخ دەرکەوت کە تیرەکە بەرەو ئەشکەوتێکی سەخت دەڕوا و کە چوونە ئەشکەوتەکە چاویان کەوتە کووپەڵەیەک کە پڕی بوو لە هەرزن و لەگەڵ ڕۆکردنی هەرزنەکە سندووقێکی تێدا دەرکەوت کە سێ قەواڵەی تێدا بوو مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ دەوری

فەرهادی چوارەم کە لە ساڵانی ٣٨ تا ٢ی بەر لە زایندا ژیاوە. ئەم سێ قەواڵە دووانیان بەزمانی یۆنانی و قەواڵەی سێیەم بەزاراوەی گۆرانیی کۆن نووسراون و قەواڵەکانیش هی چەند دێیەک و ڕەزستانێکە کە بۆ ماوەیەک دراونەتە کرێ. ئەمەش دەقی قەواڵەی سێیەم بەزاراوەی گۆرانیی کۆن:

شەنەت ق بەرەخا ئەڕۆتەت میبنوو بەتەسپەک بەری تورین. یەکی کەرما ئەسمەک من ئەبیکە شکەن بەلزیات. ڕەزنبوو ئەریل بەری بەشەنین دەدنەهی کولا زوزن. مەمن بوومخوتی ئەخ هەمی ئەدلوو قەدەمتوو شەهدین تیریک بەری ئەبینی بەری ڕەشنو ئەرشتەت. بەری ئەبنوو گریپنە هی بەری میترپدی سنیەک بەری ماتبەنگ کەرما نەسەمتەن ڕەززینەت ئەریل من پەتەسپەک کولا زوزن.

واتە: ساڵی سێ سەدی هاوینی مانگی جۆزەردان میبنووی پەتەسپەکی کوڕی تورین، نرخ و بایی ڕەزی ئەسمەک کە داویە بۆ گەڕاندنەوەی خاوەنەکەی، ڕەزەوان ئەریل کوڕی بەشنین پێی داو، ئەمیش لەسەر یەک پەنجاو پێنج زۆزین، ئەوەش وا لەلای خاوەن زەوییەکەو ئەو دانی پێدا ناوە لە بەرامبەر پێشکەشی دا، بەشایەتەکان تیریک کوڕی ئەبینی کوڕی ڕەشنوو ئەرشتەتی کوڕی ئەبنوو گریپنەهی کوڕی میترا پەدی سینەک کوڕی ماتبەنگ، نرخی ڕەزی نەسەمتەن ڕەز دەگەڕێتەوە بۆ ئەریل پەتەسپەک بەتەواوی پەنجاو پێنج زۆزن یا درهەمە.

لەم قەواڵەدا هەندێ وشە بەئارامی نووسراوە وەکو: وشەی شەنەت بەواتای ساڵ، ق کە بریتییە لە قیپای ئارامی بەواتای هاوینەو وشەی یەرەخا بەواتای مانگەو وشەی پەلز بەواتای ئیوەو وشەی قەدەمتوو بەواتای پێشکەش وشەی شەهدین بەواتای شایەتەکان وشەی کەرما بەواتای ڕەزە. لێرەدا بۆمان دەرکەوت کە وشەکان لەو دەورەدا بەئارامی دەنووسراو لەکاتی خوێندنەوەدا بەگۆرانی دەخوێنرایەوە کە بەمە هوزرواش دەڵێن.

لەم قەواڵەدا هەندێ وشەی گۆرانیمان دەکەوێتە بەرچاو کە لە بنەڕەتدا پەیوەندییان بەناوچەی هەورامانەوە هەیە، وەکو: ئەڕۆتات کە ناوی مانگی جۆزەردانە و تیریک کە لە بنەڕەتدا میترایە و لەگەڵ پاشگری کۆدا پێک هاتووە و ڕەشنوو کە ناوی فریشتەیەکە لە هۆنراوەکانی یاریدا ڕەش نووسراوە و میترپدی بەواتای مێهر و خۆشەویستییە و مار بەواتای نەوەیە و بار هەربارە و یەکی هەر ژمارەی یەکە، وە بوومخوتی بەواتای خاوەن و گەورەی زەوییزارە و هەمی بەواتای هەمووە، وە لەم قەواڵەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ڕەز دەگەڕێتەوە بۆ خاوەن زەوی و زارەکە نیوەی بۆ ئەریل بەجێی هێشتووە و ئەم نیوەیەش فرۆشراوە، وەیان بەهۆی گۆڕینی خاوەنیەتی کرێکەی بۆ پتسیک بەپەنجاو پێنج درهەم. وە

خاوەن زەوی لەپێش شایەتەکان لەسەر نیوە بەنیوکردنی پیشان دەدات و نرخەکەی وەرگیراوە.

کەواتە زاراوەی گۆرانی زاراوەیەکی زۆر کۆنە و لەم قەواڵەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە گەلێ مەبەست بەم زاراوە نووسراوە بۆیە هۆنەرانیش هەر لە مێژەوە بەم زاراوە هۆنراوییان هۆنیوەتەوە.

سەرچاوەکان

١- لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری نووسینی د. جەمال ڕەشید ئەحمەد - بەغدا ١٩٨٨.

٢- پەڕتووکی سەرئەنجام (دەستنووس).

٣- دامیار دامیار (دەستنووس).

٤- دەفتەری ساوا (دەستنووس).

٥- دەورەی بالوولی ماهی (دەستنووس).

# ڕێ و ڕچەی ئێزیدی

ئێزیدییەکان کە ڕێ و ڕچەیەکی کۆنیان هەیە، مێژوو نووسان لایان وایە کە لە پاشماوەی پێڕەوانی ئاینی مانین و ئەمانە لەپاش پەرەسەندنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، کوێستانەکانی حەلوان و شارەزووریان کردە پەناگای خۆیان و لەوێدا مانەوە تا بتوانن ڕێبازەکەیان بپارێزن، بەڵام پەرەسەندنی ئیسلام بووە هۆی ئەوە کە گەلێک لە ئێزیدییەکان و ئەوانەش وا لەسەر ڕێ و ڕچەکەی خۆیان مانەوە کۆچیان کردە شاخ و داخەکانی کوردستان، بەڵام بەرە بەرە هەندێ لە بیروبڕواکانی فەلە و جوولەکە و ئیسلامیان لە ڕچەکەیاندا جێ کردەوە و بەم چەشنە ڕێ و ڕچەی ئێزیدی ڕەنگ و بۆنی ئیسلامیی گرتە خۆی.

ئێزیدییەکان ساڵی دووسەد و حەفتا و شەشی زاینی بەسەرەتای مێژووی خۆیان دادەنێن، لەم مێژووەشدا مانی (٢١٠- ٢٧٦ی زاینی) کوژراوە و لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەمانە لەسەر ڕێ و ڕەوشت و ئاینی مانی دەڕۆن.

یەکێ لە خۆرهەڵات ناسان بەناوی ئسپیرۆ دەڵێ: ڕێبازی ئێزیدی دەچێتە سەر ئاینی مانی و لەگەڵ ئەوەشدا ئاینەکانی زەردەشتی و مەزدەکی و فەلە و ئیسلامیش کاریان کردووەتە سەر ئاینەکەیان.

پرۆفیسۆر مینۆرسکی لە پەڕاوی کوردا، سەبارەت بەئێزیدییەکان دەڵێ: ڕێبازی ئێزیدی لەسەر ڕێ و ڕەوشتێکی زۆر کۆنەوە داڕێژراوە و ماوەیەک لەمەوپێش ئێمە هیچ چەشنە زانیارییەکمان لەبارەی ئێزیدییەکانەوە نەبوو هەتا یەکێ لە خۆرهەڵاتناسەکانی ئینگلیزی بەناوی ئۆپاری توانیی یەکێ لە پەڕتووکەکانی ئێزیدی بخاتە دەست و بڵاوی کاتەوە ناوەڕۆکی ئەو پەڕاوە بریتییە لە دوو نامیلکەی گچکە بەناوی جیلوە و مەسحەفاڕەش و پاشان ئاستاش ماری، کە قەشەیەکی کاتۆلیکە، ئەو دوو نامیلکەی بەعەرەبی و کوردی بڵاو کردەوە.

هەندێ لە موسوڵمانەکان، ئێزیدییەکان بەشەیتان پەرست دادەنێن، بەڵام ئێزیدییەکان خۆیان بەخوا پەرست و ئێزیدی دەزانن، ئەوان پەرستگایەکی تایبەتییان بۆخۆیان هەیە و پەرستگاکەیان دێرێکی کۆنی فەلەکانەکە لە لاشە لە نزیکی شاری مووسڵدایە و شێخ ئادیش هەر لەوێدا بەخاک سپێرراوە.

تاوس یا مەلیک تاوس لەناو ئێزیدییەکاندا زۆر پیرۆزە و هەندێ لە نووسەران لایان وایە کە لە نێوان تاوس و تەمموزدا کە بابلییەکان بەخوای هەتاویان دائەنا پەیوەندیەکی پتەو هەیە و هەروەها بڕوایان لەسەر ئەوەیە کە پەیوەندی گەلێکی تر لە نێوان ئێزیدییەکان و ئوورییەکان و ئایینەکانی کۆنی دووزێدا هەیە.

لە ڕێ و ڕچەی ئێزیدی گەلێ مەبەست وەکو ئەهریمەن و تاریکی و ڕوونی هەیە و هەندێ لە مێژوونووسان لایان وایە کە پیاوێک بەناوی شێخ ئادی لە سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچیدا ڕێ و ڕچەی ئێزیدیی بەدی هێناوە و تەیموور پاشا لە پەڕتووکی ئێزیدی و مەڵبەندەکەیاندا دەڵێ:

ئەم تاقمە لە مێژوودا ناوێکیان بۆ یەکەمین جار لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا لە لاپەڕەکانی مێژوودا نووسراوە و ئەوەیش بەهۆی شێخ ئادیی هەکارییەوەیە کە گەلێک لایەنگری پەیدا کردووە و پەرەی داوەتە ڕێ و ڕچەی ئێزیدی.

بەڵام ئەم قسانە دروست نین چونکە سەمعانی کە لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا، دەژیا لە پەڕاوی ڕەچەڵەکدا دەڵێ: تاقمێکی زۆرم لە حەلوانی عێراقدا چاو پێ کەوت کە بەناوی ئێزیدی دەژیان و ئەمانە خەریکی ڕێ و ڕەوشتەکەی خۆیان بوون.

پرۆفیسۆر تۆفیق وەهبی لای وایە کە ڕێ و ڕچەی ئێزیدی پاشماوەی خۆرپەرستی یا مێهر پەرستییە و دەڵێ: ئێزیدییەکان ئەهریمەن ناپەرستن، بەڵکو ئەوان ئێزەد دەپەرستن و مەلیک تاوسیش بەفریشتەی پەیامهێنەری خوا دادەنێن و ئەمانە بەحەوت فریشتەی تر بڕوایان هەیە کە لەگەڵ حەوت خوایانی میترایدا یەکسانن و تاوس سەرۆکایەتیی فریشتەکانی بەئەستۆیە و لەگەڵ میترای خوای خۆردا هاوتایە.

ڕازی ڕێ و ڕچەی ئێزیدی کە لە سەرەتای ئیسلامدا لە سینگی هەندێ لە پێشەوایانی ئێزیدیدا پارێزرابوو، سینگ بەسینگ دەهاتە خوارەوە تا ئێزیدییەکان بەپێی ئەو ڕێ و ڕەوشتانە ڕەفتارکەن و شێخ ئادی لە سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچیدا ئەو ڕازەی بەچەشنی یاسا دەرهێنا و بەیارەکانی خۆی ڕای گەیاند بۆیە ئێزیدییەکان ئەو بەپیاوێکی گەورە دادەنێن و پێڕەوی لێوە دەکەن.

لەناو ئێزیدییەکاندا ڕۆژێ چوار جار نوێژ دەکەن کە بریتییە لە نوێژی بەیانی، نوێژی نیوەڕۆ، نوێژی ئێوارە، نوێژی خۆرئاوا جگە لەمە هەر ئێزیدییەک دەبێ لەکاتی هەتاوا لەبەر بەرۆچکەدا ڕاوەستێ و زەوی ماچ کاتەوە و خۆی بماڵێتە خاک و خۆڵا و لە خوا بپاڕێتەوە و نزا بکا و بەم نزایە نزای خۆر دەڵێن. کەوابوو ئێزیدییەکان لە هەر شەو و ڕۆژێکدا شەش جار نوێژ دەکەن و لە کاتی نوێژکردندا ڕوو دەکەنە هەتاو و لەسەر ئەم بڕوایەن کە هەمووی

ڕۆشنایی جیهان لە خۆرەوەیە و خۆر بریتییە لە ڕۆشنایی و تیشکی خوایی کە ئەم بڕوایەش بڕوایەکی زۆر کۆنی ئارییەکانە. ئێزیدییەکان چەندین بەرگ پەڕتووک و نامیلکەی ئاینییان هەیە کە هەموویان بەخەتێکی تایبەت کە لە خەتی سانسکریت و ئاوێستایی و پەهلەوییەوە وەرگیراوە نووسراوە و ئەم خەتە بەخەتی ئێزیدی ناسراوە. ئەم ئێزیدییانە گەلێ ڕاژە و خزمەتیان بە زمان و وێژەی کوردی کردووە و ئەو نووسراوانەی کە لەلایان بەیادگار ماونەتەوە بریتیین لە: جیلوە، مەسحەفارەش، قەوڵی تاوس مەلەک، قەوڵی زەبوونی مەیسوور، قەولێ ئافرینا دونیایی، قەوڵی شیری ڕاستی، قەوڵی هەسەدی ئال تەوری، قەوڵی قیامەتی، قەوڵی مسکین و هەژار، قەوڵی پیر شەرەف، قەوڵی دەروێش ئادەم و میر براهیم، قەولێ شێشمی تەورێزی، بەیتاجندی، بەیتا نەسیحەتا، دوعا سبەیکێ، دوعایا هێڤارێ.

سەرچاوەکان

١- یەزیدییەکان و ئاینی یەزیدی- نووسینی شاکر فتاح ١٩٦٩.

٢- ئێزدیاتی لبەر ڕۆشناییا هندەک تیکستێد ئاینین ئێزیدییان نووسینی خدری سلێمان- بەغدا ١٩٧٩.

٣- نڤیژین ئێزیدیان- شام ١٩٣٣.

٤- ایزدیان نوشته صدیق صفی زاده (بۆرەکەیی) تهران ١٣٥٨.

# کورد و فەلسەفە

بێ گومان لە کوردستاندا پیتۆڵی و فەلسەفە هەر لە مێژەوە باوبووە و گەلێ پیتۆڵیش لەناو کوردا پەیدابوون و سەرچاوەی فەلسەفەش لەناو کوردەواریدا لەسەر هەستێکی زانستییەوە سەری هەڵداوە و ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەشتەمی کۆچی کە سان سەهاکی بەرزنجی و یارە زاناکانی لە هەوراماندا سەریان هەڵدا.

پێڕەوان و یارەکانی سان سەهاک زۆربەیان پیتۆڵ و زانا و هۆزان و هۆنەر بوون و هەر کام لە وڵاتێکەوە هاتبوونە لای و لە زانستی ئەو کەڵک و سوودیان وەردەگرت و تەنانەت لە فەلسەفەی وێنان شارەزاییان هەبوو بۆیە قسەکانیان کاری دەکردە دڵی خەڵک.

دەگێڕنەوە و دەڵێن کە کاتێ سان سەهاک لە ماڵ دەهاتە دەرەوە، خەڵک دەورەیان دەدا و لە دەوری کۆدەبوونەوە و هەر کام پرسیارێکیان لێ دەکرد و ئەویش بەنەرمی وەڵامی دەدانەوە و تەنانەت دەڵێن گەلێ بەربەرەکانێیان لەگەڵیدا دەکرد و ئەویش هیچ قەڵس نەدەبوو، و بەڵکو لەسەر قسەکەی دەڕۆیشت تا قسەکەی دەسەلماند و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەموو خۆشیان بوێ و قسەی لێ ببیسن.

هەر بەپێی ئەم قسانە دەتوانین سان سەهاک بەیەکێ لە پیتۆڵان و هۆزانانی هەرە بەرزی کورد دابنێین، چونکە ئەو لە یەکێ لە پارچە هەڵبەستەکانیدا دەڵێ: ئاو باوکی سروشتە و هەموو شتێک لە ئاوەوە دێتە دی و ئاویش دیارە خوا بەدیی هێناوە کە سەرچاوەی هەموو شتێک لە ئاوەوەیە. وەکو دەڵێ:

با بۆی سرشتەن، بابۆی سرشتەن
ئەی یاران ئاوی بابۆی سرشتەن
ئی ئاوە پەیمان خاوەندکار ڕشتەن
پەوکە ڕۆشنەن چوون وە ورشتەن

واتە: ئەی یاران ئاو باوکی سروشتە! ئەم ئاوە خوای مەزن بۆمانی بەدی هێناوە، بۆیە ڕووناکە؛ چونکە سەرچاوەی هەموو شتێکە و هەموو شتێک لە ئەوەوە هاتووەتە دی و هەموو شتێک دەگەڕێتەوە بۆ ئەو.

ئەوەی کە دەڵێ: ئاو باوکی سروشتە و هەموو شتێک لە ئاوەوە هاتووەتە دی و هەموو

شتێک دەگەڕێتەوە بۆ ئاو، ئەمە قسەی تالسی یۆنانییە. تالس لە ساڵەکانی ٥٤٧ تا ٦٢٤ی زاینیدا دەژیا و ئەو لە شاری ملیتدا لەدایک بووە بۆیە بەناوی تالسی ملیتی ناسراوە. تالس دەیوت کە ئاو باوکی سروشتە و هەموو شتێک دەگەڕێتەوە بۆ سروشت و هەروەها دەیوت جیهان پڕ لە خوایە و هەموو دەبێ ڕوو لە خوا کەن. عەباس مەحموود عەقاد، نووسەر و پیتۆڵی میسری کە بەنەژاد کوردە دەڵێ: تالس بەباوکی پیتۆڵان دێتە ژمارە ئەوەی کە ئەو ئاوی بەباوکی سروشت داناوە ئەمە دروستە، چونکە هەموو شتێک لە ئاوەوە هاتووەتەدی هەروەها کە خواش ئەفەرمووێ: (ومن الماء كل شيء حي). واتە: لە ئاوەوە هەموو شتێک زیندووە. هەروەها تالس دەیوت گیان ماک دێنێتە جووڵە کەوابوو هیچ بزوێنێک نییە کە گیانی نەبێ، ئاسن ڕفێن گیانی هەیەو بەهۆی گیانییەوە ئاسن دەڕفێنێ، وە هەر ئەوەیە کە کوردەکان ئاو لە پیسی دەپارێزن.

ئەرەستووش دەڵێ: تالس بۆیە هەموو شتێکی لە ئاوەوە داناوە، چونکە بەڕاستی هەموو شتێک لە ئاوەوە دێتە دی و ئەگەر ئاو نەبێ هیچ زیندەوەر و جانەوەر و مرۆێک لە ڕووی زەویدا زیندوو نامێنێ.

پیر مووسا کە یەکێ لە پیران و هۆنەرانی سەدەی هەشتەمی کۆچییە و لە ڕێ و ڕچەی یارییدا بەیەکێ لە فریشتەکان دێتە ژمار، لە پیتوڵی و فەلسەفەشدا دەستێکی باڵای هەبووە و لە یەکێ لە چارینەکانیدا دەڵێ: هەموو شتێک لە ماک و کەرەستەوە دێتە دی و ئاو و ئاور و خاک و با پاکن و لەبەرئەوەی بنەڕەتی ئێمە لە خاکەوەیە، سەرئەنجام دەبینە خاک، چونکە ئەو بۆ ئێمە سامان و داراییە و هەموو شتێکی ئێمە پەیوەندیی بەمانەوە هەیە، وەکو دەڵێ:

ئاو و ئاهیر و خاک و وا پاکەن
گرد چێ ئانە نە یەک ماتاکەن
هانا ئەی یاران چون گەوهەر خاکەن
ئانە پەرێمان چون هێر و ڕاکەن

واتە: ئاو و ئاور و خاک و با پاکن و هەموو شتێک هەر لە ماک و کەرەستەوەیە و هانا ئەی یاران! لەبەرئەوەی بنەڕەتمان خاکە، ئەو بۆ ئێمە سامان و داراییە.

لەناو پیتۆڵانی یۆنانیدا ئینکسیماندر کە لە سەدەی شەشەمی بەر لە زاینیدا ژیاوە، ئەم قسانەی کردووە و دەڵێ: هەموو شتێک دەگەڕێتەوە بۆ ماک و کەرەستە و هەموو شتێک لە ماک و کەرەستەوە بەدی هاتووە، بەڵام بەپێچەوانەی قسەکانی پیر مووسا ئەو ماکە ئاو یا خاک یا ئاگر یا با نییە، چونکە ئەگەر ئاو بنەڕەتی هەموو شتێک بووایە بەسەر هەموو

شتێکدا زاڵ دەبوو، خاک و با و ئاوریش هەر بەو چەشنەیە کەوا بوو ئەوانە دەگەڕێنەوە بۆ بنەڕەتێکی زۆر کۆن کە هیندییەکان و بابلییەکانیش هەر لەسەر ئەو بیروبڕوایە بوون و لایان وابوو هەموو شتێک لە کەرەستەیە و ئێستا ماتریالیستەکانیش هەر ئەو بیرە دەکەنەوە و لەسەر ئەو بیروبڕوایەن و ئەو لای وایە هەموو شتێک بەرە بەرە دەبێتە ماک و کەرەستە و هیچ کاتێ لەناوچوونی بۆ نییە و دوورنییە کە ئەم پیتۆڵە ئەم کەڵکەڵەیەی لە بابلییەکان وەرگرتبێ.

لە پەڕتووکی دامیاردا نووسراوە: ئەوەی کە لەم جیهانەدا دەبینرێ، بنج و بناوانی دەگەڕێتەوە بۆ جیهانێکی تر و خەڵکی ئەم جیهانە نوێنگەی جیهانێکی ترن و بەرەی مرۆ کە لەم جیهانەدا ژیان دەباتە سەر هەموو وەچە و ڕەچەڵەکی ئەو جیهانەن و پەیوەندییان بەجیهانێکی ترەوە هەیە و لەم جیهانەدا مێوانن و لەپاش ماوەیەکی کورت دیسان دەگەڕێتەوە بۆ مەڵبەندی بنەڕەتی خۆیان و ئەگەر لەم جیهانەدا کردەوەیان باش بێ لە پاش هەزار و یەک دوون نەمر دەبن. مرۆ کاتێ کە دێتە جیهانەوە، هەموو شتێک دەزانێ، بەڵام لەشی دەبێتە بەرهەڵستی و هیچی ناکەوێتە بیر و دەبێ دیسان ئەو شتانەی کە دەیەوێ فێری ببێ و کەڵکی لێ وەرگرێ.

ئەفلاتوونیش دەڵێ: ئەوەی کە لەم جیهانەدا دەبینرێ، بنەڕەتی لە جیهانێکی تردایە و خەڵکی ئەم جیهانە وەکو سێبەرێکی ئەو جیهانەن بۆ وێنە ئەوانەی کە لەم جیهانەدا دەژین هەموو پەیوەندییان بەجیهانێکی ترەوە هەیە و مرۆی ڕاستەقینە مرۆی ئەو جیهانەیە.

ئیبنی سینا دژی ئەم بیروڕایەیە، بەڵام شێخ شەهابەدینی سوورە بەردی لایەنگری ئەم بیروڕایەیە، چونکە ئیبنی سینا لە لایەنگرانی فەلسەفەی ئەرەستوو بووە و هەروەها گەلێ مەبەستی فەلسەفیی تریش لە سەرئەنجام هەیە کە پێویستی بەلێکۆڵینەوە و تۆژینەوەیە.

سەرچاوەکان

١- پەڕتووکی سەرئەنجام (دەستنووس)
٢- زولاڵ زولاڵ (دەستنووس)
٣- دەورەی پیر عالی (دەستنووس)
٤- دەفتەری ساوا (دەستنووس)
٥- دەورەی دامیار (دەستنووس)
٦- فلسفەء کهن یونان، نگارش فریدون کار- تهران ١٣٢٣.

## مۆسیقا و شایلۆغان لەناو کوردەواریدا

مۆسیقا و شایلۆغان لە ڕابردوودا لە ناو هۆزەکانی کورددا گەلێ برەوی هەبووە، بەپێی بەڵگەکانی مێژوویی مادەکان مۆسیقایان بۆ هەڵپەڕکێ و سەما بەکار دەبرد و ساسانییەکانیش پەرەیان دایە مۆسیقا و شایلۆغان، وە گەورەترین چاوێژ و ستران وانی دەوری خەسرەو پەروێز (٥٩٠- ٦٢٨ی زاینی) بارەبەد و نەکیساو بامشاد بوون کە وەکو دەڵێن هەرسێکیان لە وڵاتی مادا دەژیان و کوردبوون.

داهێنانی دەزتگاکانی مۆسیقا کە بەهۆی باربەدوە داهاتوون بریتیین لە حەوت خەسرەوانی و سی هەوا و سێ سەد و شەست ئاهەنگ کە لەگەڵ ڕۆژەکانی حەوتە و مانگ و ڕۆژەکانی ساڵی ساسانییەکاندا ڕێک دەکەوت و هەندێ لەم ئاهەنگانە وەکو: ڕقی ئێرەج و کینی سیاوەخش، پەیوەندییان بەڕووداوەکانی مێژووییەوە هەیە و برێکیشیان وەکو هەوای یەزدان ئافەرید دەچنەوە سەر مەبەستی ئاینی و هەندێ تریشی وەکو مەرگی شەودێز ئاهەنگی ئازیەتی و شیوەنە. یەکێ لە ئاوازەکانی کۆن ناوی ڕاست بووە و ئەم ئاوازە گوایە لە دەوری خەسرەو پەروێزی ساسانیدا هاتووەتەدی.

لەدوای پەرەسەندنی ئیسلام گەلێ مۆسیقازانی هەرە بەرز، وەکو موسیلمی کوڕی موحەرەز و ئیبراهیمی مووسڵی و مەنسووری زەلزەل و هەندێ تر لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا پەرەیان دایە مۆسیقا و تەنانەت گەلێک لە زانایانی ئیسلام وەکو یاقووبی کندی و فارابی و ئیبنی سینا لە بارەی مۆسیقاوە، نامیلکە و پەڕاویان نووسیوە و لە پەڕاوی گۆرانیی ئەبوو فەرەجی ئەسپەهانیدا گەلێ چیرۆک سەبارەت بەمۆسیقازانەکانی سەرەتای ئیسلام نووسراون.

مۆسیقای گەلەکان و نەتەوەکانی هەر وڵاتێک گرنگترین پشتیوانی مۆسیقای ئەو وڵاتەیە و، مۆسیقای ڕەسەنی هەر گەلێک سینگ بەسینگ و ڕەچەڵەک بەڕەچەڵەک و وەچ بەوەچ هاتووەتە خوارەوە و مۆسیقای کوردی تا ئەندازەیەک ڕەسەنی خۆی پاراستووە و گۆرانیگەلێکی کوردی لەگەڵ چۆنییەتیی ژیانی هۆنەرەکانی کوردا پەیوەندییان هەیە.

تەمەنی گۆرانیی کوردی وەکو تەمەنی هەر نەتەوەیەکی تر، هاوڕێ لەگەڵ تەمەنی مرۆدایە بۆیە دەست نیشانکردنی ساڵێکی دیاریکراو بۆ مێژووی سەرهەڵدان و لەدایکبوونی گۆرانی

کوردی کارێکی ئێجگار سەخت و دژوارە و لە ڕاستەقینەدا گۆرانی لە وشەی گۆرانەوە هاتووە کە ناوی خێڵێکی کوردی نێوان سنە و کرماشان و کرند و سەحنەیە کە پێڕەوی ڕێ و ڕچەی یارین و وێژە و فەرهەنگێکی تایبەتییان بۆ خۆیان هەیە و هەروەها مامۆستا تۆفیق وەهبیش لای وایە کە گۆرانی لە هۆزی گۆرانەوە هاتووە و ئەمانە گەلێک هۆنەر و هەستیاریان پێ گەیاندووە و هەموودەم حەزیان لە گۆرانی گوتن و مۆسیقای کوردی کردووە.

گۆرانەکان کە هەر لە مێژەوە لەسەر ڕێ و ڕچەی یاری یا کاکەیین، دیارە تەواوی نووسراوەکانیان بەزاراوەی گۆرانییە و هەموو ڕۆژێ بەهۆی لێدانی تەنبوورەوە هۆنراوەکان دەخوێننەوە و چێژیان لێ وەردەگرن و ئەمەش فەرمانێکی ئاینیەو هەر یاریەک دەبێ هەموو ڕۆژێ تەنبوور لێ بدا و سروودەکانی سەرئەنجام بەدەنگ بخوێنێتەوە تا شادمان بێ. کەواتە هەر یاریەک دەبێ سروودەکانی پەڕتووکی سەرئەنجام بەئاواز بخوێنێتەوە و لەگەڵیاندا تەنبوور لێ بدا و ئەم هاوکاری و تێکەڵ بوونەی نێوان ئاواز و هۆنراوەکانی سەرئەنجام کە ئامرازی تەنبوور هاوڕێی کارەکە دەکات بەهاویەشی هەردووکیان یاسا و بنچینەکانی گۆرانی ئەنجام دەدەن وای سەپاندووە کە کارەکەی خێڵی گۆران شەقڵێکی والای خەڵکی تری نزیک و دراوسێیەتیی خێڵی گۆران و دروست بکات تا ئەگەر ئەوانیش شتێکی وەک ئەمەی خێڵی گۆران بکەن وا هۆنراو و مۆسیقا تێکەڵ بکەن ئەوا هەر لەسەر پێودانی کارەکەی خێڵی گۆران بڵێن ئێمەش وەکو خێڵی گۆرانمان کردووە و لاسایی ئەوانمان کردووەتەوە کە دەبێت بەگۆرانی و لەمەوە وشەی گۆرانی لەناو کوردەواریدا باوبوو.

ئەمەش باشترین بەڵگەیە کە وشەی گۆرانی لە کردەوەی خێڵی گۆرانەوە پەیدابووە، چونکە ئەم وشە لەناو تەواوی کوردەکانی کوردستاندا بەکار دەبرێ. مێژووی سەرهەڵدانی گۆرانیی کوردی و هۆنراوی کوردی لەناو یارییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دووەمی کۆچی لەو سالانەی کە بالوولی ماهی (٠٠٠- ٢١٩ی کۆچی)

سەری هەڵدا و لەگەڵ یارەکانیدا ڕێ و ڕچەی یاری یا یارسانی بەدی هێناو لەپاشا ئەم ڕێ و ڕچەیە لە سەرتاسەری لوڕستان و کرماشاندا پەرەی سەند کە ئێستا گەلێ لە مەڵبەندەکانی کوردستان یارییەکانی تێدا دەژین وەکو: کرماشان، قەسری شیرین، سەرپێلی زەهاو، کرند، سەحنە، بێوەنێج، مایدەشت، هەلیلان، دلفان، پشتکۆ، هەوشار، شیشەوان، ئیلخچی، ماکۆ و گەلێ شوێنی تر.

مۆسیقا لەناو یارییەکاندا گەلێ پیرۆزە و لایەنگرانی ڕێ و ڕچەی یاری لە کاتی

کۆبوونەوەکانیاندا لە جەمخانە کە کۆگای ئاینیانە، سروودەکانی سەرئەنجام بەئاوازی تەنبوور دەخوێننەوە و تەنبوورەکەشیان لە لا زۆر پیرۆزە بۆیە هەموودەم ماچی دەکەنەوە و هونەری مۆسیقاش هەر لە مێژەوە لەناو یارییەکاندا باوبووە و پەرەی سەندووە و لە پەرتووکی سەرئەنجامدا نووسراوە کە ئەو کاتەی خوای مەزن ویستی مەشیە یا بابی مرۆ بخولقێنێ، گیان نەچووە بەریا بۆیە دوای چل ڕۆژ خوا بەپێمێرد یا سەر دەستەی فریشتەکانی فەرمان دا کە گیان بەبەر مەشیەدا بکات و ئەویش ئاوازی ڕاستیی بۆ گیانی مەشیە ژەند و بەو جۆرە گیان چووە لەشی مەشیەوە.

شا نیعمەتوڵلای موکریش کە یەکێکە لە ڕابەرانی ڕێ و ڕچەی یاری و لە سەدەی سێزدەیەمی کۆچیدا ژیاوە، سەبارەت بەگیان بەبەرداکرنی مەشیەو گێڕانەوەی چۆنییەتیی خوڵقاندنی مەشیە ئاماژە دەکات و دەڵێت چونکە لەشی گڵینی مەشیە گیانی تیا نەبوو، فریشتەکانی حەوتەوانە تکایان لە خوا کرد کە گیان بە بەریا بکات و خواش فەرمانی پێ دان کە گیان بە بەریدا بکەن، بەڵام گیان ڕازی نەبوو بچێتە ئەو لەشە گڵینەوە و ناچار فریشتەکان گەڕانەوە لای خوا و تکایان لێ کرد چارەیەک بدۆزێتەوە و ئەویش فەرمووی بچن مۆسیقا بژەنن تا گیان ڕووی خۆش پیشان بدات و بچێتە قاڵبی مەشیەوە، فریشتەکان ڕۆیشتن و مۆسیقایان بۆ گیان ژەند و گیانیش دەستبەجێ چووە لەشی مەشیەوە و مەشیەش دەستی کردە سپاس و ستایشی خوای مەزن.

لە پەرتووکی دەورەی حەوتەوانەشدا کە بەشێکە لە پەرتووکی سەرئەنجام، هاتووە کە پێغەمبەرێکی ئاریایی لە سەردەمی پادشایەکی ستەمکارا دەرکەوتووە و خەڵکی بۆ یەکتا پەرستی بانگ کردووە، بەڵام خەڵک پەرجۆیان لێ ویستووە و ئەویش ئامێرێکی مۆسیقای دروست کردووە کە حەوت ئاوازی لێ داوە و بەهۆی ئەو ئاوازانەوە پۆل پۆل خەڵکی بەپیریەوە چوون و ئایینەکەیان پەسەندکردووە و پاشاش کە بەمەی زانیوە فەرمانی دەرکردووە ئەو پێغەمبەرە بگرن، بەڵام دەست و پێوەندانی کاتێ چوون بۆ گرتن و کوشتنی ئەو پێغەمبەرە گوێیان لە ئاوازەکانی بووە و ئایینەکەیان قەبوڵ کردووە و ئیتر پادشاش کە هەست دەکات جەماوەر و لەشکرەکەی دەچنە سەر ئایینەکەی ئەو پێغەمبەرە، ناچار ئەویش چاوی لەوان کردووە و ئەم ئامێرە مۆسیقایە ناوی چەکی ساز ژەن بووە.

دەگێڕنەوە و دەڵێن شا خوەشینی لوڕستانی و یارەکانی بەدەنگی خۆش و مۆسیقا ژەندنەوە ستایشی خوایان کردووە چونکە لە پەرتووکی دەورەی شاخوەشیندا واپیشان دراوە کە شاخوەشین لەسەردەمی لاویەتیدا هۆنراوی هۆنیوەتەوە و لە جەمخانەدا بەمۆسیقاوە بۆ یاران و پێڕەوانی خوێندوونەتەوە و ئەوانیش سروودەکانیان بۆ

سەندووەتەوە و جگە لەمەش فەرمانی دا کە لە سەراسەری جەمخانەکاندا تەنبوور لێ بدەن و سرووود بخوێننەوە و بەم چەشنە گیانی ئاڵۆز و شڵەژاویان ئارام کەنەوە.

هەروەها دەگێڕنەوە و دەڵێن کە شاخوەشینی لوڕستانی هەموودەم دەچووە کێو و شاخ و داخ و لێڕەوار و گوێی لە چریکە و جریوە و قاسپەی کەو و پەلەوەران دەگرت و کە دەهاتەوە لاسایی ئەو دەنگانەی دەکردەوە کە لە سروشتدا گوێی لێیان دەگرت و ئەوسا تەنبووری لێ دەدا و خەڵکی دەخستە سەما و هەڵپەڕکێ و بۆیە دەڵێن کە ئەو هەندێ لە هەواکانی تەنبووری داهێناوە و ئەو بەیەکێ لە تەنبوور لێدەرانی هەرە بەرزی دەوری خۆی دادەنێن و ئێستاش تەنبوورژەنەکان لاسایی ئەو دەکەنەوە.

سان سەهاکی بەرزنجی هەر خۆی تەنبووری لێ دەدا و لە جەمخانەدا بەئاوازی تەنبوور سرووودی دەخوێندەوە و وەکو دەڵێن ئەو گەلێ هەوای مۆسیقای کوردیی داناون و لە ڕاستەقینەدا هەر ئەو بوو کە تەنبوور لێدانی لە ناو یارییەکاندا پەرەپێ دا و خەڵکی هان دا سروودەکانی پەڕتووکی سەرئەنجام بەهەوای تەنبوورەوە بخوێننەوە و گۆرانی بچڕن و بەم چەشنە گەشە و پرشەی بەکۆڕە ئاینییەکان دەدا و شەقڵێکی تایبەتی بەجەمخانەکان دەبەخشی. عابدینی جافیش کە یەکێکە لە یاران و پێڕەوانی سان سەهاک، سەردەستەی تەنبوورژەنان بووە و لە تەنبوور ژەندندا شارەزایی و بەهرەیەکی زۆری هەبووە، بۆیە بەعابدین چاوێژ ناسراون بەجۆرێ کە پیر ناریی هەورامی ئەو بەنوێنگەی بارەبەد دەزانێ و هەروەها ئەحمەدی هەوراميیش لە تەنبوورژەنیدا بێ وێنە بووە بەنوێنگەی نەکیسا دادەنێ.

قاسد کە یەکێ لە هۆنەرانی سەدەی سێزدەمی کۆچییە لە هۆنراوەکانیدا ئاماژە دەکاتە سەمای مەشیە کە بەهۆی ئاوازی مۆسیقاوە بەرپا دەبێت و دەڵێت: لەو ڕۆژەدا کە ئەو سەمایە بەرپا دەبێت، سەراسەری جیهان دەبێتە چراخان و هەرچی خوڵام و فریشتەیە دەچنە دەشت و چیا، چونکە خواوەند لەو ڕۆژەدا بەنیازی خواردنەوە و بیستنی ئاوازی مۆسیقاوە ئامادە دەبێت و لەم ئاهەنگەدا بەشدار دەبێ و گوێ لە ئاوازی مۆسیقا دەگرێ و هەرخۆیشی ئاوازێک دەژەنێ کە ئەم ئاوازەی شا لە ئاسمانەوە بۆ زەوی دێتە خوارەوە و مەشیەش خۆی دێتە سەما و لەم کاتەدا شۆڕ و خرۆشێک لە دڵاندا پەیدا دەبێ، وەکو لەم هۆنراوانەدا دەڵێ:

مەبۆ چراغان، مەبۆ چراغان

سەراسەر جیهان مەبۆ چراغان

گردین غولامان مەلۆن نە داغان

ئەو ڕۆ شا مەیۆ پەرێ شایلۆغان

یاران شــام مــەیۆ، یاران شــام مــەیۆ
چەنی غــولامــان یاران شــام مــەیۆ
شــام پەرێ بەزم و پەی ئەخشــام مـەیۆ
نەوای شام پەی پەی سوب و شام مەیۆ
نـەوایـی مـــــەیۆ، نـەوایـی مـــــەیۆ
جـــە ئاســـمـــانەوە نەوایی مـــەیۆ
مـەشـیـەش هـەر مـەشـۆ هەوایی مـەیۆ
وە دەم ئـەو هـەوا ســـــەوایی مـــــەیۆ

واتە: سـەرتاسـەری جیـهان چراخـانی دەبێ و خـولامـەکان هەموویان لە کێو و بەندەنەوە دێنە ئەو شوێنە و ئەو ڕۆژە شا بۆ شـایلۆغان دێ. ئەی یاران خـولامەکان لەگەڵ شـادا دێن، دیارە شـام بۆ بیسـتنی مۆسـیـقا و شـایلۆغـان و دیتنی ئەو بەزمـە دێ، مژدە بێ کە نەوای شام پەیتا پەیتا لە بەیانی و شەودا لە ئاسمانەوە دێ و مەشیەش هـەر دەڕوا و ئاهـەنگێ دێ و بەدەم ئاهـەنگەوە جۆش و خرۆشێک لە دڵان پەیدا دەبێ.

ئەم پەیوەند و ئەوین و ئاوێتەبوونەی ئاینی یار و مۆسیقا سیمایەکی وای داوتە ئەم ئاینە کە دەبێ بڵێین فەلسەفەی ئەم ئاینە بـۆ مرۆ، بۆ گەردوون و بۆ کردگار، لەوە دایە کە هـەوێنی هەموو ئەوانە لـە مۆسـیـقادا دەبینێ و مـۆسیـقا لەلای یارییەکان هەوێنی هەموو گیانلەبەر و بێ گیانێکە و هـەوێنی گیانە و خـۆراک و هەناسەی گیانە و گیان بەبـێ مۆسیقا مـات و بێ جووڵە و گۆشەگیرە.

مۆسـیـقـا لەلای یارییـەکان تاقـانە سـروودی گیـان و بزووێنەری هـەسـتی مرۆڤـایەتییـە بەرامبەر بەچارەنووسی خۆی مرۆڤ لە هـەموو ڕاز و سکالا و داد و گازندەکانیدا و مۆسیقا دەکات بەسروود و پەیامی نێوان خۆی و کردگار.

مێـرگەلی جۆربەجـۆری مـۆسـیـقـا لە نووسـراوەکانی ئـاینی یاریدا نووسـراون و لە دیوانی هۆنەرانی یاریدا ناوی هـەندێ لەو ئامێـرانە براوە و سـازەکـان و ئامێرەکـانی مـۆسـیـقـا هـەر لەمـێـژەوە لەناو کـوردەکـانی یاریدا بـاوبووە ئەوانەش ئـەمـانـەن: دایرە، دەف، تـەپڵ، زوڕنا، شمشاڵ، تەموور، کەمانچە، شەیپوور، بەربەت، تار.

سەی یـاقووی مـایدەشتی کە یەکێ لە هۆنەرانی سەدەی سێزدەیەمی کۆچییـە لە یەکێ لە پارچە هەڵبەستەکانیدا ناوی هـەندێ لە ئامێرەکانی مۆسیقا وەکو: تار و تەنبوور و کەمانچە و بەربەت و تەپڵ و زوڕنا دەبا و ناوی هـەندێ گۆرانیبێژی وەکو: ئەمین و نازار و سلێمان و

سەی مامی هێناوە و لەمەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە مۆسیقا هەر لەمێژەوە لە ناو کوردەواریدا باوبووە و کوردەکان بەئاهەنگی مۆسیقاوە پێ گەیشتوون؛ بۆیە هەموو دەم حەز لە مۆسیقا و گۆرانی دەکەن.

بابە یادگاری سەرانەیی کە یەکێ لە ڕێبەرانی یارسانە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا، لە یەکێ لە پارچە هەڵبەستەکانیدا خۆی بەنوێنگەی بارەبەد و شا ئیبراهیمی ئامۆزای بەخەسرەو پەروێزی ساسانی دەچوێنێ و دەڵێ: ئەی یادگاری سەرمەست، کاتێ کە خەسرەو بارامی تێکشکان، بەفەرمانی خواجە و سەرۆکم، بارەبەد هات و بەربەتێکی لە دەستا بوو و، ئەوسا سی هەوای کوردیی بۆ ئەویندارانی لێ دا و من لەو بەزمەدا لە هەموو بەند و گیروگرفتێک ڕزگارم بوو، وەکو دەڵێ:

زولاڵ سەرمەست، زولاڵ سەرمەست
یادگارەنان زولاڵ سەرمەست
چاگا کە خەسرەو بارام دا شکەست
وە ربک و فەرمان خواجەکەی ئەلەست
بارەبەد ئاما بەربەتێ نە دەست
سی نەوای کوردی پەی دڵداران بەست
ئەز بارەبەد بیم نەو بەزمگای ئەلەست
کاکەم خەسرەو بێ نەگرد بەندێ ڕەست

خانای قوبادی (١٠٨٣ - ١١٦٨ی کۆچی) هۆنەری هەرە بەرزی کورد لە پەڕاوی خەسرەو شیرینەکەیدا ناوی سی هەواکەی بارەبەد بەم جۆرە ناو دەبا: عێراقی، حیجاز، گەنجی باهێنەر، گاگەنج، گەنجی سووتاو، شادروان مرواری، تەختی تاقدیس، زەنگی کلیسا، ئەوڕەنگی، حۆقەی تاوسی، مانگی بەرکێوان، موشکدانە، نیوەڕۆ، سەوز لە سەوز، سەوڵستان، کلیلی ڕۆمی، سەوڵی ڕاست، نۆشین بادە، موشکماڵی، غونچەی خاسە کەو، کینی سیاوەخش، ڕقی ئێرەج، ماهوور، باخی شیرین، نەورۆز، نەچیرەکان، ئەویندارا‌ن، گەورە شاناز، موشکۆ، مێهرەگانی.

هەر لە دەوری کۆنەوە مۆسیقای کوردی کاری کردووەتە سەر دراوسێکان و یەکێ لە مۆسیقازانەکانی کورد کە ناوی زریانە لە بنەماڵەیەکی کوردی مووسڵەوە، وەکو دەڵێن ئەو پەیمانگایەکی مۆسیقای دامەزراندووە و گەلێ لە گۆرانیبێژانی هان داوە کە گۆرانی بڵێن.

گۆرانی کە بریتییە لە چەند هەوایەک یا لە شێوەی مەقام دایە یا لە شێوەی بەستە.

مەقام لە حەوت هەوا پێک هاتووە کە ئەو حەوت هەواش لە شەش پلەی مۆسیقا دێتە ژمار و مەقام لە کوردیدا چەند جۆرە کە بریتین لە: نەورۆز، شاناز، مایە، ڕاست، زەنگۆڵە، نەوا، ئەویندارانن، گەورە، گەورە شاناز، کەو، ئای ئای، ئەڵڵاوەیسی، لاوک، لاوژە، نیوەشەو، بەرەبەیان، خوەرشی، خاوکەر، قەتار، کورد، شوور، هەوشار، ماهوور، نەهاوەند، چوارگا، پێنجگا، هۆرە.

قەتار کە یەکێ لە هەواکانی مەقامە، ڕەنگە پەیوەندیی بەگاتاکانی زەردەشتەوە بێ کە بریتییە لە سروودەکانی زەردەشت، هۆرەش ڕەنگە هەر ئەهوورامەزدا بێ، وەیا گۆرانییەکی ئاینی بێت و بۆ ستایش و ناسینی یەزدان چڕیبێتیان.

هۆرەش لە ناو کوردەواریدا چەندین جۆرە کە بریتین لە: هۆرەی پامووری و هۆرەی لوڕی چڕ، هۆرەی سوارانە، هۆرەی قەڵوەزی چڕ، هۆرەی قاچاقچی چڕ، هۆرەی دوو دەنگی، هۆرەی غەریبی چڕ، هۆرەی ئەکبەرخانی، هۆرەی کلاودڕ، هۆرەی یەک دەنگی، هۆرەی ئەرکەوازی چڕ، هۆرەی هەی سوار، هۆرەی عەزیز و تەکش.

هەڵپەڕکێش پەیوەندیی بەمۆسیقاوە هەیە و نموونەیەکی سەما و ئاوازی کوردەوارییە کە گرنگترین هەڵپەڕکێکەلێکی کوردی ئەمانەن: بازیانی، چەپی، دووپێیی، ڕاستی، هەڵخە، سێ کەوشە، لەملان و لەولان، لەنجەولار، ئایشۆکێ، بابلەکان، چۆک چەمینە، دووبارە، دیلان، هەورۆ، لەشکری، نەرمێ، هیرۆیی، میرانی، سۆرانی، سیسارکی، فەتاح پاشایی، ڕاستە، ڕۆینە، شەمرۆکە، خانم مەڕۆ، خانەمیری، سۆلەتکی.

سەرچاوەکان

١- گەنجینەی گۆرانی کوردی نووسراوی عوسمان شارباژێڕی - بەغدا ١٩٨٥.
٢- لێدوانێکی کورت لە مەقام و مۆسیقای کوردی نووسینی عوسمان شارباژێڕی - بەغدا ١٩٧٢.
٣- دەروازەیەک بۆ ئاواز و گۆرانی کوردی نووسراوی مەحموود زامدار - بەغدا ١٩٨٠.
٤- شاهنامه حقيقت سروده شاه نعمت الله جيحون آبادى به اهتمام دكتر محمد مكرى - تهران ١٩٦٦.
٥- برهان الحق تاليف نور على الهى - تهران ١٣٤٢.
٦- نوشتههاى پراكنده دربارهء يارسان - تاليف صديق صفى زاده - تهران ١٣٦١.
٧- خەسرەو و شیرینی خانای قوبادی - ساغکردنەوەی سدیق بۆرەکەیی - تاران ١٣٦٤.
٨- زولاڵ زولاڵ (دەستنووس).
٩- پەڕتووکی سەرئەنجام (دەستنووس).
١٠- دیوانی قاسد (دەستنووس).

# گەشتنامە

گەشتنامە بریتییە لە گەشتی ڕێبوارێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، وەیا لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر کە ڕێبوار ڕووداوە گرنگەکانی گەشتەکەی خۆی هەر لە سەرەتای گەشتەکەیەوە بەزمانێکی سادە دەنووسێ کە لەوەدا گەلێ باسی جوغرافیایی و مێژوویی و وێژەیی تێدا دەگونجێنێ و ڕەنگە لەو گەشتەیدا لەگەڵ گەلێ لە زانایان و هۆزانان و وێژەوانان و نووسەران و هونەراندا وتووێژ بکا کە ئەو وتووێژانەش لە گەشتنامەکەیدا بەوردی دەنووسێ، وە نرخی گەشتنامەیەک لە بیرەوەرییەک زیاترە، چونکە گەشتنامە گەلێ مەبەستی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و جوغرافیایی تیا دەنووسرێ کە ڕەنگە ئەو مەبەستانە لە هیچ نامیلکە و پەرتووکێکی تردا نەنووسرابێ.

کۆنترین گەشتنامەیەک کە سەبارەت بەکورد و کوردستان نووسراوە، گەشتنامەی (جووهان سچیل بەرگەر)ە کە لە ساڵی ١٤٧٣ی زاینیدا هاتووەتە کوردستان و نووسیویەتی و لە پاشا بڵاوی کردووەتەوە و ئەوسا ئەولیا چەلەبی لە ساڵی ١٦٣٠ی زاینی سەرێکی داوە لە جزیر و بۆتان و لە پاشا گەشتنامەکەی لە چاپ داوە و پاشان بەهۆی سەعید ناکامەوە وەرگێرڕاوەتە سەر زمانی کوردی و بڵاو بووەتەوە، هەروەها نیبوریش گەشتنامەیەکی هەیە کە لە ساڵی ١٧٦٦ی زاینیدا نووسیویە و بڵاوی کردووەتەوە و لە پاشا گەلێ گەشتنامەی تر سەبارەت بە کورد و کوردستان نووسراون کە لە بوارگەلی مێژوویی و جوغرافیایی و کۆمەڵایەتییەوە بۆ کورد گەلێ گرنگن.

نووسەرانی کوردیش لەم دواییەدا دەستیان داوەتە نووسینی گەشتنامەگەلێ مەبەستی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و وێژەیی و ڕامیارییان لە گەشتنامەکەیاندا نووسیوە کە ئەو گەشتنامانە بریتین لە: گوڵگەشتێک بەناوچەکانی کوردستاندا نووسراوی شەفیقە عەلی، گەشتێک بۆ هەڵەبجە و هەورامان نووسراوی شاکر فەتاح، گەشتێک لە کوردستاندا نووسینی عەلائەدین سەجادی، گەشتێک لە ئەورووپادا نووسینی مەحموود هەمەوەند.

ئەڵبەت چەند جۆر گەشتنامەمان هەیە کە هەندێ لەو گەشتنامانە سەبارەت بەحەج نووسراون و لەم گەشتانەدا نووسەر باسی گەشتەکەی خۆی بۆ حەج دەکات کە چۆن ڕێ و ڕەوشتی حەج ئەنجام دەدا و لەگەڵ حاجییەکاندا دەدوێ و لە ناو کوردەواریدا چەند

گەشتنامەیەک سەبارەت بەحەج نووسراون وەکو گەشتنامەی مەجدی و گەشتنامەی وەفایی و گەشتنامەی حاجی سەرتیپ.

گەشتنامەیێ بۆ گەشتنامەی لاساییە کە لەوەدا نووسراوە لە خەون و خەیاڵدا دەڕواتە جیهانێکی تر و دیتنەکانی خۆی وەها دەگێڕێتەوە کە دەڵێی گەشتێکی ئەنجام داوە کەچی گەشتێکیش لە نێواندا نییە. نووسەر لە ڕاستەقینەدا پەیام و قسەکەی خۆی لە قاڵبی چیرۆکدا بەشێوەی گەشتنامە دەگێڕێتەوە، وە یەکێ لەو گەشتنامانە کە بەزمانی پەهلەوی نووسراوە و پاشان تەرجەمە کراوەتە فارسی گەشتنامەی (ئەردا وێراف نامە)یە کە ئەرداوێراف یەکێ لە مووبەدەکانی زەردەشتی نووسیویە کە لەوەدا بەهەشت و دۆزەخ و چاکە و خراپە و تۆڵە و سزادانی پیشان داوە و (دانتە)ش لە ئەورووپادا گەشتنامەیەکی بەناوی بەهەشت و دۆزەخ نووسیوە کە گەلێ گرنگ و بایدارە.

گەشتنامەیەکی تر هەیە کە گەشتنامەی خەیاڵییە، وە نووسەر لەم گەشتنامەدا بیروڕای خۆی لە قاڵبی گەشتنامەدا دەردەبڕێ و لەوەدا سەبارەت بەگیروگرفتەکانی کۆمەڵ دەکەوێتە لێکۆڵینەوە و ڕەخنەگرتن لە سەرۆکان و بەڕێوەبەرانی وڵات و گەلێ مەبەستی کۆمەلایەتیی تیا دەگونجێنێ ، دەردی کۆمەڵ دەردەخا و دەرمانیشی بۆ دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی چارەسەر بکرێ، یەکێ لەم گەشتنامانە کە لە دەوری قاجارییەکاندا نووسراوە گەشتنامەی (ئیبراهیم بەگ)ە کە نووسراوی (زەینولعابدینی مەراغەیی)یە.

جا بۆ ئەوەی بۆمان دەرکەوێ کە گەشتنامە چۆن دەنووسرێ ئەوا بەشێک لە گەشتنامەکەی ئەولیا چەلەبیتان دەخەینە بەرچاو کە دەڵێ:

ئەو دە ڕۆژەی لای خان ماینەوە هەموو ڕۆژێ لە بەیانی تا ئێوارە گۆرانیبێژ و وشکەڕن و یاریکەران دەهاتن هونەرەکانی خۆیانیان پیشان دەدا و خەلاتیان لە پاشا و خان وەردەگرت و خان زۆر ڕێزی مەلایان و زانایان دەگرێ. ئەوانەی بەخۆیاندا ڕادەپەرموون لە ولاتانەوە دێنە بتلیس و خان دەیاندوێنێ، ئەگەر بۆی دەرکەوێ کە بەڕاستی زانا و خوێندەوارن خانوو و ماڵ و باخچە و کەنیز و خەلاتیان دەداتێ و لای خۆی جێگایان دەکاتەوە، هەر لەبەرئەوەشە شێوی بتلیس بووەتە مەڵبەندی هەموو جۆرە زانین و هونەرێک و هەرکەس شتێکی مەبەست بێ یا گیروگرفتێکی بێ لە بتلیس ڕێگای چارەی خۆی دەدۆزێتەوە.

خیاوانی خانی پایەبەرز: ئەم باخە تیرهاوێژێک لەولای سەرای خانەوەیە و ئەوەندە جێگایەکی خۆشە کەس ناتوانێ تاریفی بکا. دار مێوەکانی بەریزی هەندەسەیی چەقاون و بەدەم باوە دەهەژێن و بەملاو بەولادا لار دەبنەوە، تەنیا دارخورما و چەمبز و مۆزی تێدا نییە، دەنا هەر جۆرە دارێک ببێ لێرەدا هەیە، لە ناو ئەم باخەدا چەند کۆشکێک کراوە،

هەریەکەی خەزێنەیەکی تێ خەرج کراوە، ئەوەندەش بەوەستایانە کراون کە هیچ کۆشکێکیان لەوی دی ناچێ، ئەو حەوز و فیچقانەی لێرە بەرچاو دەکەون لە وڵاتی ڕۆمدا هاوتایان نییە لە قەراخی حەوزەکان وردە چەو و خیزی ڕەنگاوڕەنگ بەنەخش ڕۆکراوە، دەڵێی سەدەفکاری هیندستانە، لە ناوەڕاستی ئەو حەوزانەدا باوەشێک ئاو لە دەمی شێر و لە لووتی دێو و لە زاری هەژدیها دەڕژێتە ناو حەوزەکانەوە، هەندێ لە فیچقەکان بەتەوژم ئاو هەڵدەداتە بەرەو ژوور و هەندێک کونی زۆری لێ کراوە وەک ئاوپرژێن لە چل پەنجا کونەوە داوی ئاو وەکو تاڵی قژی نازداران پەرێشان دەبێ، هەندێکیان سەر قاپی بۆ کراوە و چەرخێکیان لێ بەستووە ئاو بەر چەرخەکە دەکەوێ و دەیخولێنێتەوە. پلووسکی وا هەیە ئاوێکی باریکی لێ دێتە خوار و بەر کاسەیەکی پەل دەکەوێ دەنگێکی نەرمی بەسۆز بلاو دەکاتەوە، پلووسکێکی دیکە لە چەند تاسێک دەدا و لەو سەرەوە بەشێوەی باران هەڵدەڕژێ، هەندێ لە فیچقەکان تۆپێکی ناو هلۆلیان خراوەتە سەر کە بەهێزی ئاوەکە بەرزونزم دەبێتەوە ناشکەوێ.

لەم باخەدا هەموو جۆرە گوڵی تەڕ و سومبل و ڕێحان و وەنەوشەو ئەرخەوان و زینوومله وشتر کافوور میلاقە و میسکی ڕۆمی و مێخەک و زەمبەق و سویسن و نێرگز و بخووری مەریەم و یاسەمەن و گوڵاڵە و گوڵی هێرۆ و گەلێکی تر هەن کە ئەو ئاوەیان پڕ کردووە لە بۆنی خۆش. بۆ میوەجاتیش باخەوانی لە ئیسفەهان و تەوریز و نەخچەوان ڕاهێناوە و ئەم باخەی بەجۆرێک پێ ڕازاندوونەوە کە وەختی سوڵتان مرادی چوارەم هاتووە و چاوی پێ کەوتووە لە سەرسوورمان دەمی داچەقاندووە.

سەرچاوەکان

١- سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی وەرگێڕاوی سەعید ناکام - مەهاباد ١٩٨٤.
٢- گولگەشتێک بەناوچەکانی کوردستاندا نووسینی شەفیقە عەلی - سلێمانی ١٩٨٤.
٣- گەشتێک بۆ هەڵەبجە و هەورامان نووسراوی شاکر فەتاح - سلێمانی ١٩٧٣.
٤- گەشتێک لە ئەوروپادا نووسینی عەلائەدین سەجادی - بەغدا ١٩٥٦.
٥- گەشتێک لە کوردستاندا نووسینی مەحموود هەمەوەند - سلێمانی ١٩٥٧.

# ژیننامە

ژیننامە بریتییە لە بەسەرهاتی ژیانی مرۆێک و لە ڕاستەقینەدا ژیننامەی هەر کەس چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە کە باسی چۆنییەتیی ژیانی دەکا و خۆی دەبێتە قارەمانی چیرۆکەکەی. لە چۆنییەتیی ژیانی هەندێ لە پیاوە گەورەکانی وێژە و زانستی کوردی وەکو: بالوولی ماهی و شاخوەشینی لوڕستانی و سان سەهاکی بەرزنجی و پیر شالیار و مەولەوی و نالی و سالم و وەفایی و کوردی و حەریق و حاجی قادری کۆیی زانیارییەکی دروستمان لە دەستدا نییە، چونکە کەسێک نەبووە کە چۆنییەتیی ژیانی ئەو زانا و هۆنەرانەمان بۆ بنووسێ و، ئەگەر یاداشتی کاکەردایی و یاداشتی قرندی و یاداشتی ئەعلادین و پەڕتووکە ئاینییەکانی تری یاری و ئێزیدیمان بەدەستەوە نەبووایەن، ئێستا هیچ چەشنە زانیارییمان سەبارەت بەهۆنەرانی یاری و ئێزیدی نەبوو، ئێستاکەش لە بارەی هەندێ هۆنەرانمانەوە جگە لە دیاردە و ئاماژەیەکی کورت شتێکمان بەدەستەوە نییە بۆ وێنە ئەگەر لە پەڕتووکی دەورەی بالوول و دەورەی بابە سەرهەنگ و دەورەی شاخوەشین و دەورەی بابەناووس بەکورتەی ژیانی هۆنەرانی سەدەی دووەم تا پێنجەمی کۆچی دیاردەیان نەکردایە و هۆنراوەکانیان نەهێنابایە، بێ گومان ئێمە شتێکی ترمان بەدەستەوە نەبوو و، هیچێکمان لە چۆنییەتیی ژیانی ئەو هۆنەرانە نەدەزانی و ئەمڕۆ ئیتر نەماندەتوانی چۆنییەتیی ژیان و بەسەرهاتی ئەوان لە ئەم پەڕاوەدا کە مێژووی وێژەی کوردییە بنووسین و بیخوێنینەوە.

گرنگایەتیی ژیننامە لە باری ڕوونکردنەوەی مێژووی وێژە و فەرهەنگی هەر گەل و نەتەوەیەک زۆر ئاشکرایە. سەبارەت بەهۆنەرانی هاوچەرخمان هیچ چەشنە گیروگرفتێکمان نییە، چونکە زۆربەیان بەسەرهاتی خۆیان لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا نووسیوە و دەتوانین کەڵک و سوودیان لێ وەرگرین.

تەنانەت هەندێ لە هۆنەران و نووسەران خۆیان بەسەرهات و سەرگوروشتەی ژیانیان لە منداڵییەوە تا هەنووکە دەنووسن کە بەم چەشنە ژیننامەیە ئەوتۆبیۆگرافی دەڵێن. بەداخەوە لەناو کوردەواریدا سەبارەت بەبەسەرهاتی هۆنەران و نووسەران کەمتر پەڕاو نووسراوە و تەنیا لەم دواییەدا هەندێ لە نووسەرانمان کەوتنە هەوڵ و تێکۆشان و هەندێ نووسراوی

بەکەڵکیان سەبارەت بەهۆنەرانی هاوچەرخی خۆیان نووسی کە لەناو ئەو نووسراوانەدا دەتوانین لە: ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد، نووسینی ئەمین فەیزی بەگ و ناودارانی کورد نووسراوی ئەمین زەکی بەگ و شیعر و ئەدەبیاتی کوردی دانراوی ڕەفیق حیلمی و کۆیە و شاعیرانی نووسراوی کەریم شارەزا و مێژووی ئەدەبی کوردی نووسینی عەلائەدین سەجادی و تاریخا ئەدەبیات کوردی نووسینی قەناتی کوردۆ و چەند شاعیرەک دهەرێما بەهدینان، نووسینی نافع ئاکرەیی ناو ببەین کە ئەو پەڕتووکانەیان سەبارەت بەسەرگوروشتە و بەسەرهاتی هۆنەرانی کورد نووسیوە و دیارە لەسەری گەلێ ئەرکیان کێشاوە و ماندووبوون.

مەبەستێ تر کە دەبێ بیڵێم ئەوەیە کە هەموو گەل و نەتەوەیەک زانستنامە یا دایرەتولمعارفیان هەیە کەچی تا ئێستا کەسێک پەیدا نەبووە زانستنامەیەکمان لە ڕووی بەڵگەکانی چاپی و دەستنووسەوە بۆ بنووسێ و بەجۆرێ کە داگری ژیانی تەواوی هۆنەران و نووسەران و وێژەوانان و زانایان و پیتۆڵان و پزیشکان و فەرمانڕەوایان و پادشایان و باسی شارەکان و شوێنەوارەکانی مێژوویی کوردستان بێ تا هەموو کەسێک کەڵک و سوودی لێ وەرگرێ و بۆ ئەم کارەش دەبێ لە هەموو چەشنە نووسراوێک کەڵک وەرگرن و تەنانەت دەتوانن لە بەردە نووسراوەکانی ئاشووری و بابلی و هەخامەنشیش کەڵک و سوود وەرگرن؛ چونکە ئێمە گەلێ مەبەستی مێژووییمان لەو بەردە نووسراوانەدا هەیە کە پێویستیان بەلێکۆڵینەوەیەکی وردە.

سەرچاوەکان

١- آئین نگارش نوشتهء دکتر نادر وزین پور - تهران ١٣٥١.
٢- گزارش نویسی نوشتهء دکتر حبیب تیرا - تهران ١٣٤٢.

# هۆنراوی نوێ

هۆنراو پەیوەندیی بەژیانی مرۆڤەوە هەیە، پەیوەندیی بەخۆشەویستی و حەپەسانی بنیادەمەوەیە و پەیوەندیی بەهەست و خوست و جوولانەوە و بزووتنەوەی مرۆڤەوە هەیە، ژیانی مرۆ هەوراز و نشێوی هەیە، خۆشی و ناخۆشیی هەیە، بزووتنەوە و بێ دەنگی هەیە، وە ئەمە هۆنراوە کە کارەساتەکان و ڕووداوەکانی ژیانی مرۆ دەردەخا و دەینوێنێ.

هۆنراو ئالا هەڵگری بیر و هەست و خوست و ئاواتەکانی مرۆیە، هۆنراو پەژارەکانی مرۆی تێدا دەردەکەوێ، هۆنراو ئەزموون و تاقیکردنەوەی ژیانی مرۆیە، هۆنراو برسیەتی و هەژاری و بەدبەختی و کڵۆڵی و چەرمەسەرێ و مەرگ و کوشتن و بڕینی مرۆیە، بەتایبەت مرۆی سەربەست و ئازاد بۆ خەڵک دەردەخا، وە هۆنەریش کە لەناو شەپۆڵی دەریای ئەم کارەساتانەدا مەلەوانی دەکا، حەز لە ژیان دەکا و ڕووداوەکانی ژیان بۆ خەڵک دەگێڕێتەوە و، لە ناو کارەساتەکانەدا دەسووتێ و لە پاشا سەرهەڵدەدا و بیروڕای خۆی سەبارەت بەباری ژیان دەردەبڕێ.

هۆنەر دەبێ سەرەتا نەتەوەکەی بناسێ و هەست هەموو ئاخوداخێکی گەلەکەی بکا و شارەزاییەکی تەواوی لە مێژووی گەل و نیشتمانەکەی بێ و خۆی بەیەکێ لە ئەندامانی نەتەوەکەی بزانێ، هەستی خۆی سەبارەت بەباری ژیانی گەلەکەی دەربڕێ و نابێ لە ئاو و ئاگر بترسێ، چونکە ترس دەبێتە هۆی ئەوە کە نەتوانێ بیری تەواوی دەرببڕێ.

هۆنەر دەبێ لە هەموو بەشەکانی هونەری هۆنراو تێ بگات و وەکو مێشە هەنگوێن و هەنگ، شیرەی گوڵاڵەکان و گوڵەکانی ژیان بمژێت و ئەوسا کۆی بکاتەوە بۆ ئەوەی خەڵک کەڵک و سوودی لێ وەربگرن، چونکە ژیان بۆ هەمووانە و هەموو کەسێک دەبێ وەکو یەک لە ژیان بەشداری کەن و هۆنەر بەرپرسیاری خەڵکە و کەواتە هەر ئەوە کە دەبێ ڕێ بەخەڵک پیشان بدا و هەر ئەوە کە دەبێ ئاخوداخی خەڵک لە هۆنراوەکانیدا دەرببڕێ، هەر ئەوە کە کارەساتەکانی ژیان دەخاتە ڕوو و وەکو وێنەگرێکی لێهاتوو وێنەی ئەو کارەساتانە دەکێشێ بۆ ئەوەی هەتا هەتایە بمێننەوە و چینەکانی دواییش کەڵک و سوودیان لێ وەربگرن و ببنە درۆشمی ژیانیان.

چ هۆنەرێک دەتوانێ لە بەرابەر ڕووداوەکانی ژیاندا بێ دەنگ دانیشێ؟ چ هۆنەرێک دەتوانێ لە بەرابەر کارەساتی هیرۆشیما و هەڵەبجەدا بێ دەنگ بێ، هەستی دەرنەبڕێ؟ چ

هۆنەرێک دەتوانێ لە بەرابەر ستەم و زۆری ستەمکاراندا بێ دەنگ بێ و کڵۆڵی و کەساسی و هەژاریی نەتەوەیی لە هۆنراوەکانیدا دەرنەبڕێ؟

هۆنراو دەبێ جوان و شیرین بێ و بەوشەی ساکاری کوردی ڕازابێتەوە بۆ ئەوەی هەموو کەسێک لێی تێ بگا. هۆنراو دەبێ پەیامێک بۆ گەل بێ و، دڵی خەڵک بەرەو خۆی ڕاکێشێ و کار بکاتە سەر هەست و خوستی خەڵک و خەڵک بۆ ژیانێکی باش وریاکاتەوە، وە مزگێنی داهاتوو و ژیانێکی خۆش بەخەڵک بدا و هۆنەر دەبێ لە هۆنراوەکانیدا هەست و خوست و خورپە و تاسە و هیوای دڵی دەرببڕی و لەم ڕێگەوە پەیوەندییەکی بەتین لەگەڵ گەلەکەیدا ببەستێ.

بێ گومان هۆنراو بەهۆی برینەکانی کۆمەڵەوە کەوتووەتە سەر زاری هۆنەر و هۆنەر لە ڕێی بوومەلەرزەی ژیانەوە هەستی کەوتووەتە بزووتن و بەڵام هەر هۆنەرێک بەجۆرێک کارەساتەکانی ژیانی دەربڕیوە و لە ڕاستەقینەدا بیری تەواوی ئەو هۆنەرانە دەڕژێتە ناو جۆگە و ڕووبارێکەوە.

هۆنەر کاتێ بەهۆنەرێکی لێهاتوو دێتە ئەژمار کە بتوانێ تاقیکراوەکانی ژیانی و ئەزموونی مرۆڤایەتی بخاتە ڕوو و بەجۆرێ هەستی خۆی لەم بارەوە دەرببڕێ کە کار بکاتە سەر هەست و خوستی هەموو کەسێک و دڵی هەموو کەسێک بەرەو خۆی ڕابکێشێ، دیارە خۆشەویستیش بەرامبەر بەگەل و کۆمەڵ لە ڕێی درۆ و دەلەسەوە دەست نادا، کەواتە هۆنراو دەبێ دەنگدانەوەی ژیان بێ و جووڵانەوە و بزووتنەوەیەکی هەمیشەیی بێ بەجۆرێ کە بتوانێ پەیوەندیی خۆی لەگەڵ کۆمەڵدا پتەو بکات، پەیوەندییەک کە خەڵک بخاتە سەرڕێی گۆڕان، بزووتنەوە، تێکۆشان، هەوڵدان.

هۆنەرانی ئەم چەرخە بەپێچەوانەی هۆنەرانی کلاسیک تەوقی لاساییکردنەوەیان شکاندووە و لە لاساییکردنەوە خۆیان لاداوە و گیرۆدەی داوی عەرووز و پێبەندی کێش و پاشڵ نەبوون، ڕێگایەکی وایان لە هۆنراو داناوە کە بوێژ و هۆنەرە تازە پێگەیشتووەکانمان دەبێ لاساییان بکەنەوە، هۆنەرانی کۆنمان هەر کام لاسایی یەکتریان کردووەتەوە و پێڕەویی یەکتر بوون، کەچی هۆنەرانی ئێستا ناوەڕۆکیان مەبەستە نەک سەروا و پاشڵ، وە لە ڕاستەقینەدا سەروا و پاشڵیان ملکەچی خۆیان کردووە.

هۆنەرانی ئەم چەرخە بە ئەم و ئەودا هەڵنالێن و ستایشی کەس ناکەن، بەڵکو مەبەستیان کۆمەڵە بۆ ئەوەی دەردی کۆمەڵەکەیان چارەسەرکەن، لە باری کۆمەڵ و گیروگرفتەکانی خەڵکەوە دواون و گیروگرفتەکانیان خستووەتە ڕوو و خەڵکیان ئاگەدار کردووە.

لە ڕاستەقینەشدا هۆنراو بۆ ئەوەیە کە خەڵکی پێ وریا بێتەوە، هۆنراو خورپەی دڵە، لە جریوەی بولبول و لە شنۆی بای بەرەبەیان و لە هاژە هاژی قەڵبەز و لە فڕە فڕی باڵی پەلەوەر و لە تریفەی جوانی مانگەشەو لە ئاوابوونی ڕۆژ و هەڵاتنی مانگ و جریوەی ئەستێرەکان و لە شەپۆلی ئاوی ڕووبارەکان و لە برووسکەی هەورەکان و جوانیی سروشت واتامان بۆ دەردەهێنێ، ئەمانەش لە هەموو دڵێکدا شاراونەتەوە، بەڵێ هۆنراو ئەوەیە کە دڵ ببزوێنێ و دڵ بەرەو خۆی ڕاکێشێ و گیروگرفتەکانی کۆمەڵ بخاتە ڕوو و خەڵک وریا کاتەوە و ببێتە پەیام بۆ خەڵک.

کەواتە هۆنەرەکانمان بەرانبەر بەگەل و نەتەوەی خۆیان ئەرکێکی زۆر گەورەیان لەسەرە و دەبێ لەم ڕێگەوە هانی گەلەکەیان بدەن بۆ کردەوەی باش و خزمەت، بەنیشتمانەکەیان تا لاوانیش لەم بارەوە بکەونە هەوڵ و تەقەلا و تێکۆشین و لەم لایەنەوە دەتوانین شێخ نووری و گۆران بکەینە ئاڵا هەڵگری ئەم بیرە و، شێخ نووری و گۆران مزگێنیی ئەم ڕاستەقینەیان دایە لاوان و گەنجان و ئەوانیان هان دا بۆ هۆنینەوەی هۆنراوی نوێ.

هۆنراو بەپێی پێشڕەوتی ژیان دەڕواتە پێشەوە، واتە: خەڵک چۆن دەژین هۆنەر شان بەشانی ژیانی خەڵک هۆنراو دەهۆنێتەوە و لە ڕابردوودا ژیان چەندە سادە و سەرەتایی بووە، هۆنراوەکەش هەروا هۆنراوەتەوە و، کاتێ ژیان پێش کەوتووە و بەرەو ژیار و شارستانییەت ڕۆیشتووە هۆنەرییش لەگەڵیدا بەرەبەرە پێش کەوتووە. بۆ وێنە هۆنراوەکانی مەولەوی لەگەڵ گۆراندا گەلێ تۆفیریان هەیە، ئەو لە سەدەی سێزدەیەمی کۆچیدا ژیاوە و گۆران لە دەوری خۆماندا ژیاوە و هەر کام بەگوێرەی چەرخ و زەمانی خۆیان هۆنراویان هۆنیوەتەوە.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە هۆنراوی نوێ لە وێژەی کوردیدا لەگەڵ ئەوەی کە لە وێژەی فارسیدا بەناوی هۆنراوی نوێ هاتووە، جیاوازیی هەیە. هۆنراوی نوێ لە کوردیدا هەم کێشی هەیە و هەم پاشل، بەڵام کێشەکەی کێشی خۆماڵییە کە هیجای پێ دەوترێ و زۆربەی هۆنراوەکانی گاتای زەردەشت هەر بەو کێشە بووە و ئەمەش لەگەڵ نرخی گۆرانیبێژاندا ڕێک دەکەوێ و، لە هۆنراوی نوێی کوردیدا تەنیا ناوەڕۆکەکە پێویستییەکانی زەمان دێنێتە دی.

لە ڕاستەقینەدا هۆنراو لەگەڵ پەخشاندا جیاوازیی هەیە و هۆنراو یەکێکە لە هونەرە سنوورکێشراوەکانی وێژە، وە لەبەرئەوەی ژیانی مرۆ هەست و خوستی بەرەو پێشکەوتن دەڕوا، هۆنراویش بەرەو پێشکەوتن دەڕوا، هەروەها کە شێخ نووری و هاوەڵەکانی تەوقی لاساییکردنەوەیان شکاند و دەستیان لە کلکی عەرووز هەڵگرت و شێوەیەکی نوێیان گرتە

پێش، کە ئێستاش زۆربەی هۆنەران لەسەر ئەو شێوە دەڕۆن.

کەواتە هۆنراو شان بەشانی ژیان دەگۆڕێت و بەرەو پێشەوە دەڕوات، وە مەبەست لە هۆنینەوەی هۆنراو گوزارەی جوان و قووڵ و مەبەستی نوێ و ناوەڕۆکی بەکەڵکە و، دەبێ لەگەڵ پێشکەوتنی نوێدا بگونجێت و، ئەگەر لە هۆنراوێکدا واتای جوان لەگەڵ کێشی هۆنراوەکەدا لەگەڵ کۆتاییی هۆنراوەکە بەرهەڵستیی بێ، دیارە هۆنەر لەو شوێنەدا بۆ پاراستنی مانا جوانەکە دەبێ واز لە کێش و پاشڵ بێنێت و هۆ بکاتە گا و گەردوونی مەبەست، بەپێچەوانەی ئەوە هۆنەرانی پێشوو مانایان دەکردە قوربانیی کێش و پاشڵ، و ئیتر مەبەستیان ناوەڕۆک نەبوو، بەڵکو مەبەستیان کێش و پاشڵ بوو.

لێرەدا ئەمەش دەبێ بڵێین زۆربەی هۆنەرانی گۆرانیبێژ و هەورامیبێژ، هەر لە مێژەوە لە سەر کێشی خۆماڵی واتە هیجا هۆنراویان هۆنیوەتەوە و گوێیان نەداوەتە عەرووز، بۆیە هۆنراوەکانی ئەو هۆنەرانە لە ناو کوردەواریدا بنجیان داکوتاوە و بەهەموو لایەکدا بڵاوبوونەتەوە، بۆیە شێخ نووری و گۆرانیش هەر لەسەر کێشی هیجا هۆنراویان هۆنیوەتەوە.

ئەڵبەت ئێمە ناتوانین دەست لە هۆنەرانی پێشوومان وەکو نالی و سالم و کوردی و مەحوی هەڵگرین، چونکە سامانی وێژەی ئەو هۆنەرانە کەلەپووری نەتەوایەتیی ئێمەیە، وە ئەو هۆنەرانە گەلێ ڕاژەیان بەزمان و وێژەی کوردی کردووە و گەلێ وشەی کوردیی پەتییان لە هۆنراوەکانیاندا بەکاربردوون کە ڕەنگە ئەگەر ئەوان نەبووایەن ئەو وشانە ئێستا لەناوچووبایەن.

بەڵام هۆنراوی نوێ لەگەڵ چەرخ و زەماندا هاتووەتە پێشەوە و هۆنراو بەرەبەرە گۆڕاوە و لەگەڵ زەماندا چووەتە پێشەوە و هۆنەر ئێستا پتر لە سەر مەبەست و ناوەڕۆک دەڕوا و ئەوەندە گوێ ناداتە کێش و پاشڵ. هۆنراوی نوێ هاندانێکە بۆ گەل و کۆمەڵ کە لە ژیاندا وریا بنەوە و هەموو دەست بدەنە دەستی یەک، بۆ پێشخستنی وڵات لە بوارەکانی ژیان تێ پەڕن و هەوراز و نەوییەکانی ژیان ببڕن و سەرکەون.

هۆنەر دەبێ بەسەربەست هۆنراوەکانی بهۆنێتەوە و بێباکانە هەستی خۆی بەرامبەر بەگەل و نەتەوەکەی دەرببڕێ و ئەوەی کە گەل و نەتەوەکەی دەیەوێ لە هۆنراوەکانیدا دەری بخا و تەنانەت لە پەند و ئامۆژگاریی نەتەوەکەیا نابێ ڕاوەستێ بەجۆرێ کە هۆنراوەکانی داگری هەموو چەشنە بابەتێک بێ تا هەموو کەڵک و سوودی لێ وەرگرن.

سەرچاوەکان


١- شیعری کۆن و تازە نووسینی ص. هەژار - سلێمانی - ١٩٧٣.

٢- شیعری کۆن و نوێ، نووسینی پ. هەوری - سلێمانی ١٩٧٥.

٣- هۆنراوی نوێ نووسراوی محەمەد سەعید ناکام - سلێمانی ١٩٥٩.

٤- ئەدەبی کوردیی نوێ و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی نووسینی عەلائەدین سەجادی - بەغدا ١٩٦٧.

٥- چەند باسێکی ئەدەبی، نووسینی ئۆرخانی غالب - سلێمانی ١٩٨٥.

٦- چەند مەسەلەیەکی شیعری نووسینی شێرزاد عەبدورەحمان - سلێمانی ١٩٧٧.

٧- شیعر هەڵوێستە، نووسینی حەمە سەعید حەسەن - سلێمانی ١٩٧٩.

٨- شیعری کوردی نووسینی د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ - بەغدا ١٩٨٠.

٩- کاروانی شیعری نوێی کوردی نووسینی کاکەی فەللاح - بەغدا ١٩٧٩.

١٠- کامەران و هۆنراوەی نوێ، نووسینی حەمە سدیق عارف - بەغدا ١٩٥٨.

١١- لە بانێژەی شیعرەوە نووسینی مەحموود زامدار - بەغدا ١٩٨١.

١٢- لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی نوێی کوردی، نووسینی ساجید ئاوارە - سلێمانی ١٩٧٤.

١٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەهۆنراوی نوێ.

## شاکه و مەسوور

سەدەی سێزدەیەم

شاکه کوڕی ئەولەی گەلاڵییە، بەپێی بەیازێک کە کەوتووەتە دەستمان لە ساڵی ۱۱۹۹ی کۆچی لە دێی دەرەوەزانی سەر بەشاری سەقز لە دایک بووە و لەسەر پەیڕەوی خوێندنی ئەو مەڵبەندە هەر بەمنداڵی خەریکی خوێندن بووە و ماوەیەک لەلای مەلای دێیەکەیان قورئانی پیرۆز و گوڵستان و بوستانی خوێندووە و ئەوسا حەزی لە هۆنراو کردووە و کاتی خۆی بەخوێندنەوەی هۆنراوی هۆنەرانی کورد وەکو: خانا و شێخ حەسەنی مەولانا وا بردووەتە سەر و لە پاشا ماڵی بەجێ هێشتووە و کەوتووەتە گەشت و گێڵ هەتا لەگەڵ مەسوور خانی گەڵواخیدا ئاشنایەتیی پەیدا کردووە و بووەتە میرزا و نووسەری ئەو تا لە ساڵی ۱۲۵۸ی کۆچی لە تەمەنی حەفتا و چوار ساڵی لە دێی کەسنەزانی سەر بەدیواندەرەدا کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێشدا نێژراوە.

مەسوور خان کوڕی ئەحمەد خانی گەڵواخی لە ساڵی ۱۱۸٦ی کۆچی لە دێی کەسنەزانی سەر بەدیواندەرەدا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و هەر لەو دێیە لەلای مەلا قادری کەسنەزانی، خەریکی خوێندن بووە و قورئانی پیرۆز و گوڵستان و دیوانی حافزی شیرازیی خوێندووە و پاشان خێی داوەتە دیوانی هۆنەرانی کورد و خۆیشی دەستی کردووەتە هۆنراو هۆنینەوە و تام و بۆنی هۆنراوەکانی مەڵکەی مراد وەیس و خانا لە هەموو ڕەگ و دەمارەکانی هاتوچۆیان دەکرد و پاشان دەستی کردە هۆنراو هۆنینەوە و ئەوسا لەگەڵ شاکەدا ئاشنایەتی، پەیدا کرد و بەیەکەوە دەستیان کردە هۆنینەوەی هۆنراو و بەڕاستی هۆنراوەکانیان لەوپەڕی جوانی و پاراوییەوەن و سەرئەنجام لە ساڵی ۱۲۵۵ی کۆچی لە دێی کەسنەزان کۆچی دوایی کرد.

لە بەیازێکدا کە لە ساڵی ۱۲۸۹ی کۆچیدا نووسراوە، سەبارەت بەچۆنییەتیی ژیان و شوێنەواری شاکە و مەسوور بەم جۆرە نووسراوە: «منصور خان ابن احمد خان گلباغی اجداد واعمامش دردولت زندیه و قاجاریه صاحب مناصب عالیه بودندو وی درسنهء ۱۱۸٦ هیجری در قریه کس نزان اوباتو قدم بەعرصه امکان نهاد ودر علم وفضل واخلاق وسلوک مرتبه عالی داشت و تحصیل معاش از رهگذر زراعت ودهقانی کردی وهرچه داشتی مصروف درویشان و شاعران نمودی و بیشتر عمرش رابا شاکه گلالی گذراندی و سرانجام بەسال ۱۲۵۵ هیجری قمری در مسقط الرأس خود درگذشتی و شاکه ابن ابو الحسن گلالی ازوارستگان زمان خودبودی و در سنهء ۱۱۹۹ هیجری قمری در قریهء دروزان سقز متولد شدی ومدتی سیاحت نمودی و سرانجام منصور خان راملاقات کردی

و گفته است که درایام صیف اورادیدم نمد پاره بردوش و سر و پا برهنه خرز میفروختی و گفته‌هایش رابا شعری گفتی و بالاخره در سنه ١٢٥٨ هیجری قمری فوت کردی و شاکه و منصور هر دو باهم شعر میگفتند و شاکه‌بشتر به عرفان توجه داشت و منصور خان را به‌عدل و عرفان می کشاند و منصور خان نیز ازاو بهرده‌های زیادی می برد، این ابیات از آنان است:

شوکرانه‌م پێت بۆ بینای بان سەر

کووره گەلاڵان لافاو گرتنه وەر

سنه ١٢٨٩ هیجری قمری».

واته: مەسوور خان کوڕی ئەحمەد خانی گەڵواخی که باو و باپیر و مامەکانی له دەوڵەتی قاجاردا پلەوپایەیەکی بەرزیان هەبوو له ساڵی ١١٨٦ی کۆچی له دێی کەسنەزانی هەوەتوودا پێی ناوەته مەیدانی ژیانەوە، و له زانست و ئاکاری جوان و ڕێ و ڕەوشتا پلەوپایەیەکی بەرزی هەبوو، وه پتر له ڕێی کشتوکاڵ و ماڵتداریدا دەژیا و هەرچێکی بوایه بۆ هەژاران و هۆنەران بەختی دەکرد و زۆربەی تەمەنی لەگەڵ شاکەدا برده سەر و سەرئەنجام له ساڵی ١٢٥٥ی کۆچیدا له زێدەکەیدا کۆچی دوایی کرد و شاکەش کوڕی ئەولەی گەلاڵی له پیاوانی خواناسی زەمانی خۆی بووه و له ساڵی ١١٩٩ی کۆچی له دێی دەرەوەزانی سەر بەسەقز له دایک بووه و ماوەیەک خەریکی گەڕان بوو، و سەرئەنجام مەسوور خانی چاوپێ کەوت و وتوویه: که له ڕۆژانی هاویندا ئەوم دی و لبادێکی کردبووه کۆڵیا و سەروپێ ڕووت وردەواڵەی دەفرۆشت و قسەکانی هەمووی بەهۆنراو بوو، و سەرئەنجام له ساڵی ١٢٥٨ی کۆچی گیانی بەگیان ئافەرین سپارد و شاکه و مەسوور خان هەردووکیان هۆنەر بوون و بەیەکەوه هۆنراویان دەوت و شاکه پتر حەزی له خواناسی دەکرد و مەسوور خانی بەرەو داد و خواناسی هان دەدا و مەسوور خانیش گەلێ بەهرەی لێ دەبرد، ئەم هۆنراوانه هی ئەو دوو هۆنەرەیه:

شوکرانەم پێت بۆ بینای بان سەر

کووره گەلاڵان لافاو گرت نه وەر

ساڵی ١٢٨٩ کۆچی مانگی».

مامۆستا عەلائەدین سەجادی له مێژووەکەیدا له بەشی باخی شاعیران لاپەڕەی ٥٤٣دا دیاردەی کردووەته ئەم دوو هۆنەره و بەناوی شاکەی گەلاڵی و مەسووری گەڵواخی یادیانی کردووه و ئەوەش ڕوون و ئاشکرایه گەلاڵییەکان و گەڵواخییەکان هەر له هەوەتوودا ژیان دەبەنه سەر.

دەگێڕنەوە و دەڵێن شەوێکیان مەسوور خان خەوێکی بەهۆنەرێکەوە دیبوو کە تەواوی سامان و داراییەکەی بەپیلەبازیی هۆنراو لە دەست سەندووە کە کەوتە بەیانی چاوی کەوتە پیاوێکی هەژاری وردەواڵە فرۆش و ڕوانیی کە ژنان و کچان لە دەوریا کۆبوونەتەوە و وردەواڵەی لێ دەکرن و ئەویش بەڕووخۆشییەوە لەگەڵیاندا دەدوا و مەسوور خانیش لە باڵەخانەوە سەرنجی دەدا و داخ و موخابنی دەخوارد کە چۆن ناتوانێ وەکو ئەو پیاوە لەگەڵ ژنان و کچانا بدوێ، بۆیە بەخۆی وت دەروێشی و هەژاری لە دەوڵەمەندی باشترە و ئەوەبوو لە دیواخانەکەی هاتە خوارەوە و چووە لای وردەواڵە فرۆشەکە و ناوەکەی پرسی و ئەویش وتی ناوم شاکەیە و لەم کاتەدا باران بەلێزمە دەباری و مەسوور خان وتی:

شوکرانەم پێت بۆ بینای بان سەر

لە وەڵامی مەسوور خانا شاکە وتی:

کووره گەلاڵان لافاو گرت نە وەر

ئەوسا مەسوور خان وتی:

وە شەو مەسازۆ میل سووهان ساو

شاکە لە وەڵامی ئەوا وتی:

وە ڕۆژ مەتکی قەترە قەترە ئاو

ئەوسا مەسوور خان زانی کە شاکە هۆنەرێکی زۆر بەرزە و داوای لێ کرد ئیتر دەست لە کارەکەی بکێشێ و ببێتە میرزا و نووسەری تا ژنیشی بۆ بێنێ و بەیەکەوە ژیان بەرنەسەر، ئەویش وتی: جارێ دوانزە قران قەرزارم و دەبێ مامەڵە بکەم تا بیدەمەوە و خانیش وتی قەرزەکەتیش دەدەمەوە.

مەسوور خان لەبەرئەوەی حەزی لە پیلەبازیی هۆنراو دەکرد و بۆ ئەوەی دیسان شاکە تاقی کاتەوە ڕووی کردە شاکە وتی:

سانای سەر قرڕەت کەس پێ نەزانا

شاکە لە وەڵامدا وتی:

سپیبەد جە ڕووی سەرزەمین شانا

ئەوسا مەسوور خان وتی:

ئینە پایزەن مەل مەڕێزۆ باڵ

شاکە لە وەڵامدا وتی:

هەوا تۆفش هەن بونمی سەردی ساڵ

پاشان مەسوور خان وتی:

ئێنە پایزەن ســـایقـــەی عـــەزیم

شاکە لە وەڵاما وتی:

دەور گۆلاوان گـرتەن دۆمـەی سـیم

لە پاشا مەسوور خان وتی:

ئـێـنـە پـایـزەن هـەوای بـەنـەڵ بـەن

شاکە لە وەڵاما وتی:

دەور گۆلاوان دۆمـەی سـیمـیان ژەن

دەگـێڕنەوە و دەڵێن جـارێکیـان شـاکـە و مـەسـوور دەچنە جـوانڕۆ و مـەسـوور خـان چاوی دەکەوێتە ژنێکی شۆخوشەنگ و سەوداسەری دەبێ و دەڵێ:

وەنەوشـــەداران وەنـەوشـــەی وەش بۆ

بەگـزادەی بـێ عـەیب جـاف جـوانڕۆ

لە وەڵاما شاکە ڕوو دەکاتە مەسوور خان و دەڵێ:

وەنەوشـــەداران وەنەوشـــەی وێشـــەن

وەنەوشەی کەسێ وە کەسێ چێشەن

دەگـێڕنەوە و دەڵێن جـارێکیـان مـەسـوور خـان چاوی دەکەوێتـە کـیژێکی نەشـمـیل کـە گۆزەیەک ئاو بەسەر شانییەوەیە و ڕوو دەکاتە شاکە و دەڵێ:

شـاکـە شـارێ دیم، شـاکـە شـارێ دیم

سـەد بارەکـەڵڵا عـەجـەو شـارێ دیم

شـەربەت جە دەسگای دوکانداری دیم

بـازاڕ وە مـــۆڵەق ســـەر منـارێ دیم

حـوجرەی شـیشـەوەن پڕ شەکەری دیم

دەروازەی لاڵپـــۆش پڕ گـــەوهەری دیم

شاکە لە وەڵامی مەسوور خاندا دەڵێ:

نەنـە ئاغـــەکـــەم مـــەتـای ئەو شـــارە

بـازاڕ وە مـــۆڵەق دەس دوکـــانـدارە

حـوجـرەی شـیشـەوەن خـشت یەکدانە

دەروازەی لاڵ شەکەر زووانە

عەتار چاوشەن سیاو سەرپۆشەن

ماران زوڵفشەن وە باد خرۆشەن

دەگێڕنەوە دەڵێن مەسوور خان بۆ تاقیکردنەوەی شاکە ئەم هۆنراوانەی لە قاڵبی مەتەڵدا هۆنییەوە کە دەڵێ:

شاکە تەیرێ وەن، براکە تەیرێ وەن

چوار سەر دارۆ هەر سەر سەیرێ وەن

چوار باڵ دارۆ هەر باڵ خەیرێ وەن

هەر باڵێ سێ پەڕ بەنەن وە بالاش

هەر پەڕێ سێ ڕەنگ مەنمانۆ کالاش

لە وەلامی مەسوور خاندا شاکە دەڵێ:

ئەو تەیرە ساڵەن، چوار باڵش کاسەن

پەی گەدا و دارا هەمیشە خاسەن

باڵش سێ پەڕەن. ساڵ دوانزە مانگەن

ساڵ و دوانزە مانگ ملک شەش دانگەن

ئەم هۆنراوانەش هی ئەم دوو هۆنەرەیە:

مەسوور خان:

عەقلم نەمەندەن فامم سەرسەری

عەقڵ و فام و هۆش جە لام بی بەری

شاکە: عەقلم نەمەندەن هۆشم بییەن کەم

عەقڵ و فام و هۆش جە لام کەردەن ڕەم

مەسوور خان:

موژانان خەدەنگ زومرەی سەراوان

هەر گاسوب سەحەر خێزۆ جە خاوان

وە پەنجەی ڕەنگین دەسدا نە چاوان

سەحەر زوو قاپی پەی سەیر مەشکاوان

شاکە:

مــوژانان خــەدەنگ وەک تیــژ باڵ تەیر
مـەشـانا نە ڕووی دیدەی ئاهوو جـەیر
سوب سەحەر قاپی مەشکاوان پەی سەیر
مــوژانان خــەدەنگ پێکا نە جــەرگم
کــۆکــۆ بی هووناو ســەرتاپای بەرگم

مەسوور خان:

ســۆســەن گــوڵ چڕی لە وەرمــەغــاران

شاکە:

هەی هەی مــزگـــانی هاتەوە یاران

مەسوور خان:

گــوڵان خــێــزیا لە وەرمــەغــاران

شاکە:

خـــودا شــوکـــرت بۆ هاتەوە یاران

خان مەسوور:

دارم ئــاواتـــێ، دارم ئــاواتـــێ
فــەڵەک نە دەرگـــا دارم ئاواتێ
گــرد بەدەن گــەســتــەی مــارم ئاواتێ
ئامـــاش بەخــێـــر بۆ یارم ئاواتێ
بالآ بەوێنەی نەمـــام عـــەرعـــەر
نەنە بەوێنەی ســـەوڵ و سنەوبەر.

شاکە:

بالآ چون مــەلەک حــەوتەمــینی هەس
لیقای گشت ئۆمەت سەرزەمینی هەس
جـفـتێ گـۆشـوارەی زێو و تەلآی هەس
هەزار نۆکــەری وەڵلا و بیــلای هەس

خان مەسوور:

لووت بە خـزێمی خـۆش تەماشای هەس
لەو پەڕەی کاغەز دەستی پاشای هەس

شاکە:

لەو پەڕەی کاغەز دەم حەوزی کەوسەر

پڕە لە وەفراو کەیلە لە گەوهەر

مەسوور خان:

چتێ بەنامی کاری غەیبی هەس

ئەگەر من بێژم خەیلێ عەیبی هەس

دەگێڕنەوە و دەڵێن کە مەسوور خان شاربەدەر دەکەن و دەینێرنە قەندەهار، چونکە ئەو دەمە قەندەهار بەشێک بووە لە ئێران و ئەوسا مەسوور خان ئەم پارچە هەڵبەستە دەهۆنێتەوە و دەینێرێ بۆ خزمەکانی، وەکو دەڵێ:

بێژن وە پەروەر نەکا ماڵە و ماڵ

هام لە قەندەهار هەتا چەندین ساڵ

بێژن وە پەروەر نەچێ وە ماڵان

وردە خاڵەکەی نەدا وە تاڵان

هام نە قەندەهار دنیام لێ قارە

هەر بۆ شاپەروەر گشت ژار مارە

لە قەندەهارە و تا بەرزیی ولان

تەی کەم شاخ و داخ تا کێلە گولان

لە قەندەهارە و بفرم وێنەی تەیر

کوچکینەوە ئارێز بکەم سەیر

ولان و ئارێز ناوی دوو کێوە لە کوردستاندا و کێلە گولان و کوچکینەش ناوی دوو دێن.

ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی شاکەی گەلالییە کە بەهۆی کۆچی دوایی مەسوور خان هۆنیویەتەوە کە دەڵێ:

پیر بەز نەزانا خان مەسوور مەردەن

گولانت وەی تەور حەمایەت کەردەن

سپای بانانت نەسەر گەرد بانان

سەف سەف گرد سەف دان چون ئوردووی خانان

ولان بپۆشۆ بەرگێ نە مەچیر

نەبۆ خان مەسوور نەیۆ وە نەچیر

جـــەولە بپـــۆشـــۆ بەرگێ نەدەوار

نەبۆ خــــان مــــەســـوور نەیۆ وە شکار

مــــیـــــرزا هۆرێزە یە خـــاو بەهـارەن

ســـەنگ وە ســـەنگێ تەر نە خـــاو بێـــزارەن

ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی تری شاکە لەوەدا ئاماژەی کردووەتە، کەیخەسرەو بەگی جاف کە سەرۆکی عێلی جاف بووە و لە ساڵی ١٢٤٦ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە:

مەسوور دوو پۆڕ دیم، مەسوور دوو پۆڕ دیم

ئیـــمـــڕۆ نە ســـارا وە وێم دوو پۆڕ دیم

دوو کەیخەسرەو ڕەنگ، دوو تەیر تۆڕ دیم

دوو شەنگ، دوو شاباز، دوو لفکە شۆڕ دیم

دوو ڕەوێڵـــە ڕەنگ ئیـــمـــڕۆ نە ڕاو دیم

دوو دیدەی مـەوزوون سـوب جـە گـۆلاو دیم

دوو یاســـەمـــەن گـوڵ جــە بەر کـاوان دیم

دوو بـەت تـەیـار ســـــوب نـە ئاوان دیم

دوو دوڕ، دوو یاقـــووت، دوو دانە لاڵ دیم

نە ڕووی دوو ســـینە دوو قـــوبەی زاڵ دیم

وێنەی شـــەمـــامـــە هەر چوار وە پەڕ دیم

جـــە ناو ئاوا لفکەشـــان تەڕ دیم

بیللا وە تاقـــیق دوو شـــەخس نەی ڕەنگەن

گـوڵ ســـفـــیـــد چەنی دانای فـــەرەنگەن

هەردووکـــیـــان وە هەم تووڵە نەمـــامن

دایم خـــدێشـــان وە ســـورمـــە و جـــامن

گـــــەورە وە وێنەی نـەمـــــام نە ئـاوا

بچـــووک بەوێنەی نەو تـووڵ ســـــاوا

گـەورە وە وێنەی ســـوور گـوڵ نە باخـــان

بچـــووک بەوێنەی بەرزای شـــاخـــان

بچـــــووک بەوێنەی دەنکە هەنارە

گـــــەورە بەوێنەی ســـــپی چنارە

هێـــــمـــــــان بە بارن هـەر وان نە لانا
باڵشـــان نەشـــەندەن وە ڕووی جـيـــهـــانا
ئەر خـــوا بيلێـــتـيـــان تا بوون وە نەمـــام
قـــەســـــرێ مـــەســـازوون چەنی گـــوڵەندام

پەرتووکی وەنەوش و بەرمزاکە پەرتووکێکی دڵدارییە هی شاکەی گەلاڵییە و بەشاکاری وێژەیی دێتە ژمـار. شـاکە و مـەسوور لە تەواوی کـوردسـتـاندا ناسـراون و خـەڵکی ئیلام و ئەیوان و گیلان لایان وایە کە شاکە و مـەسوور خەڵکی ئەو مەڵبەندانەن و هۆنراوەکانیـان بەزاراوەی خـۆیان دەخـوێننەوە کـەچی وا نیـیـە و زۆربـەی هۆنراوەکـانی ئەو دوو هـۆنەرە بەزاراوەی گۆرانی سەر بەشێوەی کوردیی هەوەتووە.

سەرچاوەکان
١- بەیازێک کە لە ساڵی ١٢٨٥ی کۆچیدا نووسراوەتەوە.
٢- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەشاکە و مەسوور.

## میر سادقی دینەوەری

١٢١٨ - ١٢٨٣

مـیر سـادق کـوڕی مـازیار بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بۆمـان دەرکـەوتووە کـە لە سـاڵی ١٢١٨ی کـۆچی لە دینەوەرا پێی ناوەتە مـەیدانی ژیانەوە و هـەر لە منداڵیـیـەوە خـەریکی خـوێندن بووە و قـورئانی پیـرۆز و ڕێزمـانی عـەرەبی و ڕەوانبـێـژیی لە لای زانایانی ئاینی خوێندووە و بۆ خوێندن هـەموو هەورامـان گەڕاوە و ماوەیەک لە دێی تووت شـامی بووە و لە لای سـەی براکە خوێندوویەتی و لە پاشـا لە کرمـاشـان خوێندنی تەواو کردووە و ئەوسـا کەوتووەتە گەڕان و گەلێ لە شـارەکانی دیوە و لەگەڵ هۆنەران و زانایانی ئاینیدا وتووێژی کردووە و پاشان گەڕاوەتەوە زێد و مەڵبـەندەکەی خۆی و پاشمـاوەی ژیانی بەوانە وتنەوە و ڕێنوێنیی خـەڵک بردووەتە سـەر تا لە سـاڵی ١٢٨٣ی کـۆچی لە تەمـەنی شـەست و پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانەکەی دینەوەر نێژراوە.

مـیـر سـادق یەکێ لە هۆنەرانی هەرە بەرزی کـوردە و ئەوَ سـەرەتا وەکـو هۆنەرانـی تر شـەیدای دیمەنی ئێلاخـان و چاوەندازی دینەوەر بووە و لەگـەڵ ئەوەشـدا هۆنراوەکـانی: خانای قـوبادی و میـرزا شـەفیـعی کولیـایی و مـەلا وەلەد خـان هـەسـتیـان بزواندووە و لە هۆنراوەکـانیـدا ئـەوەمـان بۆ دەردەکـەوێ کـە زۆر حـەزی لە ئاینی زەردەشت کـردووە و لە

هۆنراوەکانیدا گەلێ زاراوی کۆنمان دەکەوێتە بەرچاو، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەیدا کە ناوی سی ڕۆژی مانگی هێناوە کە لە دەوری کۆندا هەر ڕۆژێک ناوێکی هەبووە، وەکو دەڵێ:

وەرینان واتن هەر مانگ سی ڕۆچەن
هەر کام چون ئافتاو برێ و ئەفرۆچەن
ڕۆژ یەکەمش نامش هۆرمەزەن
وەبێ نام ئەو گەرد مات و کزەن
دووەمین ڕۆژش وەهمەنەن نامش
هەر کەس دڵپاک بۆ ئەو بۆ وە کامش
سێهەمین ڕۆژش ئەرتەوەهێشتەن
هەر کەسێ ڕاست بۆ جاگەش بەهەشتەن
چوارەمین ڕۆژش هەر شەتەرووەرەن
هەر ئەو یاوەر مێرد بێوەرەن
پەنجەمین ڕۆژش سپەندارمەزەن
پەرێ گەرد ژەنان بەوێنەی گەزەن
شەشەمین ڕۆژش هەرۆتات رۆژەن
زێڵ کناچان پەرێش وە سۆژەن
هەفتەمین ڕۆژش رۆژ ئەمەرتاتەن
رۆژ بێ مەرگی و کام و شێتاتەن
هەشتەمین ڕۆژش ڕۆژ دەتۆشەن
هەرچی کە دارۆ ئەو پەرێ تۆشەن
نۆهەمین ڕۆژش ئاهێرەن هەر ڕۆ
سرۆشیش مەیۆ ڕەم بێدار کەرۆ
دەهەمین ڕۆژش ئاو و ئاوانەن
ئەو پەی گەرد کەسێ وێنەی دەرمانەن
یانزەهەمین ڕۆژ ئافتاو وەرەن
ئانە ڕۆشنی و چرای داوەرەن
دوانزەهەمین ڕۆژ هەر ڕۆژ مانگەن
پەرێ شەوەزەنگ چرای شەشدانگەن

سێنزەهەمین ڕۆژ تیشتەرەن یاران
هەر ئەوەن مەبۆ وە ئەور و باران

چواردەمین ڕۆژ، ڕۆژ دەرەسپەن
ئەو ڕۆژە وێنەی ئازەرگوشەسپەن

پانزەهەمین ڕۆژ مەواچن دەزەن
ڕۆژ سرۆش و هەنگوور و ڕەزەن

شانزەهەمین ڕۆژ میترە و هەم مێرەن
دەستگیری مەردوم نەی ڕۆژە خێرەن

هەڤدەهەمین ڕۆژ، ڕۆژ سرۆشەن
خرۆیچ پەرێ ئەو هەر نە فرۆشەن

هەژدەهەمین ڕۆژ واچن ڕۆی ڕەشەن
ڕۆژ دادگەری و درۆن و بەشەن

نۆزدەهەمین ڕۆژ ڕۆی خرۆدانەن
ڕۆژ ئامورزین گردین مێردانەن

بیستەمین ڕۆژیچ، رۆژ بارامەن
نە ئی ڕۆژەدا ئەندەر ئارامەن

بیست و یەکەمین ڕۆژ، ڕۆژ ڕامەن
مەردوم نەی ڕۆژە نە وەشی و کامەن

بیست و دووەمین ڕۆژ هەر ڕۆژ وان
واتیش هەر نە ئێر فەرمان خوان

بیست و سێومین ڕۆژ، ڕۆژ دەزوەن
وەشش نمەیۆ مار گاوەزەن

بیست و چوارەمین ڕۆژ، رۆژ دینەن
پەرێ بێ دینان ئی ڕۆژە شینەن

بیست و پەنجەمین ڕۆژ ئەرتەن جە نۆ
پەی ژەن و کنیک جوانی مەبەخشۆ

بیست و شەشەمین رۆژیچ ئەشتاتەن
دێو و ئەهریمەن جە دەستش ماتەن

بیست و هەفتەمین ڕۆژ ئاسمانەن
وارانش پەی زار داوودەرمانەن
بیست و هەشتەمین ڕۆژ، ڕۆژ زامەن
مێرد پاپەتیش پەرێ ئەو ڕامەن
بیسَت و نۆهەمین ماراسپەندەن
خواجام پەرێ ئەو مانسرش وەندەن
سێیەمین ڕۆژیچ ڕۆژ ئەنغەرەن
ئی ڕۆژە دەرمان مێرد لاغەرەن
واتە: پێشینان وتیان هەر مانگ سی ڕۆژە
هەر کام لەم ڕۆژانە وەکو هەتاو دەدرەوشنەوە

کوردەکان لە ڕابردوودا مانگیان دابەش کردبووە سی ڕۆژ کە دوانزە مانگەی دەبێتە سێ سەد و شەست ڕۆژ کەچی ساڵ سێ سەد و شەست و پێنج ڕۆژە و لە دەوری کۆندا هەر سەد و بیست ساڵ جارێک ئەو ڕۆژانەیان کۆ دەکردەوە تا ئەبووە سی ڕۆژ و دەیانکردە سێزدە مانگ و ئەو مانگەیان جەژن دەگرت.

واتە: ڕۆژی یەکەمی ناوی هۆرمزە
وەبێ ناوی ئەو هەموو مات و کزن

وشەی هۆرمز کە هۆنەر دیاردیی پێ کردووە و بەواتای گەورە و سەرۆک و خوایە. لە ئاڤێستادا نووسراوە کە هۆرمز زانایێکی هەرە بەرزە و ئەو لە هەموو شتێک ئاگەدارە و هەر ئەو بوو کە مرۆی خولقاند و ئاسمان و زەوی بەدی هێنا و ڕوونی خستە جیهانەوە.

واتە: دووهەمین ڕۆژی ناوی وەهمەنە
هەر کەسێک دڵپاک بێ ئەو هیوای دێنێتە دی

وشەی وەهمەن کە هۆنەر ئامـاژەی پێ کردووە لە ئاڤێستادا هوومەنەیە و بەواتای بیری چاکە و وەهمەن یەکەمین ئافەریدەی هۆرمزە و لە سەرتاسەری ئاڤێستادا لە بارەی ئەوەوە قسە کراوە و بەپێی پەرتووکی بوندهشن، ئەو نزیکترین فریشتەی هۆرمزە و کەڵەشێر کە لە بەرەبەیاندا دەقووقێنێ و خەڵک لە خەو هەڵدەستێنێ تایبەتی وەهمەنە و هەر وەهمەن بوو کە گیانی زەردەشتی لە خەودا بردە بارەگای هۆرمز تا لەگەڵیدا ڕاز و نیاز بکا و ڕێ و ڕەوشتی خوایی پێ فێر بکا.

واتە: سێیەمین ڕۆژی ناوی ئەرتەوەهێشتە

هەر کەسێک ڕاست بێ جێگای بەهەشتە

وشەی ئەرتەوەهێشت لە ئاڤێستادا ئەشاوەهیشتەیە کە ناوی فریشتەیەکە و پاسەوانیی ئاور دراوەتە ئەو و ئەو هەموو ئاورەکان دەپارێزێ و ناهێڵێ هیچ کاتێ بکوژێنەوە و هەر لەبەر ئەمەیە پلەوپایەیەکی بەرزی هەیە.

واتە: چوارەمین ڕۆژی ناوی شەتەروەرە

هەر ئەو یار و یاوەری مێردی بێ بەرییە

وشەی شەتەروەر لە ئاوێستادا خسترە وە ئیرییەکە لە پەهلەویدا شەتریوەرە و یەکێ لە فرێشتەکانی ئەمشاسپەنتانە و ڕۆژی چوارەمی هەر مانگێک بەئەو سپێرراوە و ئەو یار و یاوەری هەژاران و لێقەوماوانە.

واتە: پێنجەمین ڕۆژی، ڕۆژی سپەندارمەزە

وە ئەو بۆ هەمووی ژنان وەکو گەز وایە

وشەی سپەندارمەز لە ئاڤێستادا سپەنتەئارمەئیتییە و لە پەهلەویدا سپەندارمەیە و بەیەکێ لە فریشتەکانی ئەمشاسپەنتا دێتە ژمار و بەواتای خۆ بەکەم زانینە و ئەم فریشتەیە پاراستنی خاک و زەویی دراوەتێ.

واتە: شەشەمین ڕۆژی ناوی هەرۆتاتە

دڵی کچەکانی بۆ ئەگرێ

وشەی هەرۆتات لە ئاڤێستادا هەئووروەتاتە و لە پەهلەویدا خورداتە و یەکێ لە فریشتەکانی ئەمشاسپەنتانە و بەواتای ڕاستی و دروستییە و پاراستنی ئاوەکان بەئەو سپێرراوە و هۆرمز ئەوی بۆ حەسانەوەی خەڵک بەدی هێناوە.

واتە: حەوتەمین ڕۆژی ناوی ئەمرتاتە

ڕۆژی بێ مەرگی و کام و شادمانییە

وشەی ئەمرتات لە ئاڤێستا و پەهلەویدا ئەمرتاتە کە بەواتای بێ مەرگییە و ناوی یەکێ لە فریشتەکانی ئەمشاسپەنتانە و پاراستنی گیا و ڕووەکەکان بەئەو دراوە.

واتە: هەشتەمین ڕۆژی ناوی دەتۆشە

ئەو هەرچێکی هەیە هەر بۆ تۆیە

وشەی دەتۆش لە ئاڤێستادا دەتووشەیە و لە پەهلەویدا دەزوەیە کە بەواتای داهێنەر و خولقێنەرە و بەپێی ئاڤێستا خەڵک لەم ڕۆژەدا دەبێ سەریان بشۆرن و تا خوێنەکانیان بگرن و خۆیان پاک و خاوێن بکەنەوە تا هۆرمز خۆشی لێیان بێ.

واتە: نۆیەمین ڕۆژی ناوی ئاگرەوهەررۆ

سرۆش دێت و خەڵک لە خەو وریا دەکاتەوە

وشەی ئاهێر لە ئاڤێستادا ئاتەر و لە پەهلەویدا ئاتوورە و یەکێ لە فریشتەکانە و ئەو هەموو فریشتەکانی جیهان دەپارێزێ و پاسەوانی ئاورگاکانی پێ دراوە و ناهێڵێ بکوژێنەوە، وە هەر ئەو داوا لەسرۆش دەکا کە خەڵک لە خەو هەستێنێ.

واتە: دەیەمین ڕۆژی ئاو و ئاوەکانە

ئاو بۆ هەموو کەسێک وەکو دەرمان وایە

وشەی ئاوان لە ئاڤێستادا ئەپەم و لە پەهلەویدا ئاپانە و بەواتای ئاوەکانە و هەروەها ناوی یەکێ لە فریشتەکانە کە ئاوەکان دەپارێزێ، وە ئاو لە ناو کوردەکاندا گەلێ پیرۆزە و پیسکردنی ئاو گوناهێکی گەورەیە.

واتە: یانزەهەمین ڕۆژ، ڕۆژی هەتاو و خۆرە

ئەمەش ڕووناکی و چرای خوای داوەرە

وەر یا خۆر لە ئاڤێستادا هوەرخشەئیتەیە و لە پەهلەویدا خوەرشێتە و ناوی یانزەیەمین ڕۆژی هەر مانگە و زەردەشتییەکان هەموو ڕۆژێ سێ جار ڕوو دەکەنە خۆر و ستایشی دەکەن.

واتە: دوانزەیەمین ڕۆژ هەر ڕۆژی مانگە

لە بۆ شەوەزەنگ وەکو چرای شەش دانگە

وشەی مانگ لە ئاڤێستادا ماونگەیە و لە پەهلەویدا مایە و ناوی دوانزەمین ڕۆژی مانگە و هەروەها ناوی فریشتەیەکە کە پاسەوانیی ڕووەک و دارەکانی پێ سپێراوە.

واتە: سیازدەمین ڕۆژ، ڕۆژی تیشتەرە ئەی یاران

هەر ئەوە کە دەبێتە هەور و باران

تیشتەر لە ئاڤێستادا تیشتریەیە و لە پەهلەویدا تیرە و ناوی سیازدەمین ڕۆژە و بەپێی ئاڤێستا ئەو فریشتەی بارانە و ناوی ڕووناکترین ئەستێرەیە و سەرۆکی هەموو فریشتەکانە.

واتە: چواردەمین ڕۆژ، ڕۆژی دەرەسپە

ئەو ڕۆژە وەکو ئاورگای ئازەرگوشەسپە

وشەی دەرەسپ لە ئاڤێستادا درواسپەیە و لە پەهلەویدا گۆشە و ناوی چواردەمین ڕۆژی مانگە و هەروەها ناوی یەکێ لە فریشتەکانە کە جانەوەرەکان دەپارێزێ.

واتە: پانزەمین ڕۆژ ناوی دەزەنە

ئەو ڕۆژە ڕۆژی سرۆش و ترێ و ڕەزە

وشەی دەزەن لە ئاڤێستادا دەزوەیە و لە پەهلەویدا دەدوویە و ناوی پازدەمین ڕۆژی مانگە و بەم ڕۆژەش ڕۆژی خوا دەڵێن.

واتە: شانزەمین ڕۆژ ناوی میترەیە

یارمەتیدانی خەڵک لەم ڕۆژەدا خێرە

وشەی میترە لە ئاڤێستا و پەهلەویدا هەر میترەیە و ناوی شانزەمین ڕۆژی مانگە و ناوی یەکێ لە گەورەترین فریشتەکانە.

واتە: حەڤدەمین ڕۆژ، ڕۆژی سرۆشە

کەڵەشێریش بۆ ئەو هەر لە بانگ و خرۆش دایە

وشەی سرۆش لە ئاڤێستادا سرەئۆشەیە و لە پەهلەویشدا هەر سرۆشە و ناوی ڕۆژی شازدەمی مانگە و هەروەها ناوی یەکێ لە فریشتەکانە کە پاراستنی جیهان بەئەستۆی ئەوە.

واتە: هەژدەمین ڕۆژ، ڕۆژی ڕەشنە

ڕۆژی دادگەری و بەخششە

وشەی ڕەش لە ئاڤێستادا ڕەشنوویە و لە پەهلەویدا ڕەشنە و ناوی هەژدەیەمین ڕۆژی مانگە و بەواتای دادگەرە و بریتییە لە فریشتەی داد و دادگەری.

واتە: نۆزدەمین ڕۆژ، ڕۆژی فرۆدانە

ڕۆژی بەخشینی هەمووی مێردانی خوایە

وشەی فرۆدان لە ئاڤێستادا فرەوەشی و لە پەهلەویدا فرەوەهەرە و ناوی ڕۆژی نۆزدەمی مانگە و لە پەڕتووکی بوندهشندا نووسراوە کە بەر لە بە دیهێنانی مرۆ، هۆرمز جیهانی فرەوەشی خوڵقاند و لە پاشا بنیادەمی بەدی هێنا.

واتە: بیستەمین ڕۆژیش ڕۆژی بارامە

ئەندەر لەم ڕۆژەدا ئارامە

وشەی بارام لە ئاڤێستادا ورتەغەنەیە و لە پەهلەویدا واهرامە و ناوی ڕۆژی بیستەمی مانگە و هەروەها ناوی فریشتەیەکە کە شایی و خۆشی دەخاتە دڵانەوە و ئەندەریش کە هۆنەر دیاردیی پێ کردووە، ناوی دێوێکە کە وێرانی و لافاو و دێنێتە دی.

واتە: بیست و یەکەمین ڕۆژ ناوی رامە

وە خەڵک لەم ڕۆژەدا لە ئەوپەڕی خۆشییەوە دەژین

وشەی ڕام لە ئاڤێستادا رامەنە و لە پەهلەویشدا هەر ڕامە و ناوی بیست و یەکەمین ڕۆژی مانگە و بەواتای ئاشتی و هێمنییە و بەپێی ئاڤێستا ڕام دەبێتە هۆی سەوزبوونی لەوەڕگەکان و بژوێنەکان.

واتە: بیست و دووەمین ڕۆژ هەر ڕۆژی بایە

بایش هەر لە ژێر فەرمانی خوایە

وشەی وا یا با لە ئاڤێستایی و پەهلەویدا واتەو ناوی بیست و دووەمین ڕۆژی مانگە و هەروەها ناوی یەکێ لە فریشتەکانە و ئەم فریشتە یارمەتیی شەڕکەران دەدا کە بەسەر دوژمندا زاڵ بن.

واتە: بیست و سێیەمین ڕۆژ، ڕۆژی دەزوەنە

بەڵام ماری گاوەزەن خۆشی لەو ڕۆژە نایە

وشەی دەزوەن لە ئاوێستادا دەزوەیە و لە پەهلەویدا دەزووە و ناوی ڕۆژی بیست و سێیەمی مانگە کە بەواتای داهێنەرە و لەم ڕۆژەدا خەڵک ناخوێنەکانیان دەگرن و خۆیان دەڕازێننەوە و جلوبەرگی تازە لەبەریان دەکەن.

واتە: بیست و چوارەمین ڕۆژ، ڕۆژی دینە

بۆ بێ دینەکان ئەم ڕۆژە شینە

وشەی دین کە لە ئاڤێستادا دگنایە و لە پەهلەویشدا هەر دینە و ناوی ڕۆژی بیست و چوارەمی هەر مانگە و بەواتای ئاین و ڕێ و ڕەوشتە.

واتە: بیست و پێنجەمین ڕۆژ ناوی ئەرتە و سەرلەنۆ

بە ژن و کچ جوانی دەبەخشێت

وشەی ئەرت لە ئاڤێستادا ئەشی وەنگووهییە و لە پەهلەویدا ئەرتە و ناوی بیست و پێنجەمین ڕۆژی هەر مانگە و هەروەها ناوی فریشتەیێکە کە سامان و دارایی خەڵک دەپارێزێ.

واتە: بیست و شەشەمین ڕۆژ ناوی ئەشتاتە

ئەهریمەن لە دەستی ئەو ماتە

وشەی ئەشتات لە ئاوێستادا ئەرشتات و لە پەهلەویدا هەر ئەشتاتە و ناوی بیست و شەشەمین ڕۆژی هەر مانگە و هەروەها ناوی یەکێ لە فریشتەکانە و بەواتای ڕاستی و

دروستییه و بەپێی پەڕاوی بوندهشن گیایی هووم پەیوەندی بەم فریشتەوە هەیە.

واتە: بیست و حەوتەمین ڕۆژ، ڕۆژی ئاسمانە

بارانی بۆ هەژار و لێقەوماو و داوودەرمانە

وشەی ئاسمان لە ئاڤێستادا ئەسمەن و لە پەهلەویدا هەر ئاسمانە و ناوی ڕۆژی بیست و حەوتەمی هەر مانگە.

واتە: بیست و هەشتەمین ڕۆژ، ڕۆژی زەوییە

پیاوی پێخاوس و پا پەتی بۆ ئەو رامە

وشەی زام یا زەوی لە ئاڤێستادا زامیاد و لە پەهلەویشدا زامە و بەواتای زەوییە و ناوی ڕۆژی بیست و هەشتەمی هەر مانگە.

واتە: بیست و نۆیەمین ڕۆژ، ڕۆژی ماراسپەندە

خوام بۆ ئەو وتاری پیرۆزی دەخوێندەوە

وشەی ماراسپەند لە ئاڤێستادا مەنترەسپێنتەیە و لە پەهلەویدا ئەمەهرەسپەندە و ناوی ڕۆژی بیست و نۆیەمی هەر مانگە و بەواتای قسەی خواییە لەم ڕۆژەدا مارە برین و لەگەڵ هاوەڵان دانیشتندا ڕەوایە.

واتە: سییەمین ڕۆژ، ناوی ئەنغەرە

ئەم ڕۆژە بۆ پیاوی لەڕ و لاواز دەرمانە

وشەی ئەنغەر لە ئاوێستادا ئەنغرەر ئۆچەیە و لە زمانی پەهلەویدا ئەنیرانە و ناوی سییەمین ڕۆژی مانگە و بەواتای پرشنگ و تیشکە و لەم ڕۆژەدا خەڵک خۆیان دەدەنە بەر تیشک و دەچنە بەر بەرۆچکە تا گەرمیان بێتەوە.

ناوی سی ڕۆژی ڕۆژەکان کە لەمێژە لە ناو کوردەکاندا باو بوون لە پەرتووکی ئاڤێستا سەرچاوەیان گرتووە و لە دوای ئیسلام ئەو ناوانە کەم کەم لە بیرچوونەتەوە و پاشان ناوی ڕۆژەکانی حەوتە بەهۆی جوولەکەکانەوە بڵاو بووەوە، چونکە جوولەکەکان لە دەوری ساسانییەکاندا پتر لە شاری کوردئاوا و مادایان و هەمەداندا دەژیان و جوولەکەکان بەڕۆژی یەکەمی حەوتە شابەتیان ئەوت کە بەواتای پشوودانە و ئەم ناوە لە زمانی سریانیدا شەبتە و لە زمانی ئەکەدیدا شەباتوویە و لە عەرەبیدا سەبتە و پاشان ئەم وشە کەوتە ناو پەهلەوییەوە و بووە شونبەت و لە فارسیشدا شەنبە و لە کوردیدا شەمەیە و لە پاشا وشەکانی یەکشەمە و دووشەمە و سێشەمە و چوارشەمە و پێنجشەمە لە ناو کوردەکاندا باو بوو، وە لەبەرئەوەی موسڵمانان بەدواڕۆژی حەوتە: یوم الزینەیان ئەوت

کوردەکان وشەی هەینییان لە چاوگی ئادین بەواتای ڕازانەوە وەرگرت و بەکاریان برد.

سەرچاوەکان

١- دیوانی دەستنووسی میر سادقی دینەوەری.

٢- بەیازێک لە ساڵی ١٣٩٨ی کۆچیدا نووسراوە.

٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەمیر سادقی دینەوەری.

## شێخ سەلامی عازەبانی

١٣١٠ - ١٣٧٧

شێخ سەلام کوڕی شێخ ئەحمەدی عازەبانی لە ساڵی ١٣١٠ی کۆچی لە دێی عازەبانی سەر بەهەڵەبجە لە دایک بووە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و هەر لەو تەمەنەدا نیشانەی زیرەکی و بلیمەتیی پێوە دیار بووە، ئەوسا باوکی مامۆستای بۆ ڕاگرتووە و لە لای ئەو فێری ڕێزمانی عەرەبی و خەتخۆشی بووە و لە پاش مردنی باوکی دەکەوێتە ناو تەنگوچەڵەمەی ڕۆژگارەوە و دایکی بەهۆی خزمەکانییەوە پەروەردەی دەکات و لە پاشا ڕوو دەکاتە سلێمانی و لە مزگەوتی شێخ عەبدورەحمان ماوەیەک خەریکی خوێندن دەبێ و ئەوسا لەبەر تێکچوونی باری سلێمانی دەگەڕێتەوە دێی عازەبان و پاشان ماوەیەک بوو، بەپۆلیس و لە دەوری شێخ مەحموودی نەمردا (١٣٠٢ - ١٣٧٦ی کۆچی) کرا بەبەڕێوەبەری سەربازی و لە پاشا لەگەڵ شێخ مەحمووددا گیرا و ئەوسا لە کاری میریدا دامەزرا و سەرئەنجام لە ساڵی ١٣٧٧ی کۆچی لە ناوچەی قەرەداغدا کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەیان بردەوە سلێمانی و لە گردی سەیواندا ناشتیان.

ئەوەی کە ڕوون و ئاشکرایە، شێخ سەلام ژیانێکی پڕ لە پەژارە و چەرمەسەریی بردووەتە سەر و ماوەیەک ئاوارەی کەژ و کێوەکان بووە و ئەمەش کاری کردووەتە سەر دڵ و دەروونی و لەگەڵ ئەوەشدا سەری بۆ کەس دانەواندووە و بەهەوڵ و کۆششی خۆی ژیاوە و لەگەڵ ژیاندا ململانێی بووە و وەکو دەڵێن شێخ سەلام هەر لە منداڵییەوە خەریکی هۆنراو هۆنینەوە بووە و زۆربەی هۆنراوەکانی بریتین لە هۆنراوی: کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی و نیشتمانی و دڵداری و هۆنراوەکانی تا حەزکەی تەڕ و پاراو و شیرینن.

شێخ سەلام لە هۆنینەوەی هۆنراودا شێوەیەکی تایبەتی هەبووە و هیچ کاتێ لاسایی هۆنەرانی پێش خۆی نەکردووەتەوە و وشەی بێگانەشی کەمتر بەکاربردووە و گەلێ شتی تازەی خستووەتە ناو هۆنراوی کوردییەوە، وە بەزۆرەملێش هۆنراوی نەهۆنیوەتەوە، بۆیە هۆنراوەکانی گەلێ بەسۆز و ڕەوانن.

زۆربەی هۆنراوەکانی شێخ سەلام نەتەوایەتین چونکە ئاخ و داخی کۆمەڵەکەی بەچاوی خۆی دیوە، بۆیە هۆنراوەکانی هەر لەم بابەتەوە هۆنیوەتەوە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا ئەوەمان بۆ دەردەخا و دەڵێ:

ئێـــمـــە زۆر زۆر لێ قـــەومـــاوین
بێکەس، بێ دەس، زۆر دامـــــاوین
بۆ ســــەربەســـــتی تێ شکاوین
لەســـــەر ئەرزا بێ ئاو مـــــاوین
بۆ چەرخی کـــــــورد وا بگەڕێ
لاوی ئـــــەبــــێ زوو ڕاپـــــەڕێ

سەلام لایەنگری ئازادییە، وە لەناو هۆنەرانی گەورەی کوردا هیچ کەسێک بەچاکیی ئەو لە بارەی ئازادییەوە هۆنراوی نەهۆنیوەتەوە، سەرەتای هۆنەریەتیی ئەو لەگەڵ دەورەیەکدا بوو کە هیچ چەشنە ئازادییەک لە کوردستاندا نەبوو و، ئینگلیزەکان هەموو جێ و شوێنێکیان داگیر کردبوو، ئەوە بوو کە کوردەکان لە بەرابەری ئەوانەوە ڕاوەستان و، لەودەمەدا هەژاری و برسیەتی و بێ دادی لە هەموو جێ و شوێنێکدا دەبینرا، سەلامیش لەگەڵ هاوەڵانیدا کەوتە ناو ئەم بەربەرەکانێیە، چونکە ئازادیی بەتاقانە هیوای گەل دادەنا، بۆیە لەم بارەوە لە پارچە هەڵبەستێکدا دەڵێ:

کـوردە ڕاپەڕە تا کەی لە خەودای
تا کەی لە خەوی سەر نیوەشەودای
هـەڵســــــــە ڕاپەڕە لە بۆ ئازادی
تـاکـــو ببـــینی تۆ ڕۆژی شـــادی
هەڵســـە ســـا بژی بەکـامـــەرانی
غـــەم بدە بە با بەشـــادمـــانی

سەلام بۆ ئەوەی پەیامی گەلی کورد بگەیێنێتە دەستی سەرەک کۆمەڵی نەتەوەکان و داوایان لێ بکا کە مافی کورد لە بەرچاو بگرن و ڕزگاری و ئازادیی ئەوان بهێننە دی، لەم بارەوە تەرجیع بەندێکی هۆنیوەتەوە و لەوەدا سەرکۆنەی ئەوانی کردووە کە بەبیری ئەم گەلەوە نین و دەبێ چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە، وەکو دەڵێ:

(عـــصـــبـــە الامم) کـــۆمـــەڵی گـــەورە
بەپێچ و پەنا بەفـــــــێڵ و دەورە

له دوور بەدوور بۆ حـــەقی کــوردان
تەکــانت ئەدا خـــۆت دائەشـــرنگان
بەجۆش و کوڵ بووی بۆ کوردی هەژار
ئەتگوت ئەم قــەومــه ئەکــەم ڕستگار
لوجنەی ئینتـداب مـەرەخـەسی هات
گـەڕا کـەشـفی کـرد سـەراسـەر وڵات
ئەگـەر ڕاست ئەکـەی هـەڵی سـووڕێنه
بەس بۆ سـیـاسـەت هەڵمـان پەڕێنه

سـەلام له هۆنینـەوەی هۆنراوی ڕەخنەشـدا دەسـتـێکی بەرز و باڵای هەبووه و لەم بارەوه گـەلێ هۆنراوی هـۆنیـوەتەوه کـه زۆر شـیـرین و تەڕ و پاراون و بۆ ئەم مـەبەسـتـه زنجـیـره هۆنراوێکی جوانی بەشێوەی تەرجیع بەند هەیه که ئەوا چەند بەندێکی ئەم زنجیره هۆنراوه لێرەدا دێنین که لەسەر کێشی خۆماڵییه وەکو دەڵێ:

ڕێگەی ڕاســتی نـاهەمــواره
چەوت و ســـەخت و نالەباره
تەلیـــســمـی دێوی تیـــا دیاره
گـــــەڕانەوەم له لا عـــــاره
ئەڕۆم، ئەڕۆم هــەتا مــــردن
بەڕاســتـیــیــه ڕێ دەرکــردن

***

تووله ڕێگەی ســەخـتی باریک
لاپێ و پلـەی شـــەوی تاریک
ڕێگـه لـه مـن نـابڕن ئـێـــــوه
هـەر چەن پله و سەخت و کێوه
کـــاڵای ئاسـن له پێ ئەکـــەم
ئەڕۆم هەتاکـــو پێی ئەگـــەم

***

ئەی دوژمنـی قـــەومی هـەژار
برسـی کـەری گـشـت کـرێکار

خاوەن پارەی هەموو ئەعمار
گەلت سووتان تۆ بەیەک جار
پارەت هەموو چەشنی ڕاوە
حیلە و فێڵ و بەن و باوە

***

من نامەوێ قەت بەندە بم
یاخۆ فێری دەسندە بم
یا لای میری پەسندە بم
یا وەکو مەل پەڕەندە بم
لە عاستی گەل شەرمەندە بم
ڕوو زەردی خوا و هەم بەندە بم

***

ئازاد ئەبم، ئازاد ئەبم
بەئازادی من شاد ئەبم
هاوپشتی عەدل و داد ئەبم
گەل شیرینە فەرهاد ئەبم
قولنگی عەزمم لە پۆلایە
بێستوونم لە لا بایە

***

هەلسن بەجارێ لاوی کورد
زوو ڕاپەڕن بەدەستوبرد
بۆرە پیاو و فەلاحی ورد
کرێکارانی کوردی گورد
مەژین بمرن بەئازادی
نەوەک ئەسیری و بێ دادی

لە دیوانەکەی سەلامدا لە دوای مەرگی چاپ و بلاوبووەتەوە، گەرچی داگری هەمووی هۆنراوەکانی نییە، بەلام هەموو چەشنە هۆنراوێکی تێدا بەرچاو دەکەوێ: هەلبەستی دلداری، نەتەوایەتی، نیشتمانی، کۆمەلایەتی کە زۆربەیان لەسەر شێوەی نوێ

هۆنراونەتەوە، هەروەها گەلێ چیرۆکیشی هێناوە کە لە ڕادەی خۆیدا زۆر جوانن کە ئەوا لێرەدا یەکێ لەو چیرۆکانە دێنین وەکو دەڵێ:

کـۆترێکی جـوانی خـاڵ و مل نـەخـشین
پـەڕوپـۆ شـین و قـــاچ و قـــول ڕەنگین
هـێــلانەیەکی گـــەرم کــرد بـەتـووک
پـووشـی بـۆ هـێـنـا بـەنـووکـی دەنـووک
لـەســـــەر دارێکی بـەرزی گـــەڵادار
هێـلانە و هێلکە و خـۆی تیـادا حـەشـار
دوو هێلکەی کـرد و کـۆتر کـەوتە کـڕ
پشــتــیـوانی بوو دارســتــانی چڕ
ڕۆژێ ڕاوکـــــەرێ بـۆ ڕاووشـکـار
ورد ورد ئـەگـــــەڕا بـن دار بەبـن دار
مـــــەلێکی نـەدی ڕاوکـــەر لە ڕاویا
وەخت بوو لێـلایی بێت بـەسـەر چاویا
ملـی ڕێگەی گـــرت بـەدڵ دامـــاوی
بڕوات بۆ مـــاڵ و بێ کــــەڵکە ڕاوی
کـۆتر نـەفـام بوو بێ عـەقڵ و کـەمـاڵ
بەرزی کــــردەوە ملـی پڕ لـە خـــاڵ
نـەزانـین بـرا دەردە بـۆ هـەمـــــووان
دەردە دەردێ سـەخـت دەردی بێ دەرمـان
خـــۆت ڕزگـــار بکە زوو لە نـەزانـین
هەتا تـووش نەبیت وەک کـۆتری نەخـشین
کـۆتر دەسـتـی کـرد بەحـاقـوو حـاقـوو
ڕاوکـــەر و ڕاوی هـیـچ لە بیــر نـەبوو
ڕاوکــەر بـەدەنگی کـۆتـر دڵخـۆش بـوو
هـیـلاکـیـی ڕێگەی لا فــەرامـۆش بـوو
لوولەی تـفـەنگی زوو بۆ ڕاکـێـشـا
مـشـتـی گـرت پەنجـەی بـەدوادا کـێـشـا

لە ناڵەی تفەنگ کۆتری هەژار
بەبرینداری لە دار کەوتە خوار
ڕاوکەر وەکو مەل بۆ کۆتر فڕی
کێردی هەڵکێشا و زوو سەری بڕی
زانایەک ئەڵێ من لەلام وایە
نەفست ڕائەگرت عەقڵت ببووایە
وەختێ تۆ مەنتق وا لە ژێر دەستتا
عەقڵت زاڵ ببێ بەسەر نەفستا

شێخ سەلام جەژنە نەتەوایەتییەکانی خۆش دەوێ و داوا لە خەڵک دەکا کە ڕێزی ئەم جەژنانە بگرن، بەتایبەت جەژنی نەورۆز کە جەژنی ئازادی و سەربەستیی گەلی کوردە، وەکو لەم دوو هۆنراوانەدا دەڵێ:

جەژنی نەورۆزتان یاخوا پیرۆز بێ
شەوتان هەر ڕۆژ و ڕۆژتان نەورۆز بێ
هەر ئەم ڕۆژە بوو کاوەی کوردی گورد
مێشکی زوحاکی بەچەکوش ورد کرد

شێخ سەلام چارینەکانی خەیامی بەشێوەیەکی جوان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی کە بەڕاستی خۆی لەسەری ماندوو کردووە و گەلێ ئەرکی کێشاوە و دەتوانین بڵێین کە تەرجەمەکەی سەلام تا ئەندازەیەک نزیکترین تەرجەمەیە بۆ فارسییەکەی، گرنگ ئەوەیە کە چارینەکانی لەسەر کێشی دوانزە هیجایی کە کێشێکی خۆماڵییە وەرگێڕاوە و ئەمەش لەگەڵ مرخی گۆرانیبێژەکان و ئاوازخوێنەکاندا دەگونجێ و ئەوا چەند چارینەیەکی خەیام لێرەدا دێنین کە دەڵێ:

ئەو دەشتە کەوا هەر لالەزارە
گوڵاڵەی خوێنی چەن شەهریارە
وەنەوشەی ڕەنگ شین لە خاک دێتە دەر
دەنکە خاڵەکەی سەر گۆنای یارە

***

ئەڵێن: لە بەهەشت حۆری و غیلمانە
شەرابی ئاڵ و هەنگوینی شانە

نان ئەو نانەیە ئیمڕۆ لە خوانە
بۆ خۆم هەڵگرم بۆ ئەو زەمانە

***

ئەی دڵ! زەمانە خەمی لێت ئەوێ
گیانی شیرینت دەرئەچێ شەوێ
خۆش بژی ئیمڕۆ لە سەبزەزارا
بەر لەوەی سەبزەی خاکت سەرکەوێ

***

مەلێکم بینی لەسەر قەلاّی تووس
لە ژێر چنگیا بوو کەللەی کەیکاووس
بەکەللەی ئەوت: ئەفسووس سەد ئەفسووس
کوانێ دەنگی زەنگ، کوانێ ناڵەی کووس

***

کە نەورۆز گوڵی خستە سەر پەنجە
لەگەڵ دوڵبەری پڕ لار و لەنجە
شەراب بنۆشە ئەم چەرخە شینە
قاروونی فەوتان، گەنجی هەر ڕەنجە

***

ئەو ڕۆژە ئەسپی گەردوون زین کرا
مشتەری، پەروین، ئارایش درا
هەر کەس بەشی خۆی درایە دەستی
گوناهمان چییە؟ وەها بەش کرا

***

کە دەرچوو گیانی پاکی من و تۆ
خشت ڕێژی ئەکەن لاکی من و تۆ
دیسان بۆ خشتی گۆڕی خەڵکی تر
ئەیخەنە قالّب خاکی من و تۆ

شێخ سەلام جگە لە چارینەکانی خەیام، چارینەکانی حسێن قودسی نەخەعی کە یەکێ

له هۆنەرانی فارسی بێژە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی کە بەڕاستی هونەری تێدا نواندووە و دەتوانین بڵێین جوانترین تەرجەمەیە و بەفارسییەکەوە زۆر نزیکە کە ئەوا چەند چارینەی لێرەدا دێنین وەکو دەڵێ:

پیاوی خوا، خوا بەپارە ناکڕن
بێ منەت ئەژین هەتاکو ئەمرن
خۆی و کەڵپۆسی ئەچنە گۆڕستان
نەک لە پاش مردن مەیتی هەڵگرن

***

دەرمان بۆ دەرد، زۆر تاڵە بەدەم
لە کۆنە خۆشتر تازە بەسەرجەم
خۆش بژی بێ شک تا ڕۆژی جەزا
چەرخ هەزار چەرخی بۆ دێتە بەرهەم

***

لە کاری کردەت بۆچ پەشێواوی؟
لە نەکردەگیت چۆن وا داماوی
خۆش بژی ئەی دۆست دەورت تێ پەڕی
تا لا ئەکەیتەوە مردوو خنکاوی

***

ساقی فیدات بم دەی ماچ و مەی بێ
ئارەزووی دڵی ڕەندان بێتە جێ
دنیا چەن تاجی شاهانی فڕان
ئاشە بۆ هەموو، یەک دان و یەک پێ

***

غەم مەخۆ عومری ناساز تەواوە
زۆر دەورەی تاڵت هێشتا بۆ ماوە
گیروگرفتی دنیا بەشەراب
لەگەڵ لانەی غەم وەک پووش سووتاوە

***

هیچ کاتێ گرێی دڵ نەکرایەوە
هەر کەسێ کە ڕۆی نەگەڕایەوە
زەنگی خەتەرم لێ دا سەد کەڕەت
وەک قاپی ئەڵحەد بێ دەنگ مایەوە

سەرچاوەکان

١- دیوانی شێخ سەلام عازەبانی - بەغدا ١٩٥٨.
٢- دیوانی سەلام لەسەر ئەرکی ئومێد کاکەڕەش - بەغدا ١٩٩١.
٣- چوارینەکانی نەخەعی - بەغدا ١٩٦٩.
٤- روباعیاتی خەیام، وەرگێڕاوی سەلام - سلێمانی ١٩٥١.
٥- بەیازێک کە نزیکەی پەنجا ساڵ لەمەوپێش نووسراوە.
٦- شیعر و ئەدەبیاتی کوردی نووسراوی ڕەفیق حیلمی - بەغدا ١٩٥٦.


## عەباسی حەقیقی

١٣٢٣ - ١٤١٧

عەباس کوڕی عەلی پاشای دێبوکری کە نازناوی حەقیقییە لە ساڵی ١٣٢٣ی کۆچی لە دێی مەرجانی سەر بەسابڵاخدا لە دایک بووە و پاشان باریان کردووەتە دێی مەرخوزی سەر بەسەقز و لەوێدا لە لای مەلا قادر ئاغا خەریکی خوێندنی کتێبە وردەڵەکانی فارسی بووە و چەند جزمێکی قورئانیشی لەبەر کردووە و ئەوسا ماوەیەک لە لای بابی خوێندوویەتی و لە پاشا ماوەیەک لە لای شێخ حەسەنی شێخی خەریکی خوێندنی ڕێزمانی عەرەبی بووە و لەم ماوەدا لەگەڵ سەی کامیل و خاڵەمیندا بووەتە هاوەڵ و دەستی کردووەتە هۆنراو هۆنینەوە و ئەوسا چووەتە دێی حەمامیان لە لای حاجی بابا شێخ خەریکی خوێندنی شەرعی ئیسلام بووە و پاشان دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە و ڕۆیشتووەتە سابڵاخ و لەوێدا لە کاری دەوڵەتیدا دامەزراوە و لە پاش چەندین ساڵ خانەنشین کرا و سەرئەنجام لە ساڵی ١٤١٧ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.

حەقیقی هەر لە تافی جوانییەوە هۆنراوی دەهۆنییەوە و زۆربەی هۆنراوەکانی لەسەر سنوور و شێوەی هۆنەرانی کۆن هۆنیویەتەوە و لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا پتر لاسایی نالی و سالم و قانعی کردووە و لەسەر ڕێ و شوێنی ئەوان ڕۆیشتووە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەیدا کە سەبارەت بەوەرزی بەهار هۆنیویەتەوە دەڵێ:

دیسان شنەی نەسیمی بەهارە و کزەی شەماڵ
دیسان بەبەرگی تازەیەوە تازە بووەوە ساڵ
تۆفی سەراوی کانی لەبەر گرمە گرمی ڕەعد
شین بوو زەوی بە نم نمی هەوری گەواڵ گەواڵ
خەملی چیا و چەمەن بەسپی و سەوز و زەرد و سوور
دار و دەوەن بووە بەهەزار ڕەنگی ئاڵ و واڵ
لاچوو بەجارێ پەردە لە ڕووی جەنەتی ئیرەم
ڕازاوە تاقی ئەتڵەس و کیمخاو و حەریر و واڵ
کوێستان لە بۆی هەڵاڵە و بەیبوون عەبیری خاو
ڕەنگاوە باغچەکانی وەکو بووکی چاردە ساڵ
ئەشکەوت و کێو و کەژ بەخۆی قاسپە قاسپی کەو
گوێ کەڕ دەبێ لە قارەیی قاز و قورینگ و داڵ
یا بازە بازی بێچووە یا کارە کاڕی مەڕ
یا قارە قاڕی قومرییە یا هارە هاڕی باڵ
دێن و دەچن بەدوند و قەدی زەرد و ماهەوە
گا کێوی تاق و جووت و بەگەل مێگەلی مەڕاڵ
پێش ئەو دەمەی گزنگ لە سەراندە دا بەری بەیان
یا ئەو دەمەی کە زەردە لە کێوان دەدا بەحاڵ
بڕوانە عەینی قەوس و قەزەح دێنە بەر نەزەر
خاشخاشکی سوور و سەوزەیی سەوز و بنار و یاڵ
کیژان بەپۆل بەیانی دەمێ دەچنە گوڵ چنین
وەک حۆریان دەچن هەموو لێو ئاڵ و چاو کەژاڵ
قەدیان وەکو بلوورە بڕۆیان وەکو هیلال
چاویان میسالی نەرگسە مەست و خومار و کاڵ
دەم چەشنی غونچەیی گوڵەباغی بەری بەیان
ڕوومەت دەڵێی شەهیدە لە خوێندا بووە شەلاڵ
هەستە لە خەو بەیانە «حەقیقی» زەمانی گوڵ
سەیران دەکا لە باغی گوڵان بولبولی خەیاڵ

حەقیقی لە هۆنینەوەی هۆنراوی دڵداریدا تا بڵێی هۆنراوی سوارە و هۆنراوە دڵدارییەکانی گەلێ شیرین و پاراو و ڕەوان، وە گەلێ پیشە و سەنعەتی تیا بەکار بردوون، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا دەڵێ:

دەردی دووری زۆر گرانە دڵبەرا هیجران بەسە
دڵ وەکو پەروانە سووتا چاوەکەم سووتان بەسە
عاقڵان شەیدا دەبن ڕووبەندی سەر ڕوو لامەدە
عاشقان کوشتەی جەفاتن قەتڵی مەزلوومان بەسە
مورغی دڵ پابەندی دانە و داوی خاڵە و زوڵفی خاو
گیری بەندیخانە تاکەی بەندی بێ ئامان بەسە
هەرچی بووم بردی بەتاڵان تورکی مەستی چاوەکەت
تاقەت و سەبر و قەرارم پێ نەما تاڵان بەسە
شاهیدم فرمێسکی خوێنینە کە تۆ جەرگت بڕیم
عاشقی ڕووتم ئەگەر تەقسیرە گەر تاوان بەسە
ئێستەکەش مەجنوون و لەیلێ هەن لە عەسری تازەدا
شێت و سەرگەردانی تۆم، حەیرانی تۆم، حیرمان بەسە
گەنجی عیشقت پڕ بەوێرانەی دڵە و من پێم کەمە
تا زیاد بێ چاوڕێی دیتنم مەڵێ ئیحسان بەسە
گەر قسەی عیشقی گوڵ و بولبوڵ لە لات ئەفسانەیە
تۆ گوڵی خەندان و ئەمنیش بولبولی گریان بەسە
ئاورت بەردا دڵ و گیانی «حەقیقی» چاوەکەم
دەردی بێ دەرمانە عیشقت دەردی بێ دەرمان بەسە

حەقیقی لە هۆنراوەکانیدا ناوی گەلێ گوڵی وەکو: وەنەوشە و شەوبۆ و شلێر و سوێسنە و هەڵاڵە و سووسەنبەر و گوڵەکانی تر و پەلەوەرانی هێناوە و بەبەهار و سروشتدا هەڵدەڵێ و جوانی سروشتمان بۆ دەگێڕێتەوە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا دەڵێ:

بەهاری ئەو ساڵ قەدەمم بەخێرە
شین بوو وەنەوشە و شەوبۆ و شلێرە
سوێسنە و هەڵاڵە و سووسەنبەر و گوڵ
باغی ئیرەمیان داناوە لێرە

کـــوڵی دڵـی هـەور شـــینی کـــرد زەوی
بـاری بـارانـــە و تـــەرزە و گـلـێـــــــرە
هـەر ڕۆژە ئـاویٚ هەر شـــــەو شـــــەواویٚ
وەســـتـــــای باغـــەوان قـــــەدیم ئاودێرە
شـــەونم لە باغـــان عـــەینی چراغـــان
وەخـتـێکی هەڵدیٚ مـانگ و ئەسـتـێـرە
ڕەنگی کـوێسـتـانی وێنەی بەهەشـتـە
جـۆگـــەی ســـەلســـەبیل ئاوی هەڵدێرە
قـــاقـــای قـــەتاری قـــاز و قـــورینگە
کـــاڕەی بەرخ و مـــــەڕ دەنگی بلوێرە
قاسپەی خـاسـەکەو دەنگی مـورغی حـەق
بانگی ســـبـــــەینان گـــویٚ ڕابدێرە
لەو نـێـوە بولبـول دەگـری لەســـەر گـوڵ
دەرمـانی عـاشـق فـرمـێـسکی سـوێرە
ئەو زەردە ســـــوورە پۆڕی گـــــوڵانـن
یا پۆلـی بێـــــری داویانە ســـێـــــرە

حـەقیقی گەلیٚ چوارینەشی هەیە کە بەڕاستی گەلیٚ شـیرین و تەڕ و پاراون و لەوانەدا گەلیٚ مـەبەستی ئاینی و کۆمەڵایەتی و فەلسـەفیی هێناوە کە لێرەدا چەند چوارینەی دێنین، وەکو دەڵیٚ:

دنـیـــا کـــــە تـیـــا ژیـانـی شـــێـــو و وەردە
هەم شـــیـــرن و تـاڵە هـەم شـــیـــفـــا هەم دەردە
داخـــــۆ چیـــیـــــە چاندووتە چ دەدروویەوە لێـی
داخـــــۆ چ دەبیٚ بەرهـەمـی ئەو شـــێـــوەردە

***

دنـیـــا کـــــە تـیـــا مـــــانی کش و مـــاتێکە
ســـــەد ســـــاڵی ئەگـــەر تـیـــا بژی ســـاتێکە
ڕابردوو نـەمـــــا نـەهـاتـوو نـازانـی چیــــــە
ئـەو هـاتـن و چـوونـە هـەر یـەک ئـافـــــاتێکە

خـــۆت باخـــەبەری لە كـــردەوە و ئاكـــارم
زۆر نـامـــە سـيـــام خـــراپە كـــار و بارم
غـــەيری كـــەرەمت هومـــێدی دیكەم نیـــە من
ناگـــاتە كـــــەسی دی غــــەیری تۆ هـاوارم

***

تـا فــەســڵی بەهـارە بـاغ و دەم چەم خـــۆشـــە
شـیـر و شـەكـەر و شـەو و شـەم و مـەم خـۆشـە
هەمـدەم سـەنەمێ خـونچـە دەمێ چاو مـەستێ
دوو مـەم بەدوو دەست و دەم لەسـەر دەم خۆشـە

***

تۆ خـــاوەن و خـــانەخێ و منیش مـــیـــوانم
بۆ هـەر شـــتێ ڕێم نیــــشـــان نەدەی نـازانم
لێم ســــــوورە دەبووری لە گــــوناهـم چونكە
لێت ســــوورە كـــە من بە تۆ هەیە ئیـــمـــانم

***

داخ و كـــەســـەرت ئەگــەر یەكـــە مـــەیكە بە دوو
خـــەم بێ ســـــەمـــەرە لە دووی شـــتی ڕابردوو
چت چاندووە توو، هەر ئەوی لێ هـەڵدەگـــری
ئاواتی عـــەبەس خـــەیاری ناكـــاتە كـــەدوو

***

ئای لەو هەمـوو نیـعـمـــەتە تەمـاشـا چاو چاو
ســـەد جـــۆرە غـەزا و مـــیـــوە لەگــەڵ نان و ئاو
شـــوكـــری كـــەرەمت چلۆن بەمن دەژمـــێـــرێ
ئەی ئەو كـەسی تۆ داوتە بە من گـوێچكە و چاو

حەقیقی گەلێ لە هۆنراوەكانی حافزی شیرازیی (٧٢٤ – ٧٩١ی كۆچی) لە فارسییەوە وەرگێڕاونەتە سەر زمانی كوردی كە بەڕاستی لە وەرگێڕانیاندا هونەری نواندووە و خۆی پێوە ماندوو كردوون، وە دیارییەكی وێژەی پێشكەشی گەلی كوردی كردووە و، ئەگەر تەرجەمەكانی ئەو لەگەڵ هۆنراوەكانی حافزدا بەراورد كەین، دەبینین كە دەقی ناوەڕۆكی هۆنراوەكانی بەجوانی بۆمان كردووەتە كوردی، وە دەسەڵاتی خۆی لە وێژەی فارسیشدا

دەرخستووە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە دەڵێ:

١

شربتی ازلب لعلش نچشیدیم و برفت
روی مه پیکر او سیر ندیدیم و برفت
گوئی از صحبت مانیک به تنگ آمده بود
بار بربست و بگردش نرسیدیم و برفت
بس کەما فاتحه و حرز یمانی خواندیم
وز پیش سورەء اخلاص دمیدیم و برفت
گفت از خود ببرد هرکه وصالم طلبد
ما بامید وی از خویش بریدیم و برفت
شد چمان درچمن حسن لطافت لیکن
در گلستان وصالش نچمیدیم و برفت
همچو (حافظ) همەشب نالەو زاری کردیم
کای دریغا بوداعش نرسیدیم و برفت

***

شەربەتی پێ لە دەمی قەندی نەچێشتین ڕۆیی
تێر نەمانڕوانیە مانگی شەش و هەشتین ڕۆیی
ڕەنگە لای ئێمە دڵی تەنگ و وەڕەز بووبێ وا
باری هەڵبەست و بە تۆزی نەگەیشتین ڕۆیی
هەرچی لەو وێرد و دوعا و فاتیحەیەی بۆمان خوێند
«قل هو الله»شی لەگەڵ یاری بەهەشتین ڕۆیی
وتی بۆ تالبی وەسڵی مە لەخۆبووردنە شەرت
شەرتی جێ هات و بەوەسڵی نەگەیشتین ڕۆیی
هاتە نێو چیمەنی جوانی بە چ لوتفێکی بەڵام
چەرخی چەپ دیمەنی گوڵزاری نەهێشتین ڕۆیی
وەکو «حافز» لە غەما ئەو شەوە تا ڕۆژ گریاین
کە پەلەی چی بوو بە جێی بۆچی دهێشتین ڕۆیی

***

٢

دوش وقت سـحـر از غـصـه نجـاتم دادند

واندر آن ظلمت شب آب حـيـاتم دادند

بيـخـود از شـعـشـعـهء پرتو ذاتم كـردند

باده از جـام تجلى صـفـاتم دادند

چه مـبارک سـحـرى بود وچه فـرخنده وحى

آن شب قـدر كـه اين تازه براتم دادند

بعـد از اين روى من و آينهء وصف جـمـال

كـه در آنجـا خـبـر از جلوهء ذاتم دادند

من اگر كامره وا گشتم و خوشدل چه عجب

مـسـتـحق بودم و اينهـا به زكـاتم دادند

اين همـه شـهد و شكر كز سـخنم مى ريزد

اجـر صبـرى است كز ان شـاخ نباتم دادند

همت «حـافظ» وانفـاس سـحـر خيـزان بود

كـه زبـند غم ايـام نجـاتم دادند

***

شـەوەكی لەو خـەفـەتـەی هـەمـبوو نـەجـاتیان دامێ

چاخی تاریکە شـەوی ئاوی حـەیاتیـان دامێ

كـاسـی پرشـنگ و گـڕی ڕوونی وجـوودیان كـردم

مـەی لە كـاسـێكی شـەبـەقـداری سیفـاتیان دامێ

چ بـەیانـێكی مـوبارەک چ شـەوێكی پیـرۆز

ئەو شـەوی قـەدرە كـەوا تـازە بەراتیـان دامێ

لـەوە بە دوا من و ئـاوێنـەیی تـاریفی جـەمـاڵ

كـە لـەوێدا خـەبـەری دیـتـنی زاتیـان دامێ

هیچ عـەجـایب نیـیـە گـەر كـامـڕەوا و دڵخـۆشـم

موسـتـەحـەق بووم و ئـەوانـەش بـەزەكـاتیـان دامێ

ئەو هـەمـوو نوقڵ و نـەباتـەی لە قـسـەم هـەڵدەڕژێ

حـەقی سـەبـرێكە كـە لەو شـاخـی نـەباتیـان دامێ

هیمەتی «حافز» و ئاهی سەحەری چاکان بوو
کە لە بەندی خەمی ڕۆژانە نەجاتیان دامێ

سەرچاوەکان
١- دیوانی حەقیقی - ورمێ ١٣٦٧.
٢- یاداشتەکانی خۆم سەبارەت بەحەقیقی.

## جگەرخوێن

١٣٢٣ - ١٤٠٥

شێخ مووسا کوڕی حەسەن کە نازناوی جگەرخوێنە لە ساڵی ١٣٢٣ی کۆچی لە دێی هەساری سەر بەماردیندا لە دایک بووە و لە منداڵیدا باوکی مردووە و دایکی لەبەرئەوەی نەیتوانیوە بیژێنێ ناچار خەریکی شوانی و کرێکاری بووە و پاشان لە دەوری لاویەتیدا لە یەکێ لە قوتابخانەکانی هەسار خەریکی خوێندن بووە و مامۆستاکەی هانی داوە کە هۆنراوی هۆنەرانی کورد بخوێنێتەوە و لە پاشا بۆ خوێندن چووەتە ماردین و لە خزمەت مەلا عوبەیدوڵلای ماردینیدا ماوەیەک شەرعی ئیسلام و وێژەی عەرەبیی خوێندووە و لە پاش وەرگرتنی ئیفتا چووەتە کوردستانی ئێران و لە پاش ماوەیەک لە ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران (١٢٨٠ - ١٣٤٥ی کۆچی)دا بەشداریی کردووە و لە پاش تێکشکانی شێخ سەعید بۆی دەرکەوت کە هەندێ لە کوردەکان یارمەتی دەوڵەتی تورکیان داوە و بوونەتە هۆی تێکشکانی شێخ و ئەوسا بۆ ئارامکردنەوەی دەردی دەروونی دەستی کردە هۆنراو هۆنینەوە و لەوێوە چووە کوردستانی سووریە و لە شاری قامشلیدا نیشتەجێ بوو، بەڵام بەهۆی کوردپەروەرییەوە گیرا و ماوەیەک لە زینداندا مایەوە و لە پاش ئازادبوونی ناچار ڕۆیشتە سوێد، بەڵام ئەوەندەی نەخایاند کە لە ساڵی ١٤٠٥ی کۆچیدا گیانی بەگیان ئافەرین سپارد و لەسەر ڕاسپاردەی خۆی تەرمەکەیان بردەوە قامشلی و لەوێدا بەخاکیان سپارد.

جگەرخوێن بەیەکێ لە گەورەترین هۆنەرانی کورد دێتە ژمار و ئەو لەبەرئەوەی ڕۆژگارێکی بەهەژاری و برسیەتی و ڕەش و ڕووتی و بێچارەیی و دەربەدەری بردە سەر و بەرگەی هەموو چەشنە ئەشکەنجە و ئازارێکی گرت و هۆنراوەکانی نوێنگەی هەژاری و بەدبەختی و ڕۆژە ڕەشی و بەربەرەکانێی بێ وچانی کوردەکانە لە بەرابەری ڕژێمی دیکتاتۆری ئەتاتورکدا، هۆنراوەکانی ئەو ڕازی نەبەزیی کوردمان بۆ دەگێڕێتەوە، ڕازی خەم و شادیی کۆمەڵی کوردەواریمان بۆ دەردەخەن، هۆنراوەکانی لە سەرچاوەی ژیانی

کوردەوارییەوە هەڵقوڵیون، بریتییە لە ژیان و ئەوین و بەربەرەکانێی گەلی کورد و لەوانەدا مزگێنیی پیرۆزی و سەرکەوتنی داوەتە خەڵک.

ئەو لە هۆنینەوەی هۆنراو و نووسینی پەخشاندا مامۆستا بووە و چەندین کۆمەڵە هۆنراو و چەند پەڕاوی تری داناوە کە بریتین لە: «جیم و گولپەری، ڕووناک، شەفەق، زەندئاڤێستا، پریسکی و پێتی، سەورا ئازادی، گۆتنا پێشینان، مێدیا و سالار، دەستوورا زمانی کوردی، فەرهەنگا کوردی، کێم ئەز».

جگەرخوێن هۆنراوەکانی لەسەر سنووری هۆنەرانی کۆن و نوێدا هۆنیوەتەوە و لە ڕاستەقینەدا ناتوانین ئەو بەهۆنەرێکی لاساییکەر دانێین بەڵکو زۆربەی هۆنراوەکانی لەسەر شێوەی نوێ هۆنیوەتەوە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا ئامۆژگاریی کۆمەڵەکەی خۆی دەکا و دەڵێ:

کوردنۆ مەردن و پڕخوەشە سەرخوەبوون
ئەو دەمێ تار و تەنگ مەدین ڤانە چوون
دەست بدن هەڤ هەمی پیش کەڤن ئەم هەمی
دا بچن بۆ وەلات یان مرن یان فەلات
ڕۆژ لە هاتە سەر زوو هشیار بن ژ خەو
ئەو دەما جەنگ و شەڕ پر پاش کەتن تینی هەڤ
دەست بدن هەڤ هەمی پێش کەڤن ئەم هەمی
دا بچن بۆ وەلات یان مرن یان خەلات
مە دڤێن ئول و بەخت، مە دڤێن سەرخوەبوون
مە دڤێن تاج و تەخت، مە دڤێن پێشڤە چوون
دەست بدن هەڤ هەمی پێش کەڤن ئەم هەمی
دەربچن بۆ وەلات رزگار کەن فەلات

واتە:

*ئەی کوردی نەبەز! چەندە خۆشە ئازادی*
*ئەو ڕۆژگارە تاریکەی کە دیمان خەریکە لە ناو دەچێ*
دەست بدەینە دەستی یەکتر و ڕێی پێشکەوتن بگرینە بەر
*تا بەرەو وڵات بڕۆین یا مەرگ یا ئازادی*
*هەتاو هەڵاتووە و هەمووماں دەبێ لە خەو ڕاپەرین*

*ئێستا کاتی شەڕ لەگەڵ دوژمندایە و هەموومان دەبێ پاشەکشێ بەدوژمن بکەین*

دەست بدەینە دەستی یەکتر و ڕێی پێشکەوتن بگرینە بەر

تا بەرەو وڵات بڕۆین یا مەرگ یا ئازادی

من بەختەوەری و پێشڕەوتی خەڵکم دەوێ

دەست بەدەستی یەکتر دەین و لەگەڵ یەکا ڕێی پێشکەوتن بگرینە بەر

هەموو بۆ نیشتمانی خۆمان تێ کۆشین و لە دەستی بێگانە ڕزگاری کەین

جگەرخوێن لە پارچە هەڵبەستێکی تردا بەوڵات و نیشتمانەکەیدا هەڵدەڵێ و باخ و مێرگ و چیمەنەکانی بەبەهەشت دادەنێ و یادی سەلاحەدینی ئەیووبی و قارەمانانی تری کورد دەکا کە لەو خاکەدا پێ گەیشتوون و بۆ نەتەوەکەیان تێ کۆشاون و لە ڕێی کۆمەڵدا گیانی خۆیان بەخت کردووە، وەکو دەڵێ:

وەلاتێ من تویی بووکا جەهانی

هەمی باغ و بەهەشت و مێرگ و کانی

شەپال و شەنگ و شۆخ و ناز و گول ڕوو

گەلەک شیرین و ڕند و پر جوانی

سەری تاجا سەلاحدینێ کوردی

ئەنی ڕۆژا د بورجا ئاسمانی

دوو برهێن تە کەڤانێ ڕوستەمێ زاڵ

دوو زولفێن تە ژ تیرێن قەهرەمانی

روویێ تە ئاگرێ زەردەشت و مەزدەک

ژ تە هێس شەڕ یا کامرانی

دوو چاڤین تە وەکی دەریای هورمز

کەپوو ئالماس کارێ مووش و وانی

دوو لێڤێن تە کتێبا حاجی قادر

زمانی تە ژ بەندا شێخێ خانی

د سینگا تە کتێبا زەند ئاڤێستا

مەمک فەرفوورە تێدا نەخشی مانی

سەر و پێ زەند و بازن تەڤ هنارن

هەمی سۆرن ژ ڕەنگێ ئەرخەوانی

«جگەرخـــوێن»ە کـــورێ تە هەر دنالی
ژ بـــەر ژانـــا نـــەزانـــی و نـــەزانـــی

واتە:

*ئەی وڵاتی من! تۆ بووکی جیهانی*
*هەموو جێگایەکی تۆ باخ و مێرگ و کانییە و وەکو بەهەشتی*
*بەڕاستی تۆ وەکو بووکێکی شۆخوشەنگ و ڕوومەت گوڵی*
*گەلێ شیرین و رەند و جوانی*
*تۆ تاجی سەری سەلاحەدینی کوردی*
*تەوێڵت وەکو ڕۆژ لە کەلووی ئاسماندا دەدرەوشێتەوە*
*برۆکانت کەوانی ڕۆستەمی زاڵە*
*زوڵفەکانت وەکو تیری قارەمانە*
*ڕوومەتت ئاوری زەردەشت و مەزدەکە*
*ئەوان لە تۆ هێز دەگرن و کامەرانن*
*چاوەکانت وەکو دەریای هۆرمزن*
*وە لووتت وەکو ئەلماسی شارەکانی مووش و وانن*
*لێوانت وەکو دیوانی حاجی قادری کۆیی شیرینن*
*وە زمانت چیرۆکی شێخ ئەحمەدی خانییە*
*لە سینگی تۆدا پەرتووکی زەند و ئاوێستا شاراوەتەوە*
*مەمەکانت وەکو چینیە و نەخش و نیگاری مانی تێدا کەنراوە*
*سەر و پێ و مەچەکت وەکو هەنارن*
*سەرتاپا سوورن وەکو ڕەنگی ئەرغەوانی*
*«جگەرخوێن» کوڕی تۆ هەموو دەم هەر دەناڵێنێ*
*وە لە ئێش و دەرد شتێ هەست ناکا*

سەرچاوەکان


١- ڕووناک، هۆنراوەی جگەرخوێن – سوێد ١٩٨٠.
٢- سەورا ئازادی، هۆنراوەی جگەرخوێن – شام ١٩٥٤.
٣- شەفەق هۆنراوەی جگەرخوێن – سوێد ١٩٨٢.
٤- هیفی، هۆنراوەی جگەرخوێن – سوێد ١٩٨٤.
٥- ڕەشۆی دارێ هۆنراوەی جگەرخوێن – شام ١٩٥٦.

# خاڵەمین

١٣٢٨ - ١٤١٣

سەی حەمەومین کوڕی حاجی شێخ مستەفای بەرزنجی لە ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی لە دێی کۆکەی سەر بەبۆکان پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و لە هەشت ساڵاندا باریان کردووەتە دێی بۆزە و لەوێدا خەریکی خوێندن بووە و جزمی سێیەمی قورئان و سمایل نامە و ناگەهان و ئەحمەدیی خوێندووە و پاشان لە دێی قسقەڵادا لە لای مەلا کەریمی گراوی خەریکی خوێندنی ڕێزمانی عەرەبی بووە و لە پاشا چووەتە سابلاخ و لە لای مەلا حوسەینی مەجدی خەریکی خوێندنی فقهی ئیسلامی بووە و ماوەیەکیش لە لای مەلا ئەحمەدی تورجانی زادە وێژەی عەرەبیی خوێندووە و ئەوسا لەبەر نەخۆشی دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە و ماوەیەک چووەتە کوێستان و زەنوێر و لەم بارەوە خۆی لە یادداشتێکدا کە نووسیویە دەڵێ: «لەبەر نەخۆشی نەمتوانی درێژە بەخوێندن بدەم، وەدووی خێوەت و چیغ کەوتم و چوومە کوێستان و کاتێک چاوم بەو مەڵبەندە کەوت، هەر نواڵێکی دەمدی هەمووی زەمەند و گیای جۆراوجۆر ملیان داوەتە یەک. مەندۆک و بیزا و هەڵز و کەما لێک ئالاون و تێک چرژاون، کەوییە بەفرەکانی لەندی شێخان هەر لاپاڵێکی تێوەی ڕادەمام، دەتگوت جەندەکی دێوی سپییە و ئەستوور و درێژ، تێیدا کەوتووە، ئاتەگەکانی چۆڕ چۆڕەی ئاوی وەک چاوی قرژاڵ لەبەر دەڕوا و بەگوڵی زەرد و سوور و کەوو خەملیوە، دنەدانی مامۆستا تورجانی بۆ هۆنراو و هۆنەریەتیی هێنایەوە بەر زەینم.» پاشان خەریکی کشتوکاڵ بوو، وە لە پاش ماوەیەک چووە نەغەدە و خەریکی کاری مامڵە و بەقاڵی بوو و، ژیانی بەم چەشنە بردە سەر تا لە ساڵی ١٤١٣ی کۆچی لە تەمەنی هەشتا و پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و بەپێی ئەسپاردەی خۆی تەرمەکەیان بردە سابلاخ و لە تەنیشت گڵکۆی هەژار و هێمندا ناشتیان.

خاڵەمین بەیەکێ لە هۆنەرانی هەرە بەرزی کورد دێتە ژمار و زۆربەی هۆنراوەکانی لەسەر شێوەی کۆن هۆنیوەتەوە، بەڵام ناتوانین بڵێین کە ئەو بەتەواوی هۆنەرێکی لاساییکەرە و هەر پەیڕەویی لە هۆنەرە کۆنەکان کردووە، وەبەهۆنەرێکی تازەش ناژمێررێت و دەتوانین بڵێین پتر چەشکەی هۆنراوەکانی وەفایی و نالیی کردووە و هەندێ جار مەبەستێکی لە قاڵبێکی تازە داهێناوە و هەندێ جاریش هۆنراوی نیشتمانی و کۆمەڵایەتی لەسەر ڕێبازی کۆن هۆنیوەتەوە کە بەداخەوە تا ئێستا هۆنراوەکانی کۆ نەکراونەتەوە کە دەتوانین بڵێین خاوەنی شێوەیەکی تایبەتی خۆیەتی و هەندێ جار بەئەنقەس پاشڵ و سەروای سەخت و دژواری هەڵدەبژارد و وەستایانە لەو مەیدانەدا گرەوی لە هۆنەرانی دەوری خۆی دەبردەوە و

هۆنراوەکانی زۆربەیان لەسەر کێشی خۆماڵین و پتر لەسەر ئازایەتی و پیاوەتی و کۆمەڵایەتی و دینداری و ئاکاری جوان داڕێژراون.

بەشێک لە هۆنراوەکانی ئەوانەن کە لە وەڵامی هاوەڵان و دۆستانیدا هۆنیونەتەوە، وە ئەم بەشە دەتوانین بەجوانترین هۆنراوەکانی ئەو بهێنینە ژمار، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ هۆنراوی سروشتی و نیشتمانی و کۆمەڵایەتیشی هەن کە گەلێ گرنگ و بایبدارن.

خاڵەمین هەر لە دەوری منالیدا سروشت و دیمەنە جوانەکانی کوردستان، کەژ و کێو و زەنوێرەکانی مەڵبەندەکەی و زەمەند و گیا جۆراوجۆرەکان و پەلەوەرانی جۆربەجۆر و مەڕوماڵاتەکەی مرخی ئەویان بزواندووە و بەم بۆنەوە خاڵەمینیان کردووەتە نازناوی خۆی بۆیە لەم بارەوە دەڵێ:

بچۆ لای کوردە کاکی ژیر زرینگ
چونکە جێی کوردە دەس بنێ سەر سینگ
پێی بڵێ خاڵەمین دەڵێ تاکەی
گەنم و جۆ چان و پووڵ جرنگە جرینگ
زۆر چەتوونە کە تێ بگەن تاکو
لە بنان گوێ و نەدەن بە پاچ و قولینگ
پیاوی دنیایی یا خودایی بێ
سۆفی شەو یا هەوا خورانی گزینگ
سەربەخۆیی وە گیر دەخا هەردووک
نەک بە بخۆی وڕینگە وڕینگ
پیشەی پێشینە و رەچاو کەن تا
کوڕی کەروێشک و بۆ ببێتە پڵینگ
شوێنی وان پیاوەتی بوو ئازایی
بۆ عەدوو داندراوە گێز و گولینگ
ڕێک کەون بۆ خۆ چیدی ڕێک مەکەون
چۆکی زل کوڵەوارە بێ گوێزینگ
باوەڕم پێ بکەن کە بۆنگۆیە
هێندە دەگرم لە ئێوە من بەربینگ
دوێنێ بولبول لەنێو گولان دەیگوت
چەن بە سۆزێکی خۆش وڕینگە وڕینگ

به ئومــــێــدی خـــودا و پێـــغـــەمـــبـــەر
بەدڵـی گـــــەرم و چاوی ســــــوور و تـەڕ
کــــوردەکـــــان چی دی ســـەر نەوی نابن
هـەر ئەوەندە نەخـــــتێ بۆ خــــۆ ئازا بن

بۆنی گوڵ و گوڵاڵە خاڵەمین خەوش دەکا و جریوە و چریکەی پەلەوەران مێشکی دەخاتە کار و مەڕوماڵاتی دێیەکەی ئەو دەخاتە جموجۆڵ و ئەوسا دێنێ ستایشی سروشت دەکا، ئەو سروشتەی کە بەدەستی کردگار نەخشاوە و سەیری ئەو دیمەنە جوانە دەکا کە خوا بەهەموو جۆر خوڵقاندوویەتی و لە هەموو گوڵ و گیا و پەلەوەر و زیندەوەر و مەڕوماڵاتێکی تێدایە و دەڵێی بەهەشتە بۆیە بەدڵێکی تەڕەوە بەم چەشنە بەبەهاردا هەڵدەڵێ و دەڵێ:

گــــوڵ و مــــولان دەپشکوێنێ
ڕەنگی جـــۆراوجـــۆر دەنوێنێ
کــــانی وشک دەجـــــمـــــێنێ
کـۆتر جـووت بوو و دەگـمـێنێ
جـــریوە جـــریوی چۆلەکـــانە
قـــاڕەی ســیـیـــە و پۆلەکـــانە
مـــالآتی وە ســـەمـــا دەخـــا
کـوڕ و کـیـــژ وە تەمـــا دەخـــا
هەرچەند بلــێی هەوا خــۆشــە
لەســەر کـانیـان نۆشـا نۆشــە
لـە زەنـوێران هـەڵپـــــەڕینە
بـەدۆیـان تێک ڕاخـــــــورینە
ئـەوەی نـەتـدیـوە دەیـبـــــینی
هـەر شــــادییــــە و خـــۆ نوێنی
ئاڵەکـــــۆک ســــەر وەدەر دەنێ
گـــــەزیزە پێی پێ دەکـــــەنێ
تەیر لە گـــــەرمـــــێنێ دێنەوە
لە چۆمـــــەڵان دەســـــێنەوە
ئاو هـەڵدێر گـوێیـان کـەڕ دەکا
ئی هێندیش فـێـری شــەڕ دەکـا

جار جار ئەگەرچی شەڕ خێرە
تا زووی تەواو بکەی دێرە
شەماڵ بەهەڵمەت هاتەوە
داران ئاوس دەکاتەوە
کێوی لە کولێنان سەرکەوتن
گۆپاڵیان لە خیز دەرکەوتن
بولبول دڵی چڵان دەدا
دڵی بە چەند گوڵان دەدا
زەردەی تاوێ بۆ وا جوانە
لەسەر پەلکی ئەو گوڵانە
ڕێواس و کارگ و کەنێرە
شەوبۆ، وەنەوشە و شلێرە
هەڵز و مەندۆک و بیزایە
بیزا وەک بەژنی زیبایە
لەسەر شینکە و سەر پەلکی گوڵ
ئاونگ کەوتووە زەنگوڵ زەنگوڵ
بۆنی تێکەڵاوی گوڵان
زیندوو دەکاتەوە دڵان
ڕەپستە کەروێشکەی دەکا
ماڵات تەواو چێشکەی دەکا
زیڕەی هەڵۆ و قاسپەی کەوێ
زەینی ڕاوکەر نیوە شەوێ
بە بنەو کەو و دەزگاوە
بۆ و بەستەزمانەی داوناوە
جار جارەش لە چیا و لە رازان
ڕاو دەکا شمقار و بازان
یا خودا توورەکەت بەرباد بێ
هەرچی گرتووتە ئازاد بێ

دیوتە زەویش چۆن دەجمێ

بەهۆی بارانە و نم نمێ

هەرچی تێیدا سەر دەردێنێ

خۆی بە دونیایە دەنوێنێ

لە گرتووخانەی خاکی وەش

دێتە دەرێ پاراو و گەش

بەهار گشتی ئازادییە

ئازادی خودادادییە

بەفەرمانی خودای گەورە

بایە و تێ ڕاخوڕی هەورە

بۆ هەر جێگا مەیلی بێنێ

بەکشتوکاڵدا دەڕشێنێ

ئەو دیمەنە چەندە جوانە

ئاخ گیان لەسەر سوێی ژیانە

زەوی وەک بەهەشت خەملاوە

پیر چی بکا داتۆلاوە

پەسنی بەهار نایە دوایی

بۆ خۆ ماندووکەم خۆڕایی

بەڵێ لە باسی بەهارێ

لادەمین جارێ با ببارێ

چون وەک گۆمێکی بێ بنە

شەوی چەند شیعری منە

کتێب و نووسراوان بێنە

هەزاران شیعری بێ وێنە

پێی هەڵگوتراوە و نووسراوە

من چیم گاوانێک لە دواوە

خاڵەمین بەرامبەر بەزێدەکەی خۆی واتە ئەو شوێنەی کە لە دایک بووە، خۆشەویستیی خۆی لە پارچە هەڵبەستێکدا دەربڕیوە، وەکو دەڵێ: «ئەگەرچی من لە منداڵیدا لەم دێیە

ڕۆییوم، بەڵام ئێستاش کە ناوی کۆکە دەبیسم مچوڕکی خۆشیم بەلەشدا دێ، خۆشەویستیی نیشتمانیش خۆ لە بڕوایەوەیە.» بۆیە بەم چەشنە بەکۆکەدا هەڵدەڵێ و دەڵێ:

کۆکە ئەی کۆکە و ئەی نیشتمانم
خۆشەویستر لە هەناو و گیانم
کۆکە ئەی جێگەی لەدایکبوونم
کۆکە ئەی مایەی بیری ڕوونم
کۆکە جێت لێ نەبێ وەک بەهەشتی
لە حەوت دەرکە بەدوور و هەشتی
کۆکە هەر تۆی بە تەنێ بەرکۆژە
خاکی کوردانم هەمووی بێ بۆژە
کوردستان هێزی هەناو و دڵمە
کێو و دەشت و دەری ئاو و گڵمە
«چوار دیوار» و «قەرەلێت» جێرانە
هەم «قزل گوممەت» و «دەروێشانە»
«کانییە سەرداری» تۆ ئاوی جوانە
ئاوی سەرداری هەموو کانیانە
«کانییە زێڕینەتە» ئاوی ژینە
«گردەبۆر» و «تەپی بۆزان» شینە
من وەبیرم دێ کرا جەنگەڵ و باغ
چرو هەڵدێری زەوی پێش «بارماغ»
«کۆڵکەڕەش» مووچە درۆزنەت ماوە
وەکو جاران «قولەبۆز» پڕ ئاوە
«حاجی دەروێش بەگە» چاکی بە شەمە
گۆڕی هەر لاتە برام «کاکە حەمە»
تۆ ببووری لە هەموان ئەی خوایە
هەرچی گۆڕسانی لە کۆکەیدایە
کۆکە پێیان ئەوتی شیرازی
بۆمە مانانی جێگەی شانازی

«حاجی باپیر» و «حەقیقی» و «کۆکی»
خـــاڵەمـــینیش بڵێ یخ دالۆکی
ئێـســتــە جـێی وانە بویژت کـێنە
چ لە گـــۆڕایە بفـــەرمـــوو بێنە
داخـەکـەم ئێـسـتێ ئەوانەی دەگـەنێ
بە دوو پۆند خـۆ دەفـرۆشێ و دەگـەنێ
چ سـیـاسی چ بەرەی عـیـرفـانە
خـڕی بۆ پارەیە بۆ گـیـرفـانە
تۆ بڵـێی بۆ مـە پەیا بێ مـەردێک
تۆ بڵێی هەستی لە نێو کورد کوردێک
بڵێ من کـوردم و هـەر کـوردم ئەوێ
بەرجی ئەو مـافـە هەچی بێ ئەمـەوێ
تۆ بڵـێی یەک دی کـوشـتن بەس کـەن
تۆ بڵێی گوێ بە قسەی هیچ کەس کەن
تۆ بڵـێی تۆرەمـە گـیـر خـا قـەڵەمێ
بەروبووی هی قـــەڵەمی بکا هەڵەمی
خاڵی خۆم هەرچی لە پێش نووسرا بێ
دەبێ هـەر چۆنـی قـــەڵەم لـێی دابێ
ناهومـێـد نین لە بەزەت ئەی خـوایە
هەمی ئێـسـتـاکـە هەمی لە دوایە
کـۆکـە گـیـان ڕۆێم و جـا مـاڵئـاوا
ڕەبی تا هـەی لە جـیـهـان بی ئاوا

خاڵەمین پیاوێکی دیندار و پارێزگار بووە، بۆیە گەلێ لە هۆنراوەکانی ئاینییە و لە پارچە هەڵبەستێکیدا ستایشی بارەگای خوا و پێغەمبەر دەکا و لە خوا دەپاڕێتەوە کە لە گوناحی ببووریّ و لە دنیا و ڕۆژی پەسڵاندا بەزەیی پێدا بێ و لە مەرگ و ئەهریمەن دووری خاتەوە، بۆیە لە کوورەی دەروونێکی پڕ جۆشەوە دەڵێ:

خـــودا لێت دەپاڕێمـــەوە
ڕێم بدە بگـەڕێمـــەوە

دەنا قـوڕێ دەکـەم وە سـەر
ڕووی خـۆم بکەمـە کـێهـە دەر
هـەر دەرکـی تۆ پـەنـای مـەیە
هـەر ئەڵڵایـە خـودای مـەیە
مـحـەمـەدت پـێـغـەمـبـەرە
بۆ جـن و ئـینـسـان رابـەرە
قـورئـانە ڕێ پـیـشـانـدەرم
دە پـێـنـاوی دەنـێـم سـەرم
بە دڵ و گـیـان پەشـیـمـانـم
ئـارامـی بـخـەیە گـیـانـم
ڕووت و ڕەجـاڵ و بـێ بـەشـم
گـونـاهـبـارم، چـارە ڕەشـم
هـەرچـی کـردوومـە دەیزانـی
لە ئـاشـکـرا، لە پـەنـهـانـی
لە بـەزەتمان بـێ بەش مـەکـە
شـەیتـانـمان پـێ خـۆش مـەکە
لە دونـیـا و لە قـیـامـەتـێ
ڕوحـمـێک بە حـاڵی ئـۆمـەتێ

خاڵەمین ماوەیەک کە لە زێد و مەڵبەندەکەی دوور کەوتبووەوە، گەلێ پەرێشان و دڵتەنگ بووە و سەیر دەکا کە ستەمی ڕۆژگار بەرامبەر بەگەلی کورد لە شەڕدایە، بۆیە هەموو چەوسانەوە و بەملا و بەولادا ئاوارە و دەربەدەر بوونە، ئەوسا بەپارچە هەڵبەستێک یادی نیشتمان دەکاتەوە و لە جۆشی کوورەی دەروونێکی پڕ جۆشەوە دەڵێ:

لە زسـتـانـێ ڕەها بوو دڵ بەجـێ هات ئاخ و ئـاواتـی
بەهـارە و خـاکـەلێـوە ڕۆی بەخـێـر بێی بانەمـەڕ هـاتـی
زەوی خـەمـڵـیـوە سـەرپاکی هـەوا وەک رووحـە سـەرتاپا
دەجـا سـۆفی هەتا کـەی سـەر لە نێـو پێـخـەی خـەیاڵاتـی
ئـەوانـەی عـاشـقی روون باوەشی وان پڕ لە دڵدارە
ئەتۆش هـەر وا خـەریکی واهـیـمە و کـەشـفی سـەماواتـی

سەفی حۆری تەماشاکە بخوێنە زیکری لاحەولە
گەلی بێری ببینە یا بناسێ قودرەتی زاتی
بەچادر و چیغەوە کەوتوونە دەر ساحێب مەڕ و خێلات
دەڵێی هوڕای نیزامە کاڕ و کوڕی بەرخ و مالاتی
نەمێنم نابیەم سمکۆڵ و کۆڕەی ئەسپی سەرخێڵی
نەژیم نابینم ئێستا دیوەخان و داب و داهاتی
نە تاوڵی پڕ لە میوانی نە خزمەتکاری سالانی
غولامی دەس لەسەر گوێ خەنجەری بێ و چاوی لە ولاتی
بە باغی میللی و کافە و خیابانی ڕەزائیە
لە دڵ دەرناچێ سەیری شارۆیران و دەشتی شاماتی
بەبێ وی تاڵە کوێستان و خوسووسەن چۆڵە هەمزاوا
براکەی خۆشەویستم کاوسێن تۆش بۆیە وا ماتی؟
لەسەر جێ خێڵی خالم خێڵی کێ داخۆ هەڵی داوە
لە جێی تورجانی داخوا کێ دەکا سەیر و مولاقاتی؟
لەباتی زەمزەمەی دەنگی گرامافۆنی تاوڵی پار
ئەوێستێ قوولە قوولی بایزی داودە و حاجی هات هاتی
هەزار ئاغای فکۆڵی و گەنجی دیپلۆم و سیاسی باز
بەقوربانی سمێڵی خدرە گرۆێی پیاوی عێلاتی
هەزاران فۆرم و پۆزی خانمەکانی پاریس و ئەڵمان
فیدای دەسرۆکەکەی هەوری کچی کرمانجی دێهاتی
دڵم وەک بولبولی گۆیا دەخوێنێ ئاخ کە تێی ناگەم
هەوای سابڵاخە کەوتووەتە سەری یا لەند و خێلاتی؟
لەوێ هەر کەیف و کامە و کاری ئێمەش لێرە دەرجایە
خودایی عالەم و ئادەم چ بێ باک و مویالاتی
دەزانی «خاڵەمین» لۆمەی نەکەن گەر یار و دۆستانی
بە راستی دیتنی چادر و چیغی کوردستانە ئاواتی

خاڵەمین هەروەها وتمان پیاوێکی پارێزگار و خواناس بووە و بڕوای بەڕۆژی پەسڵان بووە، بۆیە بۆ بەردی سەر کێلەکەی ئەم چەند هۆنراوەی داناوە و لەوەدا بڕوای خۆی بەخوا و پێغەمبەری گەورەی ئیسلام و ڕۆژی دوایی دەربڕیوە و دەڵێ:

دەزانی خـاوەنی ئەو گـۆڕە کـێیـە؟
کـە وا بۆ فـاتیـحـایەک چاوەڕێیـە؟
برای خـۆتان و کـورد و خـاڵەمـینم
ئەگـەرچی ڕووسـیام ئیسـلامـە دینم
لەَ هەر لایەک خــودا هیــوا بڕاوە
بە غـــەیری تۆ پەنـایەکم نەمـــاوە
ئەمن کـوردێکی دیل و دابەشـی تۆم
لە دنیـا و ئاخرەت هەر چاوەشـی تۆم

سەرچاوەکان
١- کۆمەڵە هۆنراوێکی خاڵەمین کە لەم و لەو بیستوومە و نووسیمەتەوە.
٢- ژیننامەی خاڵەمین بەپێنووسی خۆی کە بۆمی نووسیوە.
٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەخاڵەمین.

## حەمە عەلی مەدهۆش

١٣٣١ - ...

حەمە عەلی کوڕی سۆفی حەمەی قوربانی کە نازناوی مەدهۆشە لە ساڵی ١٣٣١ی کۆچی لە سلێمانیدا لە دایک بووە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و پاشان لە لای مەلا مـیـرزای سنـەیی مـاوەیـەک قـورئان و کـتـێـبـە وردەڵەکـانی خـوێندووە و ئەوسـا چووەتە قـوتابخـانەی زانستـی و چەند سـاڵێک خـەریکی خوێندنـی زمـان و وێژەی عـەرەبی بووە و لە پاشـا دەستی لە خـوێندن کێشاوە و خـەریکی بەرگدروویەتی بووە و هـەموو دەمێکیش کـاتی خۆی بەخوێندنەوەی دیوانی هۆنەرانی کورد بەسەربردووە.

مـەدهۆش بەیەکێ لە هۆنەرانی کـورد دێتە ژمـار و زۆربەی هۆنـراوەکـانی لەسـەر شـێـوەی کـۆن و نوێ هۆنیـوەتـەوە و هۆنراوەکـانی گـەلێ شـیـرین و تەڕ و پـاراون. تا ئێـسـتـا چوار کۆمـەڵە هۆنراوی بەناوی: هەمـیـشـە بەهـار، شـیـرین، دڵی کـچـان، دڵی کوڕان لە چاپ داوە، هەروەهـا چەند چیرۆکێکیشی بەناوی (دڵ و گوڵ) و (سـەرگوڵ) و (نەریمان چی لێـهـات)دا نووسیون کە زۆر گرنگن.

مـەدهۆش سـەری کێشـاوەتـە درگـای هەمـوو چەشنە هۆنراوێکەوە: دڵداری، کۆمـەڵایەتی، نیشتمانی، بەتایبەت لە هۆنراوی دڵداریدا سەرکەوتووە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا دەڵێ:

ڕۆژێ وا ڕێکەوت کـە ڕێگەم کـەوتە مـاڵی یارەکـەم
دیم کـە وەسـتـاوە بەتـەنیـا نەونەمـامی گـوڵ بەدەم
پێکەنیم پێم وت دەمـێکە چاوەڕێی ئەم فـرسـەتەم
ئێستە تەنیای جارێ وا دەس پێشکەری ماچت ئەکەم

***

پێکەنی فـەرمـووی ئەزانی گـوایە من چیم لێت ئەوێ
گـەر هەلێکی وا بە سـاڵێ جـارێ بۆمـان هەڵکەوێ
تۆزێ ڕابوێرین بە خـۆشی ئاسـمـان پێی نانەوێ
مـاچ و دەسـبـازی لە بۆ دڵدار ئەبێ پرسی نەوێ
دەسـتی خـسـتـە گـەردنم ئینجـا وەرە دڵ بسـرەوێ

***

کـاتێ زانیم ئەویش سـووتاوە وەک من بەو گـڕە
پـەردەیی شـەرمی دڕیوە ئـەو دڵـەی هـێنـدە پڕە
جـۆشـشی عـەشـقم هجـوومی کـردە سـەر دڵ لەو گـوڕە
وا بـە سنـگی خـۆمـەوە تا ئەو مـەمکە خـڕە
مـەست و بێ هۆش بووین لە بەینمانا نەما چرپە و قرە

***

جـارێ تا هێـزم هەبوو بەو شەوقەوە تێر تێر گـوشـیم
دوایی سـەبرم کـرد کـە ڕەنگی ڕووی پەڕیوە تێ گـەییم
نـاڕەوا بوو هـێـنده ئـازاری بـدەم زۆر پـێ کـەنیم
بۆ ئەوەی دڵگیـر نەبێ لەم ئەزیەتە کـاتێ کـە دیم
ئەو لە من زیاتر گـوشـیـمی سـەیرە هێـزی لێ بڕیم

***

پاش ئەوە ڕامـان بوارد بەینێ بە یاری دوو بە دوو
شـێـوەیەکی بەزمی دڵداری لە ناوا هات و چوو
ئاخی هەڵکێـشـا لەپڕ فـرمـێـسکی کـەوتە ڕوو
پێی وتم دڵداری ژینی بێ سـەرەنجـامن هەمـوو
زۆر دەترسم ئێـمـە لێک ببـڕێین نەگـەینە ئارەزوو

***

ئاهەنگی هیوا، مرۆ ها وەسەر بێژنگەوە تا چاو بکاتەوە تەفروتوونا دەبێ، وە لە دونیایەکی وادا کە هیوا و ئومێد کەوتووەتە دەستی زۆر و ستەم، کام هاوەڵ هەیە کە وەکو ئەوین بێتە هاوەڵی مرۆ، ئەوەیە کە هۆنەر بۆ فەرامۆشی پەنا دەباتە ئەوین و بەدڵدارەکەی دەڵێ:

هەمــــوو رۆژێ لەبەر ســــەیری بتی ئەو بەژن و باڵایە
لەســـــەر رێیـــا ئەوەســـــتم من هەتاکـــو ئاوی پێم دایە
بەدوو چاوێ کــە شـــەوقی چاوەڕوانی ئەیتـــرووکـــێنێ
بەدوو چاوێ کـــە ســـرِی قـــووڵی لاوێتی ئەدرکـــێنێ
ســەرنجی رێ ئەدەم رێگە هەمــوو شـێوەی ئەوی تیـایە
وەکـــو دنیـــا لە ناو جـوانیی ئەوا تواێـــتـــەوە وایە
شنەی با باسی جـوانی ئەو بەگـــوێی مندا ئەچرپێنێ
هەمـــوو دەرکـــەوتنی شـــۆخێ دڵی من دائەخـــورپێنێ
بەڵام خــــورپەی تەواوی دڵ لەگـــەڵ هەنگاوی ئەودایە
کـــە ســـــەرتاپا لە ئاوازی بەهەشـــتی خـــواوە پەیدایە
بەڵێ کاتێ کە ئەو دەرکەوت ئیتر من بێ سەر و شوێنم
بەتیشکی خۆری جوانیی ئەو بەجارێ قوڵپ ئەدا خوێنم

توانای هۆنەریەتیی هەردی لەوانەیە کە پێویستی بەلاساکردنەوە نییە و دەتوانێ بەهەر جۆرێ هۆنراو بهۆنێتەوە، ئەو لە هۆنراوەکانیدا لە رەنج و دەرد و سزا و دووری و بێ هۆشی دەدوێ و لە سروە و سۆزی بەیان و لە هەوا و نەوای دەروون دەدوێ کە لە هەموو دڵێکدا شاررراوەتەوە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا دەڵێ:

بەدەستی خۆت کە جامت خستە سەر لێوت غەشیمانە
ئەگـــەر زەهـریشی تێـدا بێ گـوناهی خـۆتە بیـزانە
هەڵە یاخـۆ گـوناهـت کـرد لە کـاتێکا کـە بێ هـۆشی
ســـزا و تاڵاوی هەرچی بێ ئەبێ وەک بادە بینۆشی
ئەگـــەر پیـــاویت و ئەیزانی کـــەوا ئۆباڵی کـــردارت
لە ئەستـۆی وردی خـۆتایە ئیتـر بێ سـوودە هاوارت
چ ســـرِێکت لە ناو دڵدا حـــەشـــار داوە بەپەنهـــانی
کـــە چاوت چەشنی ئاوێنە وەها بێ پەردە درکـــانی

ئەزانم دڵ هەیە وەک مس کە ژەنگ دێنێ بەئاسانی
دڵی تۆ زێڕی تیزابە لە کوێوە ژەنگی هەڵهانی
هەتا ماوم لە دونیادا فریشتەی باخی ئاواتم
بەدڵ هەر چەشنی خەرمانە لە دەوری مانگی گۆناتم

ئەوا پارچە هەڵبەستێکی تری هەردی دێنین کە لەژێ سەردێڕی چەپکە گوڵێ بۆ ست فاتمە، هۆنیویەتەوە و ئەم پارچە هەڵبەستە لەگەڵ ئەوەدا پارچە هەڵبەستێکی دڵدارییە، بەلام لە ئەوپەڕی شیرینی و ڕەوانییەوە هۆنراوەتەوە، وەکو دەڵێ:

فاتمە دوو چاوی مەستت پڕ تەڵیسمی جوانییە
پڕ شەرابی خۆشەویستی و ئارەقی یەزدانییە
بەژن و بالاکەت نموونەی هەیکەلی یۆنانییە
لار و لەنجەت مۆسیقایە بەستەیە گۆرانییە
بووکی ڕازاوەی خەیاڵم گیانەکەم ست فاتمە
تاقە پرشنگێکی چاوت ئەوپەڕی ئاواتمە

***

گەرچی دڵداری لە خاکی ئێمەدا ئەفسانەیە
هەر بەتەنها بۆ کوڕی خاوەن تەلار و ئانەیە
گیانەکەم ئەما دڵی من لەو دڵە شێتانەیە
بێ ئەوەی هیچ شک بەرێ کوژراوی ئەو چاوانەیە
هەر بەتەنها خۆشەویستیت شک ئەبەم ست فاتمە
سەروەتم ناوێ بزەی تۆ ئەوپەڕی ئاواتمە

***

خۆشەویستی وا کە نامەی خوایە بۆ پێغەمبەران
بەرز و ناسک وەک هەناسەی پڕ گولاوی دولبەران
نەک وەکو حەزکردنی دینار و گەوهەرپەروەران
ئەو کەسانەی بۆ قرانێ چەندە دڵیان هەڵوەران
خەڵکی تر پارە پەرستی با بکا ست فاتمە
من بەتەنها تۆ پەرستی ئەوپەڕی ئاواتمە

***

زۆر کـــەڕەت هـانم ئەدا داخی دەروونی پڕ گـــڕم
بۆتی هـەڵڕێژم سکاڵای ناسکی گــەرم و گـــوڕم
داخـــەکـەم وەخـــتێ کــە دێمــە بەردەمت واقی وڕم
وام ئەشـــێـــوێنێ بەجـــارێ نایەڵی هیچ دەربڕم
بووکی ڕازاوەی خــەیاڵم گــیـانەکـەم ست فـاتمە
گــوێیــە بۆ ئەم ڕازە شل کــەی ئەوپەڕی ئاواتمە

سەرچاوەکان


١- ڕازی تەنیاییی هۆنراوەی ئەحمەد هەردی - بەغدا ١٩٥٧.
٢- باغچەی شاعیران ،نووسینی عەبدولعەزیم ماوەتی و عەبدولقادر ساڵح - بەغدا ١٩٦٩.


## حەمە ساڵحی دیلان

١٣٤٧ - ...

حەمە ساڵح، کوڕی مەلا ئەحمەدی دیلان، کە نازناوی دیلانە لە ساڵی ١٣٤٧ی کۆچی لە سلێمانیدا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و دەوری سەرەتایی و ناوەندیی هەر لەو شارەدا تەواو کردووە و پاشان لە کاری دەوڵەتیدا دامەزراوە و ئەوسا لەسەر کوردایەتی گیراوە و لە پاش ماوەیەک بەخشراوە و هاتووەتە سەر کارەکەی تا خانەنشین بووە.

دیلان بەیەکێ لە هۆنەرانی کورد دێتە ژمار و ئەو هەر لە منداڵییەوە حەزی لە هۆنراو کردووە و لە تافی جوانیدا دەستی کردووەتە هۆنراو هۆنینەوە و زۆربەی هۆنراوەکانی کۆمەڵایەتی و نیشتمانین و لە ڕاستەقینەدا ئەو یەکێکە لەو هۆنەرانەی کە گۆرانیی تازەی نیشتمانیی داهێناوە و لە هۆنراوەکانیدا لە ئاشتی و بەختەوەریی بنیادەم دواوە و حەز لە شایی و خۆشی و هێمنیی خەڵک دەکا.

دیلان لە پارچە هەڵبەستێکیدا بەبەهارا هەڵدەڵێ و سروشتی جوانی بەهارمان بۆ دەخاتە بەرچاو کە چۆن تارای پۆشیوە و گوڵاڵە پیاڵەی بادەی خوێنینی خواردووەتەوە و نێرگس لەشی شۆڕ کردووەتەوە و وەنەوشە کڕنۆشی بۆی بردووە و ئاوی چەم و ڕووبار بەهاژە هاژ کەوتووەتە ڕێ و خونچەی گوڵاڵەکان لە باخ و چیمەندا دەمیان کردووەتەوە و پێ دەکەنن و پەلەوەرەکان دەچریکێنن وەکو دەڵێ:

وا بەهـار دیســـــان تـارای ئەپۆشێ
گــوڵاڵە پیــاڵەی خــوێنین ئەنۆشێ

نێرگس ئەندام شۆڕ ڕەنگی زێڕینی
وەنەوشە کوڕنووش پەڕەی چین چینی
هاژە هاژەی ئاو، هاڕەی شەتاوان
بریسک و هۆڕی نزار و کاوان
ترَیق و هۆڕی خونچەی داری باخ
خوێندنی مەلی قەڵبەز و سەرشاخ
دەنگی شمشاڵ و بەستەی دڵفڕێن
تەنگ و چەڵەمەی زستان راو ئەنێن!
خونچەی درەختی ژیاوەی بەهار
شەریەتی لەسەر شەماڵی نزار
ئەو ئەڵێ شاباش لە گوڵاڵەی هەرد
ئەم ئەڵێ نەخێر بەشنەی بێ گەرد
گوڵان دێنمە لەنجە و هەڵپەڕین
ئەیانهێنمە گەشە و پێکەنین

***

دیلان لە هۆنینەوەی هۆنراوی دڵداریشدا دەستێکی باڵای هەیە و لە پارچە هەڵبەستێکدا کە لەسەر دێڕی «شیرین» هۆنیویەتەوە بەبەژن و باڵای دڵدارەکەیدا هەڵدەڵێ و ئەو بەتیشکی ڕۆژ و گەشەی ئەستێرە دادەنێ و لێوی بەهەنگوین دەچوێنێ و دەڵێ:

شیرین! بەستەی گوڵاڵەی سوور تریفەی مانگم
شیرین! گەشەی ئەستێرەی دوور گفتوگۆ و بانگم
شیرین! تیشکی ڕۆژی دەم کەل بۆ وێرانەی دڵ
شیرین! هاژە و جریوەی مەل بۆ وەنەوشە و گوڵ
شیرین! ئەو پەر جوانیی شێوەی نیگاری سروشت
شیرین! تۆ ئەو تاقە سێوەی کە فەرهادی کوشت
شیرین! تۆ بووی یەکەم بینین کارەبای نازت
چاو هەڵبڕین، زەردەخەنەت، سروەکەی ڕازت
لێی شێوانم تەلی تاری هەڵبەست و خەیاڵ
بووم بەو مەلەی بێ لانەیە و زامدارە و بێ باڵ

ئیتر نە مانگ نە ئەستێرە نە گزنگی زەرد
نە فووی شمشاڵ نە قاسپەی کەو لەم بەردو لە بەرد
نە بریقەی شەونمی سەر چیمەنی قەراغ
نە خەندەکەی تازە خونچەی درەختانی باغ
نە کەروێشکەی دەغلی بنار نە هاژەی چاوە
نە ئەو بۆنە سەرمەستکەرەی چنوورە خاوە
نە کورنووشی سەوز و سووری پەلکەزێرینە
نە بەهارێ کە خەریکی عیشوە کرینە
نە تەبیعەت نە جوانییەکەی نە فەڕ و نرخی
جارێکی تر وای تەما بێ و خۆش بکا مرخی
وابزانی بەپەرەی گوڵ بەسیحری جوانی
راچڵەکێنێ ئا ئەو دڵەی کە تۆی میوانی
چونکی لەگەڵ هەر کامێکیان بەراورد بکرێی
تۆ پێی بەرزی بەرەو ئاسمان بەسەریا ئەنێی
ئەوسا منیش یا داخی دڵ تێر تێر ئەرێژم
لەو هەنگوێنەی گوڵی لێوت تۆزێ ئەچێژم
یا وەک بوڵبوڵ هەر بەتەمای گەیین بەئاوات
بەرەو هیوا باڵ ئەکوتم بمبات و بمبات

دیلان زێد و مەڵبەندەکەی خۆی خۆش دەوێ، ئەو مەڵبەندەی کە باو و باپیری تێدا ژیاون، ئەو مەڵبەندەی کە بەخوێنی ئاڵی لاوان پارێزراوە، ئەو مەڵبەندەی کە وەکو بەهەشت وایە و هەموو جێ و شوێنێکی پڕ لە کێو و ماهـ و ڕەوەز و دار و دەوەنە و هەموو چەشنە پەلەوەر و وڵساتێکی تێدا دەژی و جێی پشوودان و حەسانەوەی گەلی کوردە، وەکو دەڵێ:

کوردستان بەهەشتی زەمین
جێی تێکۆشان و ڕاپەڕین
مەڵبەندی کاوەی قارەمان
کوردستان، کوردستان

***

ئەی نەتەوەی کوردی دلێر
رۆڵەی نەبەرد و بێچووە شێر
هەستە هەستان دەرمانە بۆ
دەرد و ئازاری جەستەی تۆ
کوردستان، کوردستان

***

وا نەورۆزە جەژنی گەلە
ئاسۆ ڕازاوەی دەم کەلە
با نەورۆز و بەهاری کورد
پێ گەیێنین بەدەست و برد
کوردستان، کوردستان

بەرەی مرۆ هەموو وەکو یەکن و هیچ تۆفیرێکیان نییە، ڕەش، سپی، زەرد، سوور هەموو مرۆن و بەهەر زمانێک بدوێن تۆفیرێکیان نییە کەچی ئیمپریالیزم تۆفیر دەخاتە نێوانی نەتەوەکان بۆ ئەوەی خۆی بتوانێ لەم جیاوازییە کەڵک وەرگرێ و بەسەر خەڵکدا فەرمانڕەوایی بکا و دیلان ئەمە بەکردەوەیەکی ناشیرین دادەنێ و دەڵێ هەموو دەبێ وەکو برا ژیان بەرینە سەر، وەکو دەڵێ:

پیستم ڕەشە وەک شەوەزەنگ
لێوم ئەستوور لچم زەقە
نیگام ماتە وەک گۆمی مەنگ
بزەم نەرم و سەرم ڕەقە
من ئێستاش لە هەندێ جێگا
ڕەشیم مایەی قێز و بێزە
لەم کۆلان بێ و لە ئەو ڕێگا
سپی لێم دوورەپەرێزە!
بەڵام من ئیمڕۆ شێرانە
پێم لە زەوی گیر کردووە
ئەنەرێنم دلێرانە
زراوی سپیم بردووە

من له کۆنگۆ یا له کینیا
ئەڵێم وەک سپی ئینسانم
دەنگم چوو بۆ بنی دونیا
ئیتر خۆم خاوەن فەرمانم

***

من ڕەنگم زەرد و لووت پانم
ڕووم پڕ بوو له لۆچ و چرچی
تفت و تاڵ بوو گوزەرانم
بەری ژینم هەر بەکرچی
دوژمن ئەیبرد منی نەخۆش
جێی زۆربەم بەندیخانه بوو
دیلی ڕژێمی خۆفرۆش
بەشم توانج و تانه بوو
بەڵام ئیمرۆ منی ڕەنگ زەرد
خۆم خاوەنی کاروبارم
سکم تێره و دوورم له دەرد
سەرفرازە لادێ و شارم
من بووم له شەش یەکی جیهان
ئاواتم گرته باوەشم
ڕەگی دوژمنم هەڵتەکان
بەزەبری شۆر و شۆڕشم
منم له چین من ئینسانم
من ڕێکخەری ژیانم
فێرکردنه تێ کۆشانم
خۆم گەورەی نیشتمانم

سەرچاوەکان


١- پایزی جاران، هۆنراوەی حەمەساڵحی دیلان – سلێمانی ١٩٧٣.

٢- شەڕ و ئاشتی هۆنراوەی دیلان – سلێمانی ١٩٥٤.

٣- کوندەپەپووی شەڕ، هۆنراوەی دیلان – سلێمانی ١٩٥٤.

٤- دیلان شاعیر و ئازادیخواز، نووسینی دڵشاد عەلی – بەغدا ١٩٨١.

## کامەران موکری

١٣٤٩ - ١٤٠٦

محەمەد، کوڕی ئەحمەد تاها کە بەکامەران موکری ناسراوە لە ساڵی ١٣٤٩ی کۆچی لە سلێمانیدا لە دایک بووە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و ماوەیەک قورئانی پیرۆز و ڕێزمانی عەرەبی و پەڕاوە وردەڵەکانی فارسیی خوێندوون و لە تافی جوانیدا گەلێ هۆنراوی هۆنیوەتەوە و چووەتە ڕیزی ئازادیخوازەکان و لە پاشا لە لایەن دەوڵەتی پادشایەتییەوە گیراوە و گەلێ ئەشکەنجە و ئازاری دیوە و لە پاش پووچبوونەوەی ئەو دەوڵەتە ئازاد بووە و لە کاری میریدا دامەزراوە و سەرئەنجام لە ساڵی ١٤٠٦ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیواندا نێژراوە.

کامەران موکری بەیەکێ لە هۆنەرانی ئازادیخوازی کورد دێتە ژمار، ئەو لە بۆتەی ژیانی سەختی کۆمەلایەتی و نەتەوەییدا بەگیانێکی پاکی کوردانەوە پەروەردە بووبوو، بۆیە هەموو دەم خەمخۆری گەل و نیشتمان بوو، و لە بەرابەری زۆرداران و ستەمکارانا ڕادەوەستا و، وە هۆنراوەکانی ئەو سەدان لاوی کوردیان هێنایە جۆش و خرۆشەوە. تا ئێستا چەندین کۆمەڵە هۆنراوی بەناوانی: « دیاری، ئاگر و ژیلە، گوڵ و ئەستێرە، گوڵاڵە سوورە، ئاوات و ڕەنج» چاپ و بڵاوبووەتەوە.

زۆربەی هۆنراوەکانی کامەران نوێن و لە هۆنراوەکانیدا لەو شتانە دواوە کە لە ناوجەرگەی کۆمەڵەوە هەڵقوڵاون. ئەو لە بارەی پیاهەڵدان و وێچواندنیشەوە دەستێکی بەرز و باڵای هەبووە بەتایبەت لە: «هۆنراوی شەپۆلی زێڕ»دا باسی جوانیی سروشتمان بۆ دەکا و لەوەدا دیمەنی چیا و کێوە ڕەنگینەکان و داوێنی کەژی ڕازاوە بەنێرگس و گوڵمان بۆ دەکا و ئەوسا دەمانباتە سەر ئەوەی چۆن گزنگ لە ناو کۆشی چەمدا ئارام دەگرێ و ئەوسا گزنگەکانی دەدا لە چەم و دۆڵەکان و بەهەڵهاتنی خۆر ئاسمانیش ئەستێرە زێوینەکانی ڕووی دەسڕێ و ئیتر بەچاو نابینرێن و ئەوسا دەمانباتە سەر دیمەنی شەو بۆ خنجیلانەیی کە لە سێبەردا پێکەنی و سەری هەڵبڕی، چونکە شەوەزەنگ بەسەرچوو بوو و، ئەوسا خۆرهەلات و تیشکەکەی سزگێنی بەیانیان بەهەمووان ڕاگەیاند.

ئەو گراو و سەوداسەری دەشت و چیای ڕەنگینی کوردستانە، گراوی ئاسمانی شین و ئەستێرەی زێوییە، گراوی بەندەنی مەڵبەندەکەیە، ئەو مەڵبەندەی کە زۆربەی گەل بەهۆی زۆر و ستەمی ملهۆرانەوە ڕەش و ڕووت و ڕەجاڵن و بۆ بەختی ڕەشی خۆیان دەناڵن و بەملاو بەولادا عەوداڵن، وەکو دەڵێ:

چیای ڕەنگین...
داوێنی کەژ، نێرگس و گوڵ
گزنگ لە ناو کۆشی چەما، ئارامی گرت
ئاسمانی شین...
ئەستێرەی زێوی ڕووی سڕی
شەوبۆیەکی خنجیلانە
لە سێبەرا
پێکەنی سەری هەڵبڕی
بۆ تیشکی خۆری گەرموگوڕ
دڵۆپی قەڵبەزەی وەک چوڕ
چاوی هوزار
شنەی شەماڵ، سروەی نازدار
چەمی بزێو
***
هوزاری چەم
فڕی، فڕی تا هەور و تەم
خۆر، لە ناو پەلی درەختا
وەک بگەڕێ بەدوای بەختا
سەرەتاتکێی ئەکرد لە گوڵ
کەوتە شنەشن پۆپی چڵ
بەردی کەنار خۆیان ئەشت
ئاوی خۆر مرواریی ئەڕشت
شەونم لە (خۆر ماچ کردنا)
زەرد هەڵگەڕا،
لە چیمەنا پۆری نەرمین
بەلەنجەولار، ڕەوتی شیرین
چیای ڕەنگین
پەڕەی گوڵاڵەی ناسکۆڵە

شەماڵ هێنابووی، لەو دۆڵە
تاڵ تاڵی گوڵی تەڕی خاو
گەڵای پاراو
خونچەی تەڕ، بەشەونم و ئاو
دایان پۆشیبووم وەک پەرَی
چرۆ، لە جێی خۆی ئەوەری
چاوم لێک نابوو، گوڵی سوور
لە دەورم فەرشی بێ سنوور
پەنجەی هێنا،...
کچێکی جوان
نەرم و نیان
پێڵۆمی جوولان بەنەرمی
سەرنجی دامێ بەگەرمی
وتی: گیانە،
وتم: ئەی فریشتەی جوانی
(مژدەی خۆشی و کامەرانی)
باڵی ئاڵان لە گەردنم
گەردنی...! کاڵ وەکو هەتاو!
پرچی زەردێکی نەرم و خاو...
چاوی کانیی هەستی شیرین
پرشنگی وەک ئەستێرەی شین
وتم خۆشم ئەوێی بەدڵ
وەکو شەماڵ بۆ پەڕەی گوڵ
وتی: کوا بەرگی ڕەنگاوڕەنگ
: (منی هەژار بەرگم شیتاڵ)
وتی: ئەی گۆرانی و ئاهەنگ
وتم: کسپەی دڵ و دەروون
- : کوانێ ئاڵتوون؟

وتم: نیمە!

– : کوا کۆشکی بەرز و کوا تەلار؟

وتم: کۆشکم وا لەوێوە منی هەژار،

پەنجەم درێژ کرد بۆ چەمێک

کۆختێکی تاریک و نووتەک

زریکانی و ڕووی وەرگێڕا

ئەو جامە ئەشکەی دای نابوو

پیاما ماڵی (قلّپ) ڕژا

خۆی هاوێشتە شەپۆلەوە

(شەپۆلی زێڕ)

دڵی کرد بەقوربانیی ئەو

لە بیرم چوو، وە بوو بەخەو

کامەران لە هۆنینەوەی هۆنراوەکانیدا گەلێ وشەی پەتیی کوردیی بەکاربردووە و لە بەکارهێنانی وشەدا شارەزایەکی تەواوی هەیە و وشەکانی لە جێگەی خۆیدا بەکار دەبا، با چاوێ بخشێنینە ئەم هۆنراوانە کە لەسەر دێڕی دیاریی نەورۆز هۆنیونەتەوە، ئەو نەورۆزەی کە کورد شانازیی پێوە دەکەن و کاوەی کورد بەسەر دوژمنا سەرکەوت، وەکو دەڵێ:

بۆ ڕۆژی نەورۆز سێ چەپک

لە نێرگس و گوڵی ناسک

ئەکەم بەدیاریەکی جوان

بۆ گەلی کوردی قارەمان

(گوڵاڵە سوورەی پارچەی دڵ)

(هی دڵێک کە کەوتە ژێر گڵ)

دڵی ئەو لاوەی بۆ میللەت

جەڕانیان لە گەردنیدا پەت

چرای گیانیان کوژانەوە

شەماڵ جەستەی شەکانەوە

ئەم چەپکە گوڵەی من پێشکەش

بەوەی (گڕ) دەگرێتەوە باوەش

بەو لاوانەی کە، بۆ وەتەن
لە خەباتا پشوو، نادەن
(بۆ ژینی کورد، بوون بەپێشەنگ)
بوون بەمەشخەڵی شەوەزەنگ

***

نێرگسی دەشتی هیوای ژن
کە، بۆ، ڕۆژێک، تێ ئەکۆشن،
جەرگیان بەسەر، دڕکا، نەدەن
ئەگریجە، دەسکەنە، نەکەن
ڕۆژێک بێ کۆرپەڵەی ڕووخۆش
- زۆردار - دەیفرێنێ لە کۆش
ئەم چەپکە نێرگسەی ژیان
پێشکەش بە تۆ، بێ دایە گیان
بەتۆ و بەو ژنانەی دوژمن
کوڕە، گەنجەکانی کوشتن

***

گوڵە زەردی کوڵمی هەژار
کە (وەریوە) بەقامچی و دار
پێشکەش بێ، بەهاوڕێی پاڵە
بەوەی ژیانی لا تاڵە
بەهەژارانی شار و دێ
بەبێ کەسانی سەرە ڕێ

***

ئەم گوڵانە، ئەم سێ چەپکە
کە پەڕەیان، تەڕ، ناسکە
لە یەک دەشتا، یەک چیمەنا
لە ناو دەروونی وەتەنا
هەر لە یەک جۆگەلەی یەک جوێن
مریویانە، دڵۆپی خوێن

***

دوای پێـــشکەشکردنـی دیاریم
ئەڵێم (بێ شک) کـــوردەواریم
ئەی نـەورۆزی هـەزار ســـــاڵـە
لێی هـەڵدێت، شـــەبەقـــێک ئاڵە

کامـەران هـەروەها لە دەربڕینـی سـەرنجی ورد و وشـەی جوان و واتای قـووڵدا دەسـتێکی بەرز و باڵای هـەبووە، وەکو لەم هـۆنراوانەدا ئەوەمـان بۆ دەردەخـا کە بای شـەمـاڵ لقوپۆپی دارودرەختـەکان دەلەرێننەوە و گزنگی هـەتاویش خۆی دەکێشێتە نـاو بنی درەختـەکەدا کە دەتوت بەدوای بەختـا دەگەڕێ و گەڵاکانی لە خۆشییا دەکەونە سـەما و هـەڵپەرکێ، وەکو دەڵێ:

خــــۆر لە نـاو پـەلی درەخـــتـــا
وەک بگـەڕێ بەدوای بـەخـــتـــا
ســــەرەتـاتکێی ئـەکـــرد لە گــوڵ
کــــــەوتە شـنـەشـن پۆپـی چڵ

کامـەران یەکێ لەو هۆنەرانەیە کە لە قوتابخـانەی سروشـتی کوردسـتاندا پـێ گەیشـتووە، بزانن چەندە جوان بەبەهـارا هـەڵدەڵێ و جوانییـەکانی بەهـارمان پێ پیشان دەدا و تیشکی خۆر لە دەمەدەمی بەهـارا وەکو زێڕی خـاو بەناو ئاوی چەم و ڕووبارا دەتوێتـەوە و گوڵەکان سەر لە خاک دەردەهێنن و چیا و دەشت و دۆڵ پڕ دەکەن لە بۆ نوبەرامە، وەکو دەڵێ:

بەفـــری خـــەمگین توایەوە ڕەنگی گــوڵم ناچێــتــەوە
خـونـچـە تارای ســووری پۆشی و گـەردنـی ناشکێـتـەوە
وەک چلوورەی ڕۆژی زســتـــان ئەم گــوڵەم نـاتوێتـــەوە
تیــشکی خــۆر ورد، وردە هـەر وەکــو ئـاڵتــوونی خـــاو
توایـەوە ناو ئاوی چەم، هـەســتـــا لە چەم پرشـنگی ئاو

***

تاشـە بەفری لووتکە هـەر وەک، لەشکرێک (بێت و) بەزێو
تیــشکی زێڕینـی بەهـار، دوای کـــەوتووە بیکا بەزیو
بیـــرژێنێــتـــە دەمی چەم، ڕای بدا تا جـەرگی شـێــو
وا گـــوڵاڵە شـــــەونمی نواند بـۆ مــــەلانی نـەرم و نـۆڵ
بوو بەئـاهـەنگ لەو چیـایەی دوێنـی مـات بـوو چۆڵ و هۆڵ

***

وردە بەفری سێبەری مەڵبەندی بەرز تاسێکی سوور
نەرمە پرشنگی گزنگی تێکەڵاو، وەک وردە نوور
هەر ئەڵێی تاسێکی ئاڵتوونە و لەسەر گەردن بلوور
سوخمە (گوڵ) سەرپۆش تەمی نەرمی تەنک
بوو بەملوانکە ملی کەژ، ئاوی بەفراو تک بەتک

کامەران بەپێچەوانەی هۆنەرانی کلاسیک هۆنراوی دڵداریی زۆر کەمە و زۆربەی هۆنراوەکانی سروشتی و کۆمەلایەتی و نیشتمانین، دیارە لاسایی هۆنەرانی پێش خۆی نەکردووەتەوە و کەمتر وشەی بێگانەشی بەکاربردووە و بەڵکو زۆربەی ئەو وشانەی کە بەکارهێناون کوردییەکی پەتین و بەزۆرەملێش هۆنراوی نەهۆنیوەتەوە و هۆنراوەکانی تا بڵێی شیرین و ڕەوانن و ئەمەش چەند هۆنراوێکی تری کامەران کە دەڵێ:

ئەی کورد گیانی خۆم لەلا شیرینە
وا ئەیدەم بە تۆ، نەڵێی بەخشینە
چونکە هی خۆتە کوا گیانی منە
تۆ نەبی ژینی ئێمە مردنە
با ئەم لەشەی من بێت بەخۆڵەمێش
گلێنەی دوژمن بهێنێتە ئێش

***

توانەوەی سەهۆڵ، گەشانەوەی گوڵ
لەرەی شێنەیی گەلا و پۆپی چڵ
بەتەنیا گەرمی و جۆش نادەن بەدڵ
کاتێ دڵی من دەگەشێتەوە
کە بەفری خەمی کورد بتوێتەوە

***

ئاگر بەنەختێ ئاو کوژایەوە
گوڵ بەبای پایز سەری نایەوە
بەڵام ژیلەمۆی تێکۆشانی کورد
دوای هەزاران ساڵ هەڵگیرسایەوە

***

کەوتوومە ڕێگا لەگەڵ کاروانا
پاداشتم ناوێ لە تێکۆشانا
تا دڵ لێ بدا و خوێنم تیا ما بێ
بۆ کورد ژیانم هەر ئەبێ وابێ
بەسووتاندنم ڕێگە ڕۆشن بێ
با ئاگر بەشی ئەم لەشەی من بێ

***

ئەی خاڵۆ گیان من ڕەنجبەرم
بۆیە ئێجگار کوردپەروەرم
با هەر گۆرانییەکەی جاران
بڵێینەوە بۆ کوردستان
(ئەو کەسەی لە مردن ترسا)
(لە کاروانی خەبات جێما)

کامەران جگە لە هۆنینەوەی هۆنراو، گەلێ چیرۆکیشی نووسیوە کە لەوانەدا بۆمان دەردەکەوێ تا چ ڕادەیەک هونەری تێدا نواندوون و لەمەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە توانایەکی بەهێزی لە چیرۆکنووسیدا بووە و یەکێ لە چیرۆکەکانی ئەو ناوی کۆتەرە خەڵووزێکە کە زۆرداری و ستەمکاری ئاغا دەگەیەنێ و هەروەها وێنەی دارکاریکردنی ئەو لاوەیە کە لە ڕووی ئاغەدا وێستا بوو و، کاتێ داوای لێ کردبوو کە ڕێگری و جەردەیی بۆ بکا و خەڵک ڕووت کاتەوە، ئەویش ملێ پێ نەدا، ئەوەبوو نۆکەرەکانی هان دابوو کە بەقەمچی تێی بەربن و لە پاشانیشدا کەندەلانێکی بەسەردا دەرووخێنن تا شوێنەواری تاوانەکەیان بشارنەوە. وێنەیی تری ئەم چیرۆکە لە ماڵی مام حەسەنەوە دەست پێ دەکا و ئاغە دەیەوێ کچەکەی مام حەسەن بۆ ڕەسووڵی گزیری بخوازێ و ئەم ڕەسووڵە دوو ژنی تری خۆی کوشتبوو لەسەر شتی بێ نرخ، مام حەسەن کە ئەمەی بیست بڕیاری دا سەری خۆی هەڵگرێ و دێیەکە بەجێ بێڵێ، بەڵام پیاوەکانی ئاغە بەمەیان زانی و ئەو شەوە ماڵەکەی مام حەسەنیان سووتان و بەم جۆرە کۆرپە ساواکەی مام حەسەنیش بووە کۆتەرە خەڵووزێک. ئەمەش دەقی چیرۆکەکەی کامەران کە دەڵێ:

«قامچی بۆ جێییەک ئەگەڕا لەسەر پشتی کە نەیدیبێت، بەڵام نەبوو، مەچەکی قامچی بەدەستەکان بەجۆرێ شل بووبوو لەوانە بوو بکەوێتە خوارێ سەری ئەو بەسەزمانە ئەمەندە هەڵتۆقی بوو بەجارێ، هەموو سەری هەڵتۆقی بوو. لە دۆڵێکی قووڵا، لەناو باوەشی چەند

کەژێکی لووت بەرزا، لە کاتێکدا ڕۆژ هێشتا هەر لە خۆ کوتانا بوو تا خۆی بگەیێنێتە لووتکە و هەڵبێت. لە دۆڵێکی قووڵا دوور لە ئاوایی... ئەو بەسەزمانەیان سزا دەدا. بەجامانە شرەکەی خۆی هەردوو دەستیان لە پشتەوە بەستبووەوە. ئەمەندە بەدار ماڵرابوو بەتەپڵی سەریا، هەردوو چاوی ئەبڵەق بووبوون، کەفی دەمی لەگەڵ خوێنیا بەتێکەڵاوی دەڕژایە بەردەمی و قوڕی دەگرتەوە. ئەو قڵیشە بەردە نەبووایە کە هەر دوو ئەژنۆی هاڕاوی تێ ترنجابوو بێ گومان قاچی دەمێ بوو دەپەڕی. لە دۆڵێکی قووڵا. لە دارستانێکی کپی چڕا. ئەو گەنجە جووتیارە بەسەزمانەیان بەو دەردە دەبرد، دار لە دوای داریان تیا دەشکانەوە و قامچی لە دوای قامچیان تیا دەپچڕان. وەک کپی دۆڵەکە، ئەویش دەنگی کپ بووبوو... نووزەی لێوە نەدەهات. خوێنی بەهوروژم لە پشتی دەڕژا. لەگەڵ زیرەی قامچیدا خوێن لە بڵق و ئاوساویەوە فوارەی دەبەست. بەرە بەرە ڕۆژ نزیک دەبووەوە لە لووتکە تا هەڵدێت شەو لەگەڵ سزای ئەو هەژارەدا تێکەڵ دەبوو لە خۆی دەدا و خۆی دەکوشت و خۆی دەشاردەوە.

***

بوەستن با نەتانکوژین.

ئەم دەنگە ئێمەی وەستان. هاوڕێیەکەم ڕووی تێ کردم و لێوی هەڵقرچان، منیش تێی گەیشتم کە مەرامی ئەوەیە ئێمەش بەو دەردە دەبەن. لوولەی دوو سێ تفەنگ ڕووی تێ کردین، لەو دۆڵە قووڵەدا دەنگێ وەک گوللە شریخەی هات و ناڵانی: نیازتان چییە؟ دەتانەوێت ڕزگاری کەن. ئێمەش هیچ ورتەمان لێوە نەهات. سمێڵ شۆڕێکی لەش نیشتووە سەر ئارەق، لێمان نزیک بووەوە وتی: ڕووت بنەوە.

هاوڕێیەکەم کە لادێییەکی گەنج بوو و نیازی وابوو ڕووت نەبێتەوە... بەڵام من وام بەباش زانی ڕووت بینەوە چونکە پیاو لە جێی وادا کە هیچ چارە و دەسەڵاتی نەما، جلەکانی بکا بەقوربانی گیانی نەک گیانی بەقوربانی جلەکانی. ڕووت بووینەوە.

سزاکێشە دارکاری کراوەکەیان کردەوە، زۆر هەوڵیان دا ڕاستی کەنەوە و بهێننە سەر پێ، بەڵام بێ سوود بوو. چونکە هەر لەو ساتەوە کە دەنگی نەمابوو... مردبوو بردیانە نزیک چاڵێکەوە و لەقەیەکیان لێ دا و کەنگەلانێکیان بەسەرا ڕووخان

ڕۆژ سەری لەکەل هێنایە دەرێ و ئەو دۆڵە قووڵە کەمێک ڕووناکتر بووەوە. من و هاوڕێکەم کەوتینە ڕێ. هاوڕێیەکەم بەجامانە چڵکنەکەی فرمێسکەکانی سڕی و وتی: بەگریان هیچ ناکرێت دەبێ تێ بکۆشین... ئینجا ڕووی کردە ڕۆژ وتی: ئەوانە خۆیان بەکوڕی ڕۆژ دەزانن، بەڵام ڕۆژ نازێت... منیش چمکێکی پشتێنەکەم گرت و دەموچاوی

بەفرمێسک نەک هەر تەڕبوو بەڵکو نەرم بووم پێ سڕی. هاوڕێیەکەم وتی: ئەو کوڕە دەناسیت کە بەو دەردەیان برد؟ وتم نەء بەڵام بۆچی وایان لێ کرد، وتی: لەسەر نەء.

– لەسەر نەء

وتی: بەڵێ ئاغا فەرمانی دابوو کە ئەو نەوجەوانە ببێتە چەتە و ئەو گەروو دۆڵەی بۆ بگرێ و خەڵکی ڕووت کاتەوە و بیانکوژێت... ئەویش وتی نەء... ئەوە ناکەم... جا ئەوەبوو پاداشی نەء...

لەگەڵ شنەی شەماڵ و دەنگی مەلا گەیشتینە ئاوایی.

***

چووینە ماڵی مام هەسەن... ماڵی مام هەسەن تەنیا ژوورێکی تاریک بوو. لە قوژبنێکی ژوورەکەدا ژنەکەی مام هەسەن بەدەستێکی سنگی دادەپۆشی، چونکە جلی بەبەرەوە نەبوو، وە بەدەستەکەی تریشی بێشکەی مناڵەکەی ڕادەژەن. خاتوون بەدەم لایلایەوە فرمێسکی دەڕشتە سەر دەسە نەرمەکانی ساواکەی وە هەر لەگەڵ دڵۆپێکدا و جارێک ئەو مناڵە بەسەزمانە ڕادەپەڕی.

لە قوژبنێکی تری ژوورەکەدا کچێک دانیشتبوو چۆکی خۆی گرتبووە باوەش و خۆی ڕادەژەند. ئەو کچەکەی مام هەسەن بوو (خانم). خانم هەردوو چاوی بڕیبووە ئێمە وەک ڕزگارکەری بین لە سزایەکی یەجگار سەخت. خانم جوانییەکی بێ ئامان لە ژێر چڵکی دەموچاوی و لێوی هەڵقرچاوی و چاوی خەم تیا شکاوی و پێی تەپاڵاوی کرێشاویا خۆی مەلاس کردبوو. کچێک بوو لە تافی گەنجیا... پەنجەکانی لەگەڵ زبریشیان لە زۆر ئیشکردنا ڕێکوپێکترین پەنجەی ناسکی کچۆڵەی دڵفرێن بوو. لەولاشەوە مناڵێک دانیشتبوو، وا دیاربوو لەوە وەرز بووبوو چڵمەکەی بسڕێ، یان کڵاوە شڕەکەی لەسەر چاوی لابەرێ، چونکە چڵمەکەی تا ناودەمی هاتبوو کڵاوەکەشی تا سەر چاوی. مام هەسەنیش چاوی بڕیبووە بنمیچە ڕەشەکە و دەسی دەهێنا بەڕیشە ماش و برنجەکەیا وەک سەرکردەیەک بێت و بیر لە ڕزگاربوونی لەشکرە ئابڵووقەدراوەکەی بکاتەوە.

مام هەسەن وتی: هەر تا شەوێ سەلامەت بین ئەوسا، کارێکی وا دەکەین بۆی دەرچین. سەر دەرکەین ماڵ بسیارە – کە مام هەسەن ئەمەی وت لەگەڵ ئەو هەموو خەمەی خۆما... پێکەنینم دەهات... چونکە ماڵی چی؟ ماڵی چی بسیار بێت. ماڵ و ناوماڵیان هەر کۆیانە شڕێکی کەرە شینی تۆپیوو چەن پەڕۆ شڕێک و لبادە شڕێک و لەگەنێکی ژەنگاوی و هەندێ شتی لەوانە بێ نرختر بوو. مام هەسەن بۆیە نیازی هەبوو کۆچ بکات، چونکە ئاغا فەرمانی دابوو کە خانمی مام هەسەن، گەنجی جوان بدرێت بەڕەسووڵی سەرکاری.

ڕەسووڵ کێیە؟ درندەیەکی بەد فەساڵی کونج کونجی شەلی پیرە... ڕەسووڵ ئەو پیاوەیە کە هەموو ئاوایی دەزانن لەسەر گۆزەیەک کە شکابێت یان بزنێک قاچی وەرگەڕابێت، یان کاسە دۆیەک ڕژابێت دوو ژنی خۆی کوشتووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەش کە قسەی خۆشی (وەحە و چفە و بۆگەنە)یە و لەجیاتی هەموو ڕووخۆشییەکیش مووچەی دارکاریی هەیە بۆ ژنەکانی. ڕەسووڵ: پیس، دڵ پیس. ڕەسووڵ: کەرتر، جنێوفرۆش، نەزان دو، زۆردار بوو. ئا لەبەر ئەوە بوو ئەو هەژارانە دەیانویست ئەو جێیە بەجێ بێڵن کە باو و باپیریان چاویان تیا کردووەتەوە... ئەو جێیە بەجێ بێڵن و خۆیان بەدەم لافاوی نەبوونی ئێجگار نەبوونی و برسیەتی و یەجگار برسێتی و ترسی یەجگار ترس و سزای یەجگار سزاوە.

شەو باڵی ڕەشی وەک واشە دا بەسەر دێدا، ئەستێرەکان زۆر بەگورجی دەجریوانەوە، وەک چرپە چرپ بکەن دەربارەی مەسەلەی مام هەسەنی هەژار کێوەکان بێ دەنگ و مات چۆکیان دادابوو، هەروەک بیر لە زۆرداری و سزای ئەو هەژارانە بکەنەوە. ئاوەکان ناڵەناڵیان دەهات هەروەک ببۆڵێنن و هەڕەشە لە زۆرداری بکەن.

سەگەکانی ئاوایی لوورەی پڕ بەزەییانەیان لە لالانەوە دەچوو. شەماڵ دەسی دەهێنا و بەئەگریجەی درەخت و بەڕوومەتی گوڵا وەک دڵخۆشییان بداتەوە لەم ژیانە تاڵەدا. درەختەکان دەشنانەوە هەروەک سەری پەستی ڕادەوەشێنن لە داخی ئەو هەموو زۆردارییە. بووکی سروشت مات و غەمگین بوو هەروەک (خانم)ی ئێمە.

لەپڕ... لەم کاتەدا... ناڵەی گوللەیەک هات...

لەپڕ... لەم کاتەدا ماڵی مام هەسەن ئاگری تێ بەربوو... ئاگری تێ بەربوو لە هەموو لایەکەوە.

هەموو شپرزە بووین، شڵەژاین... ڕامان کرد... لە ترسی گوللە خۆمان دایە پاڵ بەردەوە، خانوو کوڵوکوێ دامردەوە... سووتاو بوو بەخۆڵ. لەم کاتەدا... لەم کاتەدا کە خانوو ئاگری تێ بەربووە و دووکەڵ بەرەو ئاسمان دەکشێ، لەم کاتەدا زریکەی گوللە و هاواری ژنان و دەنگە دەنگی خەڵکی و گریانی پیرێژنان و منداڵان تێکەڵ یەک بووە، دەنگێک، دەنگێکی بەسۆزو یەجگار بەسۆز، ئێجگار جەرگبڕ، جارجار جەرگی دەنگەدەنگی دەدڕێ و خۆی دەدا لە گوێ، ئەو دەنگەش دەنگی دایکێک بوو هاواری دەکرد (مناڵە ساواکەم، ئاخ بمگەنێ، هاوار کۆرپەکەم سووتا، فریاکەون).

چەن مناڵێکی تریش لەگەڵ مام هەسەندا سووتان... کوڵ و کۆیان دامردەوە و بوون بەژیلەمۆ، شەماڵ کەوتە فڕاندنی و دابەشکردنی بەسەر دار و بەرد و گوڵ و گەڵا و کەژ و چیادا، ئەنجا گوللە بێدەنگ بوو، دەنگەدەنگی زیاتر بوو. کە لەپڕ ئاوڕم دایەوە... چی ببینم...

کاشکا هەر نەمدیایە؟... با... ببینم تا چاک زۆر چاک یەجگاری، زۆر بەتاو قین هەڵگرم لە دەرەبەگی.

چی ببینم؟ کۆتەرە خەڵووزێک بەباوەشی خاتوونی ژنی مام هەسەنەوە، بەڵێ کۆتەرە خەڵووزێک بەڵام ساتێ لەوەوپێش ساوایەک، کۆرپەیەکی خۆشەویست، گۆشت و خوێن و گیان بوو... ساتێک لەوەوپێش ڕایان دەژەن و لایەلایەیان بۆ دەکرد... بەم جۆرەماڵی مام هەسەن سووتا و بەم جۆرە ئەو ساوا بەسەزمانەی ئەو دایکە بەسەزمانە بوو بەکۆتەرەیەک خەڵووز. خەڵکی دێ هەموو ئاگریان لە چاو دەباری، دەسووتا و سووتێنەر بوو... ڕیش سپییەکی پیری کۆماوە کە لەبن درەختێکدا خۆی دابوو بەسەر گاڵۆکێکدا و ڕیشی بەدووکەڵە زەردبووەکەی بەفرمێسک دەشت وتی:

پەنا بەرینە بەر کێ؟ بێ گومان دەبێ هەر پەنا بەرینە بەر میللەت... بەر هەق... بەر تێکۆشین... تێکۆشکانێکی خوێنین...».

سەرچاوەکان


١- ئاشتی هۆنراوەی کامەران موکری - بەغدا ١٩٥٤.

٢- ئاگر و ژیلە، هۆنراوەی کامەران موکری - سلێمانی ١٩٥٨.

٣- ئاوات و ڕەنج هۆنراوەی کامەران موکری - سلێمانی ١٩٦٨.

٤- دیاری، هۆنراوەی کامەران موکری - بەغدا ١٩٥٧.

٥- شانازی - کامەران موکری - سلێمانی ١٩٥٨.

٦- گوڵاڵە سوورە، هۆنراوەی کامەران موکری - سلێمانی ١٩٥٩.

٧- گوڵ و ئەستێرە، هۆنراوەی کامەران موکری - سلێمانی ١٩٥٩.

٨- ڕۆژنامەی ژین - ژمارە ١١٠٣ ساڵی ٢٧ی ١٩٥٢.

٩- ڕۆژنامەی ژین - ژمارە ١١١٤ ساڵی ٢٧ی ١٩٥٢.

١٠- ڕۆژنامەی ژین - ژمارە ١١٢٤ ساڵی ٢٧ی ١٩٥٢.

## خالد حیسامی (هێدی)

١٣٤٩ - ...

خالد، کوڕی حاجی حەمە ئاغای دێبوکری کە شۆرەتی حیسامی و نازناوی هێدییە لە ساڵی ١٣٤٩ی کۆچی لە دێی شێخالی سەر بەسابلاخدا لە دایک بووە. هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و پاشان چووەتە سابلاغ و دەوری سەرەتاییی لەوێدا تەواو کردووە و لە پاشا دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە و خەریکی کشتوکاڵ بووە و پاشان لەسەر کوردایەتی ماوەیەک ئاوارەی کەژ و کێوەکان بووە و لە دوای شۆڕشی ئیسلامیی ئێران گەڕاوەتەوە نیشتمان.

هێدی هەر لە منداڵییەوە هۆنراوی هۆنیوەتەوە، لە وتووێژێکدا کە لەگەڵی کراوە دەڵێ: ئەو دەمەی کە لە قوتابخانەدا بووم هەستێک بەلای هۆنراو و وێژەدا دەیکێشام و لە هەر جێیەک هۆنراوی هۆنەرێکی باش دیارە بەخەیاڵی خۆم بەتایبەتی هۆنراوی هۆنەرە ناسراوەکانم وەدەست دەکەوت لەبەرم دەکرد و لە هەموو دەرفەتێکدا هەزاران جار دەمگوتەوە، وە یەکێک لەو هۆنەرانەی کە هۆنراوەکاینم بیستبوو و، لەبەرم کردبوون وەفاییە و پاشان خۆم دەستم کردە هۆنراو هۆنینەوە و هەندێ لە هۆنراوەکانم لە گۆڤارەکاندا بڵاوبووەوە.

زۆربەی هۆنراوەکانی هێدی لەسەر شێوەی کۆن و تازە دایە و ئەو پتر لە سەر ڕێ و شوێنی وەفایی ڕۆیشتووە و گەلێ وشەی کوردیی پەتی لە هۆنراوەکانیدا بەکاربردوون و هۆنراوەکانی هەتا حەزکەی تەڕ و پاراو و شیرینن، وە لە چەشکەی هۆنراوی کۆن و نوێ بەشداره و هەندێ جار مەبەستێکی کۆنی لە قاڵبێکی تازەدا داڕشتووە و زۆربەی هۆنراوەکانی دڵداری و سروشتی و کۆمەڵایەتی و نیشتمانین. یەکێک لە ڕەوشتە باشەکانی هێدی ئەوەیە کە کەمتر وشەی فارسی و عەرەبی لە هۆنراوەکانیدا بەکاربردوون، بەڵکو لە وشەی ڕەسەنی کوردی کەڵکی وەرگرتووە.

هێدی سروشتی نیشتمانەکەی خۆش دەوێ و، هەر ئەو سروشتە جوانە بووە کە مرخی هۆنەریەتیی ئەوی بزووواندووە، بۆیە بەم چەشنە ستایشی دیمەن و چاوەندازی نیشتمانەکەی کردووە و دەڵێ:

چەند لە خونچەی بەربەیانی جوانە زەردە و پێکەنین
بۆ نەمانی بەژنی تۆ سەد هێندە چۆپی و هەڵپەڕین
دیمەنی شیرین و کولمی سوور و بەژنی ڕێکوپێک
کەس تەماشای تۆی نەکرد وەک من کە نەیگوت ئافەرین

گــوێت لە من بگرە گــوڵم تاکــو بەکــوردی پێت بڵــێم
باسی کــوردوســتــانی گەورە یان بــەهەشــتی ســەرزەمین
لەشکری بای وەعــدە هــات و تەپڵــی شــادیی گــرتە دەس
نـایە بــەر پێ شـــاخ و هــەرد و کـــەویە بــەفـــری هــەڵدڕین
ئاوەچۆڕەی کـــەوتە بن بــەفـــری نواڵە و شــــیـــو دۆڵ
تک تکەی دەڕژێت و دەترووسکێ وەکــو دووری ســـەمین
خـــاکـــــە لێـــوە هـات بـەئـالای دەوڵەتی نـەورۆزەوە
دای کــوتا پــەرچەم لەســەر کــوێســتـــانێ وێنەی فــاتحین
هەوری پۆل پۆل و گـــەواڵی دان بــەســەریەکــدا شــەمــاڵ
جــێگە تەنگ بوو پێکی دادان پێــچــەوانە و ڕاســتــەقین
کوێر و کەڕ و سەرسامن ئەو دەڕوانێ ئەو گوێ هەڵدەخا
یان شــریخــەی هەورە یان بەرقی بریسکە و تێک خــوڕین
خــۆرنشین دەیدا بەســەرخــۆیدا کــە بۆ ڕۆژ هەڵ نـەهات؟
ڕۆژهــەڵات دەیدا بــەئــەژنۆیــدا لــە تـاوی خـــــــۆرنــشــین
دای ڕژاند بـاران بـەخــــاکی کــــــوردەواریدا چلۆن
هەروەکــو فــرمــێسکەکــانی من لە دووریی تۆ گــرین
چیــمــەنی کــردووەتە پای ئەندازی بووکی ســەرچلۆک
شــەونمی کــردووەتە گوارەی گوێی گــوڵاڵەی سوور و شین
بــولبـــولی مـــەست هــەڵوەدای یاقـــوتــی ناو پیــرۆزەیە
دەردەداری عــیشــقــە کــەنگێ ســەردەنێــتــە ســەرســەرین
چۆن بنووسم من کــە چۆن شلێــر و بەیبــوون لێکدران؟
چۆنی تـاریف کــەم کــە چۆن مــەندۆک و بیــزا تێک بەزین؟
توولە ڕێواس ســــەری هــەڵدا دڕیی پەردەی حـــــەیا
نـاسک و تــورت و ســـــپی وەک قــــۆڵـی یاری نـازەنـین
بانەمـــەڕ هــات و هەواری بۆ نشــیـــمـــەن هەڵبــژارد
وەک لەســـەر تەخــتی زومــەڕەد دابــەزێ ســوڵتـانی چین
بۆ بـەخـــێـــرهێنانی مـــیـــوانی بـەڕێزی هــەرد و بۆ
چاوەڕێ وێســـتـــاوە داوێن پڕ لە لالەی عــــەنبـــەرین

ڕاپەڕێ قومری سەری خونچەی پساند و خستییە پێی
وەک کە شێوەی کوردەکانە گاو و گەردوون سەربڕین
بای شنە بۆ پێشوازیی نەرم و هێدی کەوتە ڕێ
زێڕوەشانی کرد سکەی بێ نەخشی پەلکی یاسەمین
خێڵ ئەوە بارگە و بنەی هەڵبەست و گەورەی قافڵە
کاروانی بردە سەرچاوەی ژیان و دابەزین
وەک قەلای ئەو عێلە بێ سەرهۆزی سەنگین و گران
چادری هەڵداوە نۆ ئەستونەک و سێ لا بەرین
لاوی شۆخ وشەنگە سەرگەرمی جلیت و تەقڵەیە
بێرییە باسکی هەڵدەکا دەڕوا بەقاقای پێکەنین
لایە کارەی مێگەلی پاراو و نرکەی شەک بەران
لای تری حیلەی کەحێلی تۆسن و ئەسپی بەزین
زەمزەمەی جووتێرە، دەنگی لاوکە، گۆرانییە
هەڵپەڕینە، داوەتە، شکوایە، ئێخە دادڕین
شوانە بلوێری وەناڵین خستووە بەیتی کۆن دەکا
کاکە مەم خۆی وای نەزانیوە هەواڵی خاتووزین
گەرچی شیرینە بەسەرهاتی سیامەندیش دەڵێ:
هەر لە پێناوی وەتەن سەر بەرز ئەکا هەڵئاوەسین
یانی ئەو خاکە گەلێک لاوی لە دەس داون بەلام
حەیفە بۆ غەیری شەهیدانی وەتەن گریان و شین
تا بەچاوی خۆت ببینی هەرچی ئەوڕۆ لێی دوام
دەستی من بگرە وەرە ئەی خۆشەویستم با بچین
ناتەوێ کۆشکی بڵیند و، بورج و، قەسر و، سەرسەرا
ئەشتەڕو و قەندیل و سامڕەند و سپی ڕێزت کە دین
زۆری پێ ناچێ کە ئەمن و تۆ بەکوێریی دوژمنان
پێکەوە سەربەست و ئازاد هەر لەناو گەلدا دەژین
دەستی یەک دەگرین و وێکڕا سەیری کوردوستان دەکەین
ئێمە کۆیلەی کوردەکانین وەک سیامەند نامرین

هێندی من دیتم له ڕابردووی ژیانم سوێر و تاڵ
هەر بە ڕزگاریی ولاتم دەکرێ سارێژی برین
لەو بەهارە خۆشەدا لەو شادییە پیرۆزەدا
پێشکەشی بەژنی جوانی تۆ سلاوی ئاگرین

هێدی له هۆنینەوەی هۆنراوی سروشتیدا بەڕاستی مامۆستایه و کەمتر هۆنەرێک توانیویه بەو جۆرە بەسروشتدا هەڵبڵێ و جوانییەکانی بخاته پێش چاو، وەکو لەم پارچه هەڵبەستەیدا کە سەبارەت بەپایز هۆنیویەتەوە، ئەو پایزەی کە بەدەستی پەروەردگارەوە نەخشاوە و کە چۆن ڕەنگی بزرکاوە و گەلای دارەکانی زەرد کردووە و جێ هەواران چۆڵ بووە و ئیتر نە گورەی شوانە و نە تووڕەی بلوێر و نە بزەی بێری و نە هاوێر و بێر کە ئەمانە دەبینێ بەدڵێکی پڕ له پەژارەوە دەڵێ:

گێژەڵۆکە و شەڕە بای پایزە
ئاشکرا دیارە سروشت لێی زیزە
ڕەنگ بزرکاوە هەناسەی سەردە
کزە، ئاڵۆزە، بەداخ و دەردە
جێ هەوار چۆڵە له چیغ و ڕەشماڵ
دەگەڕێن ئێستە له جێی وان قەل و داڵ
نە گورەی شوانە نە تورەی بلوێر
نە بزەی بێری نە هاوێر و بێر
نە هەوێزە نە تەلانی بزوێن
نە خشەی سایە لەبەر دێ له کولێن
نە کوچک مای نە چرا پاش سێرە
چاو بڕەکێنێ دەگەڵ ئەستێرە
سەری سێپەک کە بەرز بوو جاران
کەوتووە ئێستە لەبن دیواران
نە زەمەند نە چیای سەوز و شین
نە چلا و چڵ دەفڕێ مێش هەنگوین
نە کچان دانە مەڕی ئێواران
داوەتێکی دەگرن وەک جاران

کپ و بێ هەستە هەوار خامۆشە
جێ هەوار چۆڵ و چیا ناخۆشە
جاروبار خشپەیە دێ و نوزەی با
قانگەلاش دێنێ لەگەڵ خۆی دەی با
باوێ ئاونگ چوو لە جێی ئەو سیخوار
نیشتووە تۆزی لە شێوەرد و بەیار
پیرە زریان بەکزەی ساردوسڕی
وەک دەڵێن: بەرگی فەقیرانی دڕی
لە تەنیشت هەر کەسەوە ڕادەبڕی
وەکو دووپشکێ چزووی دادەگرێ

***

پایزی عومریش ئەوە نیزیکە
ماوەی ئەو ژینە نییە چیدیکە
سەر ئەوە بەفری سپی کەوتە سەرێ
ڕۆژ، گەلای عومریش ئەوە هەڵدەوەرێ
باخچە بێ ڕەنگ و کز و ژاکاون
شەختەیان گەیوەتە سەر لێی داون
سوورە گوڵ سیسە گەلای پەڕپەڕ بوون
خۆی کەساس دیوە مژۆڵی تەڕ بوون
سەردەمێ هەرچی بوو نازی ئەوبوو
ئەوی دڵدارە نیازی بەو بوو
گیان لە لەش دەردەچوو دەورەی دەتەنی
تا بدەم سرووەوە ئەو پێ دەکەنی
ئێستە تەنیایە گەلا و پۆپی وەری
بەسەری نارۆم ئەگەر خوێن بگری
چونکە گوڵ بۆوە نییە گریانی
تەمەنی کەم بوو ئەویش دەیزانی
ژین هەتا سەر نییە مەرگی دەگەڵە

دڵ پڕیی وی لە چەپۆکی خـــەزەڵە
بولبـــوڵی دەربەدەر ئەجــــریوێنێ
هێــزی تێـدا نیـیـــە بچـــریکێنێ
لەرزی لێـیـــە و بەوتەی بێ ســـەروبن
«شــینی ئاوالی» دەگـێــڕێ وەک من
ئەویش ئاوارە بەداخ و کــــەســــەرە
ســـەد پەژارە و غـــەم و دەردی لەبەرە
لایەکی داخی گـــــوڵی بـا بـردوو
لایە هێـــــلانە بـەڕەڵڵاکـــــــردوو
لایەکی تـیـــــــری تـوانج و تـانـە
لایەکی ســــەخـــڵـــەتی ئاو و دانـە
گەرد و لوریش لەسەر ئەو حاڵە شڕە
بۆی نەهێــشـتـووەتەوە ڕێی باڵەفـڕە
هیند دژ و بێکەس و ســــەرگـــەردانە
وا کــەســـیـــرە بووە بەســتــەزمـانە
هەر کـــەسێ بۆی بچێ باڵی دەگـــرێ
بەهەمـوو جۆر!! لە قـەفـەز توند ئەکرێ
دەیەوێ بەســتــە بڵێ و هێند پەسـتـە
دەبزرکـــێنێ لەباتی بەســــتـــە

***

خــەفــەتی زۆرە لە زســتـــان ئەگـەڕێم
بۆ وڵات دەچمـەوە، کوێسـتـان دەگەڕێم
هەر لە باکـــورەوە تاکـــو باشــــوور
چۆمەڵ و دەشت و چیای سەخت و دوور
بـەدڵی گـــــــەرم و بـەهـەنـگـاوی وڕد
بـــازێ داوێـم لـە سـنـووری دەسـکـرد

***

هێدی هەر لە منداڵیدا بێجگە لە دیمەنە جوانەکانی کوردستان و کەژ و کێوە جوان و ڕەنگاوڕەنگەکانی، حەزی لە هۆنراوەکانی وەفایی و سەیف و نالیی دەکرد و بۆنی هۆنراوی

ئەو هۆنەرانە لە هەموو ڕەگەکانیدا هاتوچۆی دەکرد و هۆنراوی هۆنەرانی فارسیش بەتایبەت هۆنراوی حافز و سەعدی وایان لێ کردبوو کە باوەش بۆ هۆنراو بکاتەوە، لەلایەکی تریش کچانی جوان و نەشمیلی موکریان دڵی ئەویان ڕفاندبوو، بۆیە بەم جۆرە بەخۆشەویستەکەیا هەڵدەڵێ و دەڵێ:

وەرە سەر دەرکە وەکو مانگ لە سوێ
گوڵەکەم تاوێ لەگەڵ من بدوێ
وا لە ڕێتا سەری سەرگەردانم
چاو بەگریانەوە لێت دەڕوانم
گیان پەپولێکە لە دەوروبەری تۆ
وا گری گرتووە لە سایەی سەری تۆ
دڵ بەئاواتەوە هەر دێتەوە لات
سەری داناوە لە ڕێی هات و نەهات
وەرە سەیری من و ڕەنگی زەردم
دەردی دووریت و هەناسە سەردم
لێک دەکەن ڕۆژی من و پرچی ڕەشت
ڕەنگی فرمێسکی من و کوڵمی گەشت
زەردە زۆر کەوت و بەیان زۆر ئەنگوت
بەهەناسەی شنە گوڵ زۆر پشکووت
چاوی من هەرچی دەڕووی تۆ ڕاما
لێوەکەت پێ نەکەنی و هەروا ما
جووتێ لیمۆ کە لەسەر سینگی تۆن
ویست و دڵخوازی منی تامەزرۆن
چ بڵێم چەندە سروشت ئارەقی ڕشت
تا وەها جووتێ مەمی تۆی داڕشت
ئەمەنت کەیوەتە چاردە بەخەیاڵ
تازە زەرد هەڵدەگەڕێ لیمۆی کاڵ
شەم لە ناو پەردەوە کز دەنوێنێ
ئەم لەبن ئێخەوە دڵ دەڕفێنێ

جووتێ گۆی زێڕە بەچەند مانگ و ساڵ
خڕی هەڵداوە لەسەر زێوی قاڵ
سینگ و مەم تۆ بڵێ نەک زێڕ و زێو
زێڕ و زێو کەی بووە وا نیشە بزێو
بەدەم ئەو گۆیەوە دەنگێ یاقووت
بەسەری لالەوە ما ئاگری ڕووت
بەکزەی باوە کە لیمۆ دەوەرێ
مەمی تۆ هەر بەهەناسێک دەلەرێ
ئەی «مەهاباد» ئەتۆ جێی شانازی
پێی گەیاند باوەشی گەرمت قازی
کوڕیەکانی تۆ لە خان و سەردار
بەسەری بەرزەوە چوونە سەر دار
نیە ژین نرخی لە پێناوی تۆ
سەربچێ و بەرزەوە بێ ناوی تۆ
بەرزە جێت، تۆ سەری کوردوستانی
لانی کارمامزی، جێی شێرانی
دیمەنت چەشنێ دەبزوێنێ ئەوین
گاڵتە بۆ کیژ و کوڕی تۆن مەم و زین
کوڕوکاڵی تۆ هەموو شۆخوشەنگ
کیژی چاومەست و خڕ و نێوقەد تەنگ
گەڕەکێکت هەیە «مزگەوتی سوور»
ڕوح لەسەر وێ دەگەڕێ دووراو دوور
دەرک و بەر پەنجەرە ژوور و هەیوان
حەوش و کۆڵان و قولینچک و سەربان
سەر شەقام و چەم و پرد و ڕێباز
پڕ لە پشتێن شلی ئەشمیل و بەناز
گوڵی لێ شین بووە هەرچی دەتەوێ
غەڵفی هێناوە تەڕ و شلک و نوێ

ڕۆژ درەنگانێ دەمەو ئێوارە
کیژۆکاڵ دێنە سەر ئەو ڕووبارە
گۆزە ئاو هەڵدەگرن بازنە لە قۆڵ
چەتری سەر کوڵمەیە برژانگ و مژۆڵ
هەر گوڵینگی شەدە زۆر پڕ کارە
دەلەرێ و دەستڕی ژەنگی گوارە
نایەڵێ خشڵی سەری هەڵگرێ ژەنگ
زەردە دەرکەوت و ترووسکەی دێ پەرەنگ
دڵنیا نین لە زمانی بەدرۆ
پێکەوە دێنە زمان چاو و برۆ
مانگەشەو هات و لە دەرک و بانان
کۆڕی دڵداری دەبەستن جوانان
بسکەکانیان بەپشووی با دەشەنێ
بۆنی خۆشی بەهەوادا دەڕەتێ
دڵ دەلەرزێنێ شەوانی شەوەزەنگ
دەنگی بەرموری کچی شۆخوشەنگ
نییە جێیەک وەکو ئەو شارە لەلام
هەرچی تێی دایە لەلام جوانە بەڵام
گوڵی وەک تۆی نییە پاک و ڕوو سوور
لالەی و کەوتیە «ناو ماڵی بلوور»
«فەوزیە» تاقە گوڵی ناو شاری
پەیکەری جوانی ئەتۆ و گیانداری
«نوێژگە» گەرچی لە پەنای ماڵەکەتە
حەج بەڵام دەوروبەری خاڵەکەتە
دەی شەماڵ تۆش وەرە خەمخۆری کۆن
زۆری وەک من بەتەمای هاتنی تۆن
بگە فریای دڵی پڕ لە خوێنم
دەگریم ڕێم نییە بیشی دوێنم

بچــــۆ لای و بڵـێ بەو دەم قــــەندە
ئاگـــرت کـــردەوە لەو مــــەڵبــــەندە
هــەر لــە ڕۆژی هــەوەڵــی دەربــەدەریم
عـیشـقی تۆش هۆیە کـە بۆ کـوێرەوەریم
بەهـەوای تۆوەیـە دێ خـــــوڕپـە لە دڵ
دڵ هەر ئی تۆیە هـەتا دەیخـــــەنە گڵ
ئەو دەمــەم خـــۆشــە کــە تۆش لەولاوە
کــــەزیـــــەکـــــانت بدەیە دەم باوە
با پەرێشـــــانـی بکا وەک دڵەکـــــەم
هەڵمــــژم لێـــرەوە بۆنی گــــوڵەکـــەم
ئەی مـــەهاباد بەخـــوام ئەســپــاردی
لێـــرە دڵ ســـارد بوو منیش بۆم ناردی
هـاتـەوە باوەشـی گـــەرمـــوگـــوڕی تۆ
هـەڵوەدای ئاو و گــڵـی تۆن کـــوڕی تۆ
هـەرچی هـەی تۆ گــوڵی یان گــوڵدانـی
ئاوەدان بـی وەتـەنـی کـــــــوردانـی

هێدی کۆمەڵە هۆنراوێکی هەیە بەناوی مەهاباد و چوارچرا و بازاڕ و پردی سوور کە لەوانەدا سروشتە جوانەکەی شاری سابڵاخ و سەرگوروشتەی خۆی لەو شارەدا بۆمان دەگێڕێتەوە کە بەڕاستی هونەری تێدا نواندووە و بەشاکارێکی وێژەیی دێتە ژمار کە ئەوا لێرەدا چەند هۆنراوێکی بۆ نموونە دێنین کە دەڵێ:

لە مـــــــەهابادەوە ڕێ تــێ دەپـەڕێ
هەلە با گـــیـــان بەســـەریدا بگەڕێ
گـەشکە بگرێ بەشنەی نەرم و نیـــان
هـەڵمــــژێ جــارێ تریش بۆنی ژیان
جێی پشـوودانە درەنگ وەختـە شـەوە
ئێـرە مــیـوانگر و دەســتــە و جـڵـەوە
دڵە جـــا دەرفـــەتە بیکە گـــرۆگـــاڵ
وەرە دامــەزرێ کـە جـێی تۆیە خـەیاڵ

لێــرەیە دڵ بەهەمــوو شت دەهەژێ
هەمــوو جــێی بیــرەوەری لێ دەڕژێ
دوور بەدوور هێندێ چرای دڵ ســووتاو
جـــاروبار لێم دەترووکــێن چاو
هەست ئەوە کەم بووە لەو چۆڵ و چڕە
کــێــوی دابێن بووە باڵندە کــڕە
ئەگــەر ئاڵۆز بێ خــەیاڵی خــاوم
ســووچی خــوریەی دڵە و ئاوی چاوم
لە دەسم دەرچووە یەک جێ هەســتم
هەمــوو جــێی گــرتووە پێی ناوەســتم
ڕێگە دەڕوا وەکــو هەودای خــەیاڵ
دەم گــەیێنێــتــەوە جێ کــۆڕی بەتاڵ
«چوارچرا» لەوبەرەوە دەمکێــشێ
سەری سەودام هەیە دەچمە پێشێ
باش کـــە دەڕوانمە تاریکایی
داوەڵی قــوچی دەکــا تارمــایی
چقڵی خۆی و لە گوڵی دەوری سڵە
چقــڵی لێ لاچێ ئەوی دیکە گــوڵە
شــێــرە بەردینە لە جــێی پەرژینە
پشــتی لەو داوەڵە ناشــیــرینە
نایەوێ چاوی بەچارەی بکەوێ
کــەچی ناچارە لەبەر پێی دەخــەوێ
داخم ئەو خاکە لە دەس پیس و چەپەڵ
ڕۆژێ ســێــدارەیە ڕۆژێک داوەڵ
هەرچی لەو ناوەیە هەر یەک بەجــوێ
لەشی کــــۆن و نوێ بۆم دەدوێ
بەکــون و قــــوژبنە ڕێی باریکە
وەک دڵی داوەڵەکـــەی تاریکە

هەستی دوو چەشنە لە دڵ دێن و دەچن
خۆشەویستی و ڕقی دۆست و دوژمن
چەق و چۆ دەمگرێ دێمە لەرزە
گیانی «قازی» دەفڕێ لەو بەرزە
لێرە هەڵنایە ئیتر چاوی تەڕم
کورنشتێکی دەکەم و تێ دەپەڕم

***

هێدی ئەو پەردەش دادەداتەوە و پەردەیەکی نیشتمانی هەڵدەداتەوە و بەچەشنێکی جوان لەگەڵ نیشتمانەکەیدا دەکەوێتە وتووێژ کە بەڕاستی لەم بارەوە پارچە هەڵبەستێکی بێ وێنەی هۆنیوەتەوە، وەکو دەڵێ:

ئەی وەتەن تەنیا نە هەر من بۆ تۆ وا سەوداسەرم
تیشکی ڕۆژیش جێی لەبەر کۆیلەت نییە دەوروبەرم
تۆ لە دەس بێگانەدا بی چارەنووسی ئەو گەلە
هەڵمەت و قوربانی دانە و ڕشتنی خوێنی گەرم
ناحەزی تۆ پێ لەسەر گۆڕی شەهیدان دابنێ
کێیە باوەڕکا کە دەس لەو خاک و خوێنە هەڵگرم
دوژمن چیدیکە با ئاگر لە ماڵم بەرنەدا
من لە سایەی خۆشەویستیی تۆوە هەر خۆم ئاگرم
سەد پەژارە و بەرهەڵست و سوێر و تاڵیم بێتە پێش
گەر لە ڕێی ڕزگاری تۆ لادەم بزانە کافرم
خۆم بەشانازی بەلا گەردانی سەربەرزیت دەکەم
تیخی خۆی دابێنێ دوژمن بۆ مەتاڵت حازرم
سەر لەسەر شانم وەکو بارێکە کەڵکی چیی هەیە
گەر دەڕێی تۆدا نەچێ ئەو بارە قەت هەڵناگرم،
من بەبیر و باوەڕ و دوژمن بەتانک و تۆپەوە
کێو بەکێو ڕاوی دەنێم واتە گەلێک ئازاترم
هەر بەهیوای ڕۆژی ڕزگاریت دەژیم و ڕوونە لێم
تا بەدەستی خۆم نەنێژم دوژمنی تۆ نامرم

من دەڕێی سەربەستیی تۆدا بۆ هەموو پیلانی ڕەش
دڵنیابە هەر کوڕە پێشمەرگەکەی ناو سەنگەرم
ئەو کوڕەی هێزم لە شیری تۆوەیە و ڕۆژی هەرا
جێی لەناو جەرگ و هەناوی دوژمنتدا خەنجەرم
من کە گاڵتەم دێ بەمردن سەیرە گەر تۆ شاد نەبی
تۆ دەبێ هەر سەرکەوی و کۆسپ لەسەر ڕێ لابەرم
دوژمنت هەر فێڵێ بیکا نەخشی سەر ئاوە و ئەمن
پیرەدارێکم کە بەو بایانە هەرگیز نالەرم
نابەزم هەروەک بەڵێنم داوە یان ڕزگاریی تۆ
یان هەموو ئەو شیو و دۆڵەت پڕ دەکا خوێن و تەڕم
ئەی وەتەن هەر ناوی تۆ ویردی زمانمە بۆیە وا
هەروەکو دەشت و چیاکەت کەسک و سوورە دەفتەرم

هێدی لە هۆنینەوەی چیرۆکە شیعریشدا دەستێکی باڵای هەبووە و لەم بارەوە هەندێ چیرۆکی لە زمانی پەلەوەرانەوە بەهۆنراو هۆنیونەتەوە کە بەڕاستی گەلێ جوانن و دەچنە دڵەوە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە سەردێڕی باز و کەو هۆنیویەتەوە دەڵێ:

لە مەڵبەندێکی خۆشی کوردەواری
سەرەوژوور بوونەوە خێڵ بۆ هەواری
لە داخی بەفر و زستان و کرێوە
چیای ڕازاندبووەوە خاکە لێوە
لەبەر دەشتا کراسی مەخمەری شین
لە ئامێزی هەڵاڵە و یاس و نەسرین
تەماشای چت دەکرد خوار و سەر و ژوور
سەری لێکدابوو شللێر و گوڵی سوور
وڵات خەملی بوو بەو چەشنە سەراسەر
بەخاش خاش و گوڵی بەیبوون و شەست پەڕ
لە ناو ئەو دیمەنە سەوز و جوانە
کە جێی درکاندنی هەستی دڵانە
لە زەردێکا کەوێکی قۆز و نەخشین
سکاڵای بوو لەگەڵ بازێکی تێبین

سەرەڕای ئەو سروشتە دڵرفێنە
وەکو زامداری «کەو» دەی کرد ورێنە:

***

دەغیلت بم مەلی پسپۆر و چازان
مەلی تەڕدەست و وریا و ژیر و تەڕلان
دەژیندا بۆچی وا چارەڕەشم من؟
لە خۆشی و کامەرانی بێ بەشم من؟
ئەمن روح دادەنێم بۆ خاوەنی خۆم
لەبەرچی ئەو وەفایەکی نییە بۆم؟
وەرە تۆخوا سەیرکە خاڵ و میلم
لەسەر ئەو دیمەنەشرا وا زەلیلم
هەموو ڕۆژێ دەگەڵ کازیوە ئەنگووت
دەچم بۆ ڕاوی «مێ ڕۆژ» و سیاسوت»
لە قاسپەی من هەزار بار و کەوی پیر
لە دوای خاوەنمدا بوونە نێچیر
سەعاتێک ناسرەوم بێ خواردن و خەو
کە ئەو تێربێ لە گۆشتی ناسکی کەو
نەبوو جارێک لە سیپەیدا بخوێنم
لە گەرمەی تاپڕی دەنگ دانوێنم
لە ماڵێ ساز و سەمتوورە غورەی من
نشەی ڕاوچی دەبزوێنێ گۆڕەی من
لەسەر ئەو حاڵەڕا بێ قەدر و حورمەت
قەفەز جێگای منە بێ دان و خزمەت
ئەگەر ڕۆژێکی کەو نەکرێن قەلاچۆ
ئەبێ لێم دارنن باڵ و پەڕ وَ پۆ

***

وەڵامی داوە «بازی» کۆنە ڕاوکەر
کە تاوان هەر لە تۆڕایە سەرانسەر

ئەتۆ خۆت بوویە گورگی مێگەلی خۆت
ئیتر کێ بێت و دڵسۆزی بکا بۆت
دە خوێندا سوور بووە دندووکی ئاڵت
ئەبێ بیگریە ئەستۆی خۆت وەباڵت
براکەت بانگ ئەکەی بیخەیتە نێو داو
بەڵام دوارۆژی خۆت ناخەیتە بەرچاو
دەرێژی خوێنی خزمی خۆت و بۆ خۆت
دەدەی دەستی پەشیمانی لە ئەژنۆت
کە بۆ فەوتانی هۆزت تێ دەکۆشی
دەژیندا چۆن ئەبینی خێر و خۆشی
کەسێک بۆ خۆی ئەوە شەرت و بەقای بێ
ئەبێ چۆن دوژمنی بۆ ئەو وەفای بێ
دڵت ناسووتێ بۆ جووجکی برای خۆت
ئەتۆش پێویستە بیبینی سەزای خۆت
لەبەر ئەو ڕاوە دەگرێ حورمەتی تۆ
دەنا ئەو نایەوێ خاڵ و خەتی تۆ
هەموو دەشت و چیا پاوانی تۆیە
ئەگەر تێیدا نەژی تاوانی تۆیە
بەسەربەرزی لەناو هێلانە مردن
نەوەک تۆ خزمەتی بێگانەکردن

هێدی گەلێ هۆنراوی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بەپەرشوبڵاوی بڵاوکردوونەتەوە و لەم دواییەدا بەشێک لە هۆنراوەکانی بەناوی کاروانی خەیاڵ لە چاپ داوە کە هیوادارین پاشماوەی هۆنراوەکانی تری کۆکاتەوە و لە چاپیان بدا، هەروەها گەلێ بەرنامەشی بۆ ڕادیۆ نووسیوە و هەندێ نامیلکە و نووسراویشی بۆ چاپ ئامادە کردووە کە یەکێ لەوانە پەرتووکی (کوردیی کوردستان)ی واسیل نیکیتینە کە لە فارسییەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

سەرچاوەکان

١- کاروانی خەیاڵ بەشێک لە هەڵبەستەکانی هێدی - ورمێ ١٣٦٤.

٢- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەهێدی.

## شێخ ئەمین نەقشبەندی

١٣٥٠ - ١٤١١

شێخ ئەمین کوڕی شێخ عەلائەدین نەقشبەندی کە نازناوی بێوەیە لە ساڵی ١٣٥٠ی کۆچی لە بیارە پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و ماوەیەک لەلای مامۆستا مەلا کەریمی بیارە ڕێزمانی عەرەبی و شەرعی ئیسلامیی خوێندووە و ماوەیەکیش لەلای مەلا بەهائەدینی بیارە تەجویدی قورئانی خوێندووە و پاشان چووەتە سلێمانی و دەوری سەرەتایی تەواو کردووە و لە پاش ماوەیەک چووەتە کرماشان و لەوێدا لە ڕادیوێ کوردیی دامەزراوە و لەگەڵ ئەوەشدا خەریکی خوێندن بووە و دەوری ناوەندیی تەواو کردووە و ئەوسا چووەتە تاران و لە کۆلێجی وێژەی عەرەبیدا لیسانسی وەرگرتووە و لە پاشا گەڕاوەتەوە بیارە و لەوێشەوە چووەتە سلێمانی و لە کاری دەوڵەتیدا دامەزراوە و سەرئەنجام لە ساڵی ١٤١١ لە تەمەنی ٦١ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

شێخ ئەمین هەر لە تافی جوانییەوە هۆنراوی دەهۆنییەوە و پتر حەزی لە هۆنراوەکانی مەولەوی دەکرد و زۆربەی هۆنراوەکانی لەسەر سنووری هۆنەرانی دەوری کۆن و نوێ دەهۆنییەوە و لەم ڕووەوە ناتوانین ئەو بەهۆنەرێکی لاساییکەر دابنێین، چونکە گەلێ هۆنراوی لەسەر شێوەی نوێ هۆنیوەتەوە، وە دەتوانین ئەو بەهۆنەرێکی تازە دابنێین، چونکە چەشکەی لە هۆنراوی کۆن و نوێ وەرگرتووە.

شێخ ئەمین لە هۆنراوەکانیدا وا دەردەکەوێ گەلێ تاڵی و سوێریی ژیانی چەشتووە و گەلێ ئاوارەیی و دەربەدەریی دیوە، چونکە لە زێد و مەڵبەندەکەی خۆی دوور کەوتووەتەوە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە جەژنی نەورۆزا هۆنیوەتەوە ئەوەمان بۆ دەردەخا و دەڵێ:

مەواچان جەژنەن، وەشین، شادییەن
وادەی سەیرانەن، ڕۆی ئازادییەن
فەسڵی وەهارەن خەیمەی گوڵانەن
ئێلاخان خاڵ خاڵ، ڕۆی بولبولانەن
هاڕەی شەتاوەن، نەپای کۆسارا
زایلە کەوتەن کۆنە هەوارا
پۆل پۆل نازاران ملان وە کۆسار
هەم سەیرانی گوڵ هەم دیدەنیی یار
ئانە تۆ چێشەن چی خەمگینەنی؟
چی کزت کەردەن چێشا چینەنی؟

واتم مـــــەزانوو من چی شـــــادیم بۆ
کـــــە ئارۆ ئەوجی نـامـــــورادیم بۆ
چەنی کێ گـــەردەن ئازادی کـــەروو
داخـــــــانی دەروون وە لاو کێ بـەروو
کێ پەنەم واچۆ جـــەژنت مـــوبارەک
دیـــوانم پـــەی کـــێ بـــدەو تـــەدارەک
چەنی کێ بلوو ئێـــســـاڵ وە کـۆســـار
بـێ دۆس و هـام دەم بـێ یـاوەر بـێ یـار
چەنی کێ گـێـڵـوو نە پاو خـاڵ خـاڵا
چەنی کێ گـــێـــروو دەســـەو گـــوڵاڵا
پەی کێ هۆرمـــــجـــــوو زوخــــاوو دڵا
چەنی کێ کـــەر و ســـــەیرانو گـــوڵا
من دوور جـە وڵات جـە مـاوا و مـەسکەن
دوور جـــە ئازیزان جـــە خـــاکی وەتـەن
دوور جـــە بیـــارێ، دوور جـــە ئالیـــاوا
دوور جـە تافی زەڵم، جـە ئەحـمـەد ئاوا
دوور جـە ڕەنگین و دوور جـە شـارەزوور
جە قەوم و خوێشان جە هامسایان دوور
دوور جـــە تەوێڵـی چمـان بەهەشــتـەن
باخـەن شـەتاوەن گـوڵزارەن گـەشـتـەن
بـێ باخ، بـێ بـازاڕ، بـێ یار، بـێ یـاوەر
کـــامــــە بۆ جـــەژنم تۆ کـــەروو داوەر

واتە: دەڵێن ئەمڕۆ جەژنە و کاتی خۆشی و شـادییە، کـاتی سەیران و ڕۆژی ئازادییە، وەرزی بەهارە و خێـوەتی گوڵاڵەکان هەڵدراوە و کـوێستـانان خـاڵ خـاڵ بوونەتەوە و ڕۆژی بولبولانـە و هاژەی شەتاوانە لە داوێنی کێوەکاندا، وە زایەڵە کەوتووەتە هەوارانەوە و پۆل پۆلی نازاران دەچنە کۆساران تـا چاویان بکەوێتە یار و گوڵەکانیش ببینن. ئەوە تۆ چیتە بۆ خەمگینی و بۆ کزت کردووە و چییە کە ئاوات بەسەرهاتووە، وتم من نازانم لەبەرچی شایی و خۆشیم بێ کە ئەمڕۆ هام لە ناو خەم و پەژارەدا. لەگەڵ کێدا گەردن ئازادی بکەم و داخی

دڵ دەرکەم، کێ پێم بڵێ جەژنت پیرۆز بێ و دیواخانەکەم بۆ کێ برازێنمەوە، ئەمساڵ لەگەڵ کێدا بچمە کوێستان؟ بێ دۆست و بێ هاودەم و بێ یار و یاوەر، لەگەڵ کێدا بگەڕێم لە داوێنی کێوی خاڵ خالانا، لەگەڵ کێدا چەپکە گوڵاڵە بکرم، لەگەڵ کێدا زوخاوی دڵان هەڵڕێژم، وە لەگەڵ کێدا بچمە سەیری گوڵان؟ من خۆ لە زێد و مەڵبەندی خۆم دوور کەوتوومەتەوە، لە بیارەوە لە باخی ئالیاوا و لە تافی زەڵم و شارەزوور دوورم، وە لە خزم و کەسوکارەکەم دوورکەوتوومەتەوە، لە دێی تەوێڵە کە پڕییە لە گوڵزار و شەتاو دەڵێی بەهەشتە دووربوومەتەوە، ئیتر من جەژن و شاییم لە کوێ بوو، بێ یار و یاوەر ماومەتەوە.

شێخ ئەمین، لەبەرئەوەی لە زێد و مەڵبەندەکەی خۆی دووربووە، دڵی بەهیچ کوێ خۆش نەبووە و هەموو دەم ژینی لە ناو خەم و پەژارەدا ڕابواردووە و لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ کۆسپ و تەگەرەی بۆ هاتووەتە پێشەوە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا ئەوەمان بۆ دەردەخا و دەڵێ:

هەورەکەی مەینەت دیسان کەردەوە
تاو و تەوەرگش هەم ئاوەردەوە
بریقەی چەخماخان گرمەی هەوری تاڵ
نە جە دەشت بییەن نە وە هەردەوە
وای یەزیدی مەرگ پەی کشتی عومرم
مەیۆ پەیایەی وە تەوەرگەوە
مەڕێزنۆ و، سەر کشتی هاتمدا
نەهاتیو مەینەت وەدەم دەردەوە
چ خەتایێم کەرد یا کام گوناهم
فەڵەک هەقو کێت جە من کەردەوە؛

واتە: هەورەکەی مەینەت دیسان هەڵی کردەوە و تاو و تەرزەی هێنایەوە و چەخماخە و گرمەی هەوری ڕەش نە لە دەشت بووە و لە هەردا، بای مەرگ بۆ کشتوکاڵی تەمەنم پەیاپەی هەڵدەکا بەدەم تەرزەوە، دەڕژێنێ بەسەر کشتوکاڵی هاتمدا، وە نەهاتی و مەینەتم بۆ دێنێ، ئاخر چ گوناه و تاوانێکم بووە کە ئەمەم بەسەرا هاتووە؟ ئەی چەرخ تۆ ماف و هەقی کێت لە من سەند؟ شێخ ئەمین سروشتی خۆش دەوێ ئەو سروشتەی کە بەهۆی هاتنی جەژنی نەورۆزەوە دەست پێ دەکات، ئەو نەورۆزەی کە گەلی کوردی تێدا سەرکەوت و ئاگری نەورۆزیان هەڵکرد و هەموو کەوتنە شادی و خۆشی و، بەڕاستی لەم پارچە هەڵبەستەدا هۆنەر وانەیەکی سروشت بەئێمە و قوتابییانی هۆنراو و وێژە دەدا و تێمان دەگەیەنێ کە نەورۆز و سروشت چییە بەجۆرێ کە دەڵێ:

نەورۆز تۆ جەژنی جەژنی کوردانی
یادگارێکی باوا گەورانی
جەژنی بەهاری، جەژنی گوڵانی
جەژنی دڵدار و خاوەن دڵانی
مۆژدەی بەهار و سەوزەی دەر و دەشت
موژدەی سەیران و موژدەی خۆشی و گەشت
نەماوە سەرما و سەهۆڵی زستان
وەک بووک ڕازاوە خاکی کوردستان
لە گشت شارێکا بەزم و شادییە
ڕۆژی گوزەشتە و هی ئازادییە
لەباتی بەفر و یەخ و یەخبەندان
گوڵە و گوڵاڵە و بازاڕی ڕەندان
لەباتی کزە و دەمە و کرێوە
پڕ بۆنی خۆشە چی دەشت و شێوە
لەباتی مەرگی مەل و پەپوولە
یا زیندان بوونی تیپی مێروولە
لەباتی ژێر پێ بوونی گوڵ و گیا
لەباتی ماتی و ساردیی کەژ و چیا
ژیانە، گیانە، گەڕیانە، گەشتە
گەرمی و شادییە، عەینی بەهەشتە
بەزم و نیشاتە، عەیش و سووروورە
چی دەشت و دەرە گش سەوز و سوورە
بەزم ، خەندەیە و دەنگی پێکەنین
نەوای بولبول و سەوزەی سەرزەمین
جەژنی نەورۆزە و ساڵی تازەیە
وادەی سەیران و بەزم و بادەیە

هەژاری دەردێکی گرانە، هەژاری کۆسپی ڕێی ژیانە، هەژاری ئازاری گیانە، هەژاری خۆی نەخۆشیی کۆمەڵە. هەژاری هۆی نەخوێندەوارییە، ئەمانە هەموو بیر و کەڵکەڵەی

هۆنەرە کە سەبارەت بەهەژاری دەری بڕیوە، دیارە ئەو حەز لە هەژاری کۆمەڵ ناکا، بۆیە لە پارچە هەڵبەستێکیدا دەڵێ:

هەژاری کۆسپی ڕێی ژیان
هەژاری ئازاریی گیان
هۆی بێزاریی ئەم ژینە
هۆی ناکامیی ئەم زەمینە
هۆی ئاوات بردنە ناو گڵ
هۆی نامرادیی دڵدار و دڵ
هۆی نەخۆشیی هەزاران کەس
هۆی نەخوێندەواریی بۆ بێ دەس
لەکەی ڕەشی ڕووی ئەم چەرخە
مێوانی هەر کەس بی بێ نرخە
لای من نا لای پارە پەرستان
لای نەفام و خۆ بەزلزان
لای من هەژار وەک گەوهەرە
وەکو کانگەی زێو و زەڕە

شێخ ئەمین لە نووسینی پەخشاندا دەستێکی باڵای هەیە و گەلێ وتاری بۆ ڕادیۆی نووسیون و هەندێ وتاریشی لە گۆڤارەکاندا بڵاوبوونەتەوە و پەڕتووکێکیشی بەناوی تەسەوف هەیە و گەلێ وتار و نووسراوی بڵاو نەکراوەشی هەیە.

سەرچاوەکان

١- بەرهەمی ژیان، دیوانی هۆنراوەکانی ئەمین نەقشبەندی (بێوەی) بەغدا ١٩٨٠.
٢- تەسەوف چییە، نووسینی شێخ ئەمینی نەقشبەندی - بەغدا ١٩٨٥.
٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەشێخ ئەمین.

## خالید دلێر

١٣٥٢ - ...

خالید کوڕی عەبدولواحید کە نازناوی دلێرە لە ساڵی ١٣٥٢ی کۆچی لە کۆیەدا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و دەورەی خوێندنی سەرەتایی هەر لە کۆیە و ناوەندی لە کەرکووک تەواوکردووە و پاشان لە شیرکەتی نەوتدا دامەزراوە و ئەوسا خەریکی خوێندنەوەی دیوانی هۆنەرانی کورد بووە و لە پاش ماوەیەک دەستی کردووەتە هۆنراو هۆنینەوە و گەلێ لە هۆنراوەکانی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوبوونەتەوە و لە پاشا لەسەر کوردپەروەری گیراوە و ئەوسا دوورخراوەتەوە بۆ بەغدا و لەوێشدا گەلێ هۆنراوی شۆڕشگێڕانەی هۆنیوەتەوە و لە گۆڤارەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە.

خالید دلێر بەیەکێ لە هۆنەرانی هەرەبەرزی کورد دێتە ژمار و زۆربەی هۆنراوەکانی نوێیە و تا ئێستا چوار کۆمەڵە هۆنراوی بەناوی (ئاگر و ژیلە) و (ئاگر و گوڵ) و (بەرەو لووتکەی ئاوات) و (گزنگی هەتاو) لە چاپ داوە و هەروەها گەلێ هۆنراوی بەپرشوبڵاوی لە ڕۆژنامەی ژین و خەبات و شەفەقدا بڵاوکراونەتەوە.

خالید دلێر هۆنەرێکی خوادادە و هۆنراوەکانی گەلێ پوخت و شیرینن و دەتوانین ئەو لە ڕیزی هۆنەرە هەرە گەورەکانی کورد دابنێین، چونکە بیرێکی قووڵ و کەڵکەڵەیەکی وردی هەیە و ئەمەیش لە هۆنراوەکانیدا دەردەکەوێ و لەگەڵ ئەوەشدا هۆنراوەکانی بەکوردیەکی پەتی هۆنیوەتەوە بەجۆرێ کە هەموو کەسێک لێیان تێ دەگا، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە سەردێڕی درۆزن هۆنیویەتەوە دەڵێ:

درۆ ئەکەی خۆشت ئەوێم
دڵت لەو جێیە وا لە وێم
سەودای منی، شەیدای منی
هەمیشە بەدڵ لای منی
لەم جیهانە فراوانە
لەم هەموو شتە جوانانە
لەم ژیانە، لەم بەهەشتە
تەنیا خەیاڵی من بەشتە!!
لە دووریم ژیانت تاڵە
سەرلێشێواو، زمانت لاڵە

ئاگـــا و هـۆشت لەخـــۆ نـیـیـــە
زەینت لە یەک جێ کـــۆ نـیـیـــە
بـەچـاو ئـەڕوانـی و نـابـیـنـی
نـزیک نـەبـیـنـی، دوور بـیـنـی
بەمـــــانـی من شـــــادمـــــانی
خـۆشـیـم بە هی خـۆت دەزانی
هـەر کـــــارەســـــاتێ ڕووبدا
تۆ شـێـواوی، دەسـتـەو دوعـا!
هـەزار حـیـسـابم بۆ ئەکـەی
سـەد جـاری زەرب و کـۆ ئەکەی
خـــــوایـە ئەوی تێـــــدا نەبێ
پێـغـەمـبـەر وابێ، وانەبێ!!
گـــــەر یـەکێ لات ناوم بـەرێ
گـوێت شل دەکـەی بۆ خـەبەرێ
هـەمـــوو لەشت ئەبێ بـەگـوێ
ئـەبـێ چـی لـێ هـاتـبـێ!!،
پاش مــەرگی ئەو من چۆن بژیم؟
بـۆچـی بـژیم؟ بێ ئـەو مـن چیـم؟
بۆ دەست و پـەنجــەی ئەو لاوە
ئەم سنـگ و مــــەمکەم داناوە
لەوســـــاوە بـنـیـــان داناوە
دەسی کـەسـیـان لێ نەدراوە!!
قـــژم بۆ ئەو هێـــشـــتـــووەتەوە
بۆ ســەر ئەژنۆم شـــۆڕ بـووەتەوە
ڕۆژی ئەم چاوە گـــــەشـــــانە
ئەو نـەبـیـنـێ پـەرێشــــانە

خالید دلێر بۆ یەکەمین جار بەرامبەر بەدڵدارەکەی گیانی هۆنەریەتی بزووتووە و هەستی خۆی بەرامبەر بەئەو دەربڕیوە و کەوتووەتە ناو بیرکردنەوە و کەوتووەتە ناو تەنگوچەڵەمەی ژیان، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە سەردێڕی هاتنی یار هۆنیویەتەوە دەڵێ:

وتیـــان: پاش ڕۆژئاوا بوون
وا ڕۆژێـــکـــی تـــر هــــەڵات
وەک ئـــــاورِم دایــــــەوە
دڵدارەکـــــــەم بــوو ئەهـات!
یـار ڕوو لە هـەر شـــوێنـێ کـا
ڕۆژ هـەڵدێ، گـــــوڵ دەبـارێ
زســــتـــانـی ڕەش دەگــــۆڕێ
بەســـــەیرانـگـای بەهـارێ!!

ئەم هۆنەرەمـان پتر فەلسەفـەی ژیانمان دەخاتە بیـر و دەیەوێ بڵێ کە هەڵسوکەوتمان چۆن بێ و چۆن ژیان بەرینە سـەر و لەبەرچی دەژین و بۆچی دەژین و مـەبەستمان لە ژیان چییە، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە سەردێری بەهاری ژیندا هۆنیویەتەوە دەڵێ:

با هەڵنیشێ لە ڕووی ئاونگ تیشکی خۆر
تێکەڵاو بێ ڕەنگی ســـەوز و ڕەنگی زۆر
با هەڵفــڕێ بولبــول لەم چڵ بۆ ئەو چڵ
داتەکـێنێ ئاونگی ســارد لە ڕووی گــوڵ
جێ پێی مـــــالات پڕ لە ئاوی باران بێ
باعـــەی مـــەڕ و بزن و بەرخ و کــاران بێ
ئەو ئاوازەی هـیچ کـــەمـــانێ، هیچ نایـی
ئـاوازی وا نـەرم و خــــــۆشی لـێ نـایـێ
قـــاز و قـــورینگ بەقــاژە و دەنگی بـەسـۆز
بێنن بۆمـــان مـــوژدەی بەهار و نـەورۆز
با مـــراوی بەخــــێـــرایی و لەنگە لەنگ
بێن و بچـن بشـڵـــەقـێنن گـۆمی مــــەنگ
با ئـەو بەفــــرەی لە لووتکە ئەتوێتــــەوە
بەســـەر بـاڵای بووکی کـێـو شـۆڕبێـتـەوە
با کـەو جـێگەی لووتکەی سپیی بەرز بێ
هێند بخوێنێ لە قاسپەی خۆی وەڕس بێ
بـا وڵاتم لەمـــــــە زیاتـر جـــــوان بـێ
هەمـــوو شـتێ هۆی دڵخـۆشی و ژیـان بێ

ئەگــەر ئێـمــەی خــاوەن وڵات هـەژار بین
چەوسـێنراوەی دەس بێگانـە و زۆردار بین
بەئێمە چی جوانیی سروشت؟ هـی بەهار؟
ڕوونیی کـانی، ورشـەی گـیـا، چرۆی دار؟
کـام جـوانی، کـام ئاواز، کـام بۆنی خـۆش
دڵی هەژار لە خـەم ئەکـەن فـەرامـۆش؟
یا کـەی گـیـانی هـۆزێکی ڕووت و برسی
جوانـی و خۆشـیی کەژی بەهـار ئەپرسی؟
جوانیی وڵات هەستی وردی فێر کردووین
بەڵام ئـەوەی هـەسـتـی وردی بـردووین
بێگانـەیە و کـرداری ناشـیـرینـی
ئـەو لە کـوردی گـۆڕیوە یاسـای ژینـی!
ئەو یاسـایەی سـەربەسـتی، شـادمـانی
ئامـانجـیـەتی هەر یەک لە بەندەکـانی!
کـەچی ئێـسـتـا یاسای ژیان سـەراسـەر
تـەرخـانـە بۆ دڕندەی لاسـاری گـەر
هـەر ڕۆژ بەداوی پیـلانێ، تەگـبـیـرێ
ڕێگەی شـادی و سـەربەسـتیمان ئەگیرێ
بـەڵام ئـەوەی درێـغـی بـێ، با نـەیکـەن
بڕۆن لەسـەر ئەو کـردارانەی ئەیکەن
ئێـمـەش بەرەو ئامـانجـمـان ئازایانە
ئەڕۆین، خـەبات، یەککگرتن، پیـشـەمـانە
لە ژێر سـایەی بەهاری ژین گـەلی کـورد
بێ باک بژین، شـادمـان، درشت و ورد
کوردسـتـانی جوان مـاڵی کورد بێ و بەس
بەسـەریەوە نەبێ هـەرگـیـز بەشی کـەس

هۆنەر، هـاونیـشـتـمـانی حـاجی قـادری کـۆیی (١٢٤٠ – ١٣١٤)ی کـۆچی بووە و ئەو لە هۆنراو هـۆنینەوەشـدا پەیڕەویی لەو کردووە و لەسـەر ڕێ و شـوێنی ئەو ڕۆیشـتـووە و لە

ڕاستەقینەدا زۆربەی هۆنراوەکانی نیشتمانین و نیشتمانپەروەرێکی نەگۆڕە و لە پێناو کورد و کوردستاندا تێ دەکۆشێ، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە سەردێڕی نەگۆڕ هۆنیویەتەوە دەڵێ:

گەلێ سەختم
پوخت و نەختم
لە سەر مان و نەگۆڕانم
زۆر زۆر دڵنیا و بەجەختم

***

بەبیرکردنەوە و زمانم
بەعادەت و بەئامانجم
بەهیوا و هەست و مەبەستم
کوردم، ئەمە باش ئەزانم
هەردەم کوردم
بەڵگەی سەختی نەگۆڕانم
ڕۆژ لە ڕۆژهەڵات ئاوا بێ
لە ڕۆژئاوا هەڵبێتەوە
بەپێچەوانەی ئێستا، مانگ
لە ئاسمانا بخولێتەوە
مەردوم هەمووی
هەر چوار ڕەنگی ڕاست بێتەوە
ئەو ڕاستییە کە من کوردم
لە مێشکی من ناسڕێتەوە!!

***

هەر کەس بیەوێ وا نەبم
منی کورد بەبێگانە بم
تا خاوەنی:
ئەم دایکە مێهرەبانە بم
ئەم ئەشکەوت و کێوانە بم

پێویستە من
گۆڕ هەڵکەنی
ئامانجی ئەو کەسانە بم
لە هەر کاتێ
دوژمن تەنگی پێ هەڵچنیم
زەنگی مەترسی و لەناوچوون
لێ بات و ئیشارەم باتێ
ئەدەمە ئەم کەژ و کێوە
نەک دوژمن خۆی
دەنگی گوللەشی نامگاتێ
ئا لەو کاتەش
لە هیوای دوژمن گۆڕکردن
دڵم خاڵی نابێ ساتێ
***
دایکم لە باوەشم ئەگرێ
ئەو گوللەی دوژمن تێم ئەگرێ
ئەو باوەشە سەختە نابڕێ
منیش بۆ ژیان هەوڵ ئەدەم
یا داری هیوام بەر ئەگرێ
چەوسانەوە ڕەگی ئەبڕێ
کورد ئازاردان دوڵی ئەدڕێ
یا خۆ ئەمرم
چەند پیرۆزە
بۆ ئینسانێ
لەبن شاخێ
لە ئەشکەوتێ
لە پێناو ماف و سەربەستی
لە باوەش دایکی خۆی بمرێ

خۆ ئەو کاتە، هەر هیچ نەبێ
بەسەربەرزی
ئەو بستە پاک و پیرۆزەی
لەم کوردستانە پێ ئەبڕێ!!

زۆربەی هۆنراوەکانی خالید دلێر لەسەر نیشتمانپەروەری و ئازادیخوازی و دوژمنایەتیی ئیمپریالیزم هۆنراونەتەوە و مەبەستی ئەوەیە کە ئیمپریالیزم دوژمنی کورد و بەرەی مرۆیە و دوژمن ئەبێ دوژمنایەتی لەگەڵدا بکرێ، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە سەردێڕی سکالایەک هۆنیویەتەوە ئەوەمان بۆ دەردەخا و دەڵێ:

کوردم
یانێ! ئازا و کوردم
ئیمپریالیزمی دوژمنم
دابەشی کردووە وەتەنم
تاکو بەراتی کوردستان
زۆر بەئاسان
بچێتە باخەڵی ئەوان

***

منیش دەربەدەر بەقاچاخ!!
ئەبڕم سنووری نەبووی یاساخ!!
لە کوردستان
ئەوەی بەستراوە بەئێران
ئەوەی نان لێی دەس ناکەوێ
کانگەی بەراتیشە ئەوێ!!
بەلام نان لێی دەس ناکەوێ
زۆرباش ئەزانم دوژمنە
ئەو هۆی نزمیی ژینی منە
یەکێک هەمیشە برسییە
کە ڕەنجی خۆی بۆ خۆی نییە

***

سەرچاوەکان

١- ئاگر و ژیلە، هۆنراوەی خالید دلێر - سلێمانی ١٩٥٨.
٢- بەرەو لووتکەی ئاوات، هۆنراوەی خالید دلێر - سلێمانی ١٩٧٩.
٣- گزنگی هەتاو، هۆنراوەی خالید دلێر - کەرکووک ١٩٥٧.
٤- ئەو ڕۆژنامە نووسراوی محەمەد عەبدوڕەحمان زەنگەنە - بەغدا ١٩٨٥.

## حەمە سەدیقی مەحموودی

١٣٥٨ - ١٤٠٧

حەمە سەدیق، کوڕی مەلا برایم کە شۆرەتی مەحموودییە لە ساڵی ١٣٥٨ی کۆچی لە دێی باشبلاغی سەر بەسابلاخدا لە دایک بووە و خۆی گوتەنی هەر لە منداڵییەوە لە قوتابخانە ئاینییەکاندا خەریکی خوێندن بووە و لە دەوری لاویەتیدا بەزۆربەی مەڵبەندەکانی کوردستاندا گەڕاوە و لە هەر کوێدا مەلایەکی بینیوە لەلای وانەی خوێندووە و سەرئەنجام لە سابلاخدا ئیفتای وەرگرتووە و ئەوسا ماوەیەک خەریکی وانە وتنەوە بووە و پاشان بووەتە مامۆستا و لە قوتابخانە دەوڵەتییەکاندا وانەی داوەتە منداڵان و لە پاشا گوێزراوەتەوە بۆ تاران و بەڕۆژا وانەی وتووە و بەشەوا وانەی خوێندووە و پاشان و چووەتە کۆلێجی حقووق و لەوێدا لیسانسی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە سابلاخ و لەوێدا لە قوتابخانە ناوەندییەکاندا خەریکی وانە وتنەوە بووە، بەڵام بەداخەوە لە ساڵی ١٤٠٧ی کۆچی لە ڕێگەی سلاخ، بۆکاندا تەسادوفی کردووە و گیانی بەگیانی ئافەرین سپاردووە.

حەمە سەدیق بەهۆنەرێکی هەرە بەرزی کورد دێتە ژمار و ئەگەر لە هەندێ لە هۆنراوەکانیدا ناپوختەیی هەبێ ئەوە نرخی هۆنراوەکانی پێ ناشکێ، ئەو هەر لە منداڵییەوە هۆنراوی هۆنیوەتەوە، بەڵام زۆربەی هۆنراوەکانی لەناوچوون و لە هۆنینەوەی هۆنراویشدا لەسەر ڕێ و شوێنی گۆران ڕۆیشتووە و دەتوانین ئەو بەیەکێ لە هۆنەرانی نوێبێژ دانێین. جا لێرەدا هەندێ لە هۆنراوەکانی ئەو دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

ئەم هۆنەرەمان لە هۆنینەوە و دروستکردنی وشەی جوان و ڕەنگاوڕەنگ و ڕێکخستنی سەروا دەستێکی باڵای هەبووە، ئەو یەکەمین جار لە بەرامبەر سروشتی جوانی پاشبلاغا مرخی هۆنەریەتیی بزووتووە هەر لەو کاتەدا کە تکنیکی شارستانییەت دووربووە، چاوەندازەکان و دیمەنە جوانەکانی کوردستان ئەوی بەجارێ گەشاندووەتەوە بۆیە بەم جۆرە دەکەوێتە ستایشی سروشت و کوردستان و دەڵێ:

نیشتمانم، ئەی کوردستان
بارگە و بنەی لێ نا زستان!
بەهاری جوانت هاتەوە
بۆ کوردەکان، بەهاتەوە
لە داوێنی چیا و هەردان
لەسەر لووتکەی شاخ و بەردان
لە گوێ خڕان و لاشیوان
ڕەمزی ژیان بووە میوان
ورەی بەردا بەفری نسار
کە دی بزەی لێوی بەهار
بوو بەئەسرین بەرەو ڕووبار
لە چاوی خۆی تکایە خوار
ڕۆژێ سەد جار دەفڕێ خەیاڵ
بەرەو هەوری گەواڵ گەواڵ
نیگای دەگرێتە نێو باوەش
لەوێوە بەستێنی ڕووباران
کوڕان دەکرێن گوڵاو باران
پۆل پۆل کچان کۆمەڵ دەکەن
ئاور لە دڵاندا هەڵدەکەن
هەوریی هەور، لە شان دەکەن
تۆفانی نوور، پەخشان دەکەن
شایی دەگرن، گەڕی شایی
قوربانی بێ تەختی شایی
لەسەر نووالان، ئەم کاتە
سەرنج دیلی گوڵو کاتە
بۆنی هەڵاڵەیە بەیبوون
هەتوانی ناسۆری دەروون
چیمەن کە دیتی سەر زەوی
سەری بەهەشت دەکا نەوی

ئەی کوردستانی خۆشەویست
دڕووی گلێنەی نەتەویست
بەهاری جوانت هاتەوە
بۆ کوردەکان، بەهاتەوە

هۆنەر لەم پارچە هەڵبەستەدا چەند جیناسێکی جوانی بەکاربردووە، وەکو: (هاتەوە)، (بەهاتەوە)، (ڕووباران)، (باران)، (گەڕی شایی)، (تەختی شایی).

هۆنەر لە پارچە هەڵبەستێکیدا باسی کۆمەڵ دەکا و دەڵێ: مرۆ دەبێ بەپیاوەتی و مەردی ژیان باتە سەر و خۆی لە کاری خراپە و پەستی بپارێزێ و بۆ کۆمەڵ هەوڵ بدا تا کۆسپ و تەگەرەی ژینی خۆیشی لابا، وەکو دەڵێ:

ئەبێ بنیادەمی ژیر
بنیادەمی خاوەن بیر
ئافرەت و پیاو، لاو و پیر
گوێ شل نەکا بۆ تەقدیر
بەبێ مەترسی و ئەندێش
ئەبێ بڕوا بەرەو پێش
ئینسان چونکە ئینسانە
ئەرکی شانی گرانە
ڕێی ژینی پڕ لە ژانە
ئەبێ بڕوا مەردانە
ببڕێ ڕێگەی ئامانجی
تا دەسکەوێ قازانجی
خوو مەگرە قەت بەپەستی
لە تێکۆشین نەوەستی
مەردە ئەوەی کە بەستی
بەسەرکەوتەوە هەستی
سەرکەوت بۆ نیشتمانی
بۆ کۆمەڵی ئینسانی
مەخزە قەراغ و گۆشە
ئەم فکرە ژێری بۆشە

وتەی بەمێشک و هۆشە
مردن بۆ ژیان خۆشە
ژینی بەپەستی گیانە
مەرگە، نێوی ژیانە
بەتین کە بیر و بڕوات
لابەرە کۆسپی ژێر پات
برازێنەوە ئەو کات
تۆ بووکی جوانی ئاوات
ئاواتی ڕستگاری
لە دیلی و هەژاری

هۆنەر نیشتمانی خۆش دەوێ، ئەو نیشتمانەی کە تێیدا لە دایک بووە، گەلێ کەژ و کێوی تێدایە و هەر کوێی دەڕوانی گوڵ و گوڵزارە و دەڵێی بەهەشتە و لە هەموو شوێنێکیدا خوڕەی ئاوی هەڵدێرەکان دێتە گوێدا و لاوەکان لە تەقەڵا و هەوڵ و کۆششدان وەکو دەڵێ:

کوردستان نیشتمانی خاوێنم
شەو و ڕۆژ پێتەوە دەڕوانێم
خۆشەویستیم کریوی بۆ بایی
پڕ لە گەوهەر کراوە داوێنم
بەر بەیانت بەیانی ئیمانە
شەوەزەنگت پەنای ئامانە
تەمی شاخانی ڕەش لە داخانت
مەتەڵۆکەی ژیانی کوردانە
نیشتمان چاوەکانی قەندیلت
دەگرین بۆ کوڕانی وا دیلت
کە تۆ کەوتووی وەها توانایان
نییە دەستێ بنێنە ژێر پیلت
لەندە گوێی گرتووە لەبن ئاسمان
دەڵێ پەریان دەکەن لەوێ باسمان
کوردەکان ڕاپەڕن ئەگەر ئەمجەل
پشتیوانە خودای هەموو ئاسمان

ئاگری کێوی تاسە تاساوت
ئاگری ئاگرین و داماوت
بانگ ئەکا لێت کە بەرز ئەبێ ڕۆژی
وەک بڵێسەی دەروونی من ناوت
لە چیای کوێستانی زەنوێرت
خورەی ئاوی خورێنک ، هەڵدێرت
هان ئەدەن بۆ خەبات و تێکۆشان
لاوەکان بوێر و نەبوێرت
کورە کوردێکی بێتە مەیدانێ
سەر لە پێناوی نیشتمان دانێ
زیندووە هەر لە یادی مێژوودا
بیری کەس مەیلی ئەو کورە نانێ

هۆنەر گەلێ هۆنراوی بەسروشتە جوانەکەی کوردستاندا وتووە، ئەو سروشتەی کە خورەی هەڵدێر و شمشاڵی شوانی بوونەتە هۆی کورتژمی ئەو، بەتایبەت نەورۆز کە کاتێ سەرهەڵدەدا هەموو شوێنێک دەبێتە گوڵ و گوڵزار و پەلەوەران لە دەوریا کۆدەبنەوە، وە بای شەماڵ کاتێ هەڵکا، بۆ نوبەرامە تێکەڵ دەکا و بەهەوا و ئاهەنگی هەوری بەهار، فرمێسکی شادی لە چاوانەوە دێتە خوار و بەلام ئەمانە هیچ کامیان وەکو نێونیگای دڵدار لە دڵدا کار ناکەن، وەکو دەڵێ:

خورەی هەڵدێر، شمشاڵی شوان
بۆ شیعری جوان، ئیلهامی خوان
چەند بەسۆزن، چەند سیحراوین
لای لایەن بۆ کۆرپەی ئەوین

***

وەختێ کە هات نەورۆزی لاو
زستانی خست لە بەند و باو
ئاسمان لە سوێی گوڵی گوڵشەن
زامی جەرگی دێتە تەشەن

***

گەلاوێژی ئاسمانی شین
بەپرشنگی جوانی زێڕین
بەزەردەی لێو بەپێکەنین
تین ئەخاتە دڵی ئەوین

***

دەمی بەیان شنەی شەماڵ
دڵی بێ تین دێنێتە حاڵ
وەنەوشەی کز لەنێو تەما
ئەخاتە نێو کۆڕی سەما

***

بەپشت پشتی قامکی سروشت
کاتێ کە خۆر پرشنگی ڕشت
زەوی هەمووی چ دەشت چ کێو
بزەی زێوینی دێتە لێو

***

بەئاهەنگی هەوری بەهار
فرمێسکی دێتە خوار
لە چاوی ئاسمانەوە
بەموژدەی ژیانەوە

***

باران زەوی دەخەمڵێنێ
دەشتی هەزار بەهەشت دێنێ
خۆی بەدیاری ئەدا بەکێو
گوڵی بزەی گوڵدانی لێو

***

لە کێو و تەل، دەشت و چیا
لەسەر پەڕەی گوڵ یا گیا
چەن نەخشینە و چەن جوان ئاونگ
کاتێ کە لێی دا پرشنگ

وشــــه و تریفـــەی مـــانگەشـــەو
لـە ســـــــــووچی دڵ ئـەدا پـرتـەو
ئەخـــــاتە نـاو ئاگـــری ســــوور
تاســـه، مــەیل، هـەست و شــوعـوور

***

ئەوانە گـــشت ئەدەن بەگـــیـــــان
ژیان و مــــان بەڵام کــــامـــیـــــان
وەک نـیـــــــونیـگای هـی دڵدارین
ئـاوا لـە نـاخـی دڵ کــــــــــارین؟!

ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی تری ئەم هونەرەمان کە لەسەر شێوەی نوێ هۆنیویەتەوە لە سەردێڕی: ئەوا دیسان... داخی گران، کە بەڕاستی گەلێ شیرین و تەڕ و پاراوە، وەکو دەڵێ:

هیوا و
ئاواتی سەربەستی
ئەو هیوایەی هەڵی مژی
تەم و مژی
سووچی دڵی هەژارەکان
ئەوا دیسان
داخی گران
بەئاگری خۆپەرستی
ئەسووتێنرێ و
بەسەر دڵی خاکە لێوەی خوێن ئاژنی
کوردستانا
ئەتوێتەوە

***

چارەنووسی چەوساوەکان
چەوساوە دڵ تاساوەکان
وەکو هاوارێکی پساو

لەنێو گەرووی بڵێسەدا
بۆ ئێش، بۆ ئازار، تەنانەت بۆ مەرگێکی ڕەش
باوەش
ئەگرێتەوە
گرشەی بزەی گەلاوێژی
بەرزی ئەوین
ئەوینی ژین
هەوری چڵکن
***
سەری بڕی و
ئێستا بەدەم گژە باوە
بەرەو نەبوون
ئەشنێتەوە
گاشە بەردی ڕەشی خەفەت
بەسەر لەشیا
بەسەر لەشی سەر بەهەشیا
ئەتلێتەوە
ئەتلێتەوە
***
بەڵام... بڵێی...؟
بڵێی هەروا
گڕی هیوا
بڵێسە توورەکانی خۆی
بخواتەوە
تاریکاییی شەوەزەنگی
پشوو هەڵبڕ
بڕشێتەوە؟
***

بڵێی هەروا
بیرە پرش و بڵاوەکان
لەنێو دەشتی بێ سنووری تەمی ژیان
ڕێبوارێکی ناشارەزای
ڕێ ون بوو بن؟
پەنجەی ڕەشی نامرادی
ئارەقی ماندووبوونیان
بسڕێتەوە؟

سەرچاوەکان
١- وەنەوشە هۆنراوەی حەمە سەدیقی مەحموودی - ورمێ ١٣٦٧.
٢- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەمەلا حەمە سەدیقی مەحموودی.

## شێرکۆ بێکەس

١٣٦٠ - ...

شێرکۆ، کوڕی فایق بێکەسە و لە ساڵی ١٣٦٠ی کۆچی لە سلێمانیدا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و دەوری سەرەتایی لە سلێمانی و دەوری ناوەندیی لە بەغدا تەواو کردووە و لە تەمەنی دە ساڵیدا یەکەمین پارچە هەڵبەستی لە ڕۆژنامەی ژیندا بڵاوبووەتەوە. لە تافی جوانیدا لە بەرابەر ڕژێمی عارفدا ڕادەوەستێ و ئەوسا دەبێتە پێشمەرگە و لە ئێزگەی دەنگی کوردستاندا خەریکی کار دەبێ و لە پاشا لەگەڵ ڕۆژنامەی برایەتیدا هاوکاری دەکا و ئەوسا دەگیرێ و لە لایەن بەعسییەکانەوە بۆ ماوەی چەند ساڵ بۆ بەغدا دوور خرایەوە و لە ساڵی ١٤٠٦ی کۆچی ڕووی کردە ئەورووپا و لە ئیتاڵیادا نیشتەجێ بوو و، لە ساڵی ١٩٨٧ی زاینیدا خەڵاتی وێژەیی لە سەرەک وەزیری سوێد وەرگرت و بەم بۆنەوە گەلێک لە هۆنراوەکانی وەرگێڕرایە سەر زمانی نۆروێژی و بڵاو بوونەوە.

شێرکۆ بێکەس بەیەکێ لە هۆنەرانی هەرە بەرزی کورد دێتە ژمار و زۆربەی هۆنراوەکانی ئەو بەچەشنێکی نوێ هۆنراونەتەوە و لە هۆنراودا ڕێچکەیەکی تازەی گرتووەتە بەر و خۆی لە بیری کۆن لاداوە و بۆ ڕەنگینکردنی هۆنراوەکانی گەلێ هەوڵی داوە و مەبەستەکانی بەقووڵی دەربڕیوە و لە هۆنراوەکانیدا پتر لە کەلەپووری نەتەوایەتی و فۆلکلۆر کەڵکی

وەرگرتووە و تا ئێستا چەند بەرهەمی بەناوەکانی: «تریفەی هەڵبەست، کەژاوەی گریان، کاوەی ئاسنگەر، من تێنوێتیم بەگڕ ئەشکێ، ئاسک، کازیوە، دوو سرووودی کێوی، پیرەمێرد و زەریا (وەرگێڕانی)، ڕووبار، دەربەندی پەپوولە» بڵاوبوونەتەوە.

ئەرکی هونەر ئەوەیە کە بەهیوای بەدیهێنانی ئەو شتانە بێ کە هێشتا نەهاتوونەتە دی و هونەر پێویستە بەدوای ئەو شتانە بگەڕێ کە سوودی گشتییان تێدایە، چونکە ژیانی مرۆ هەوراز و نشێوی هەیە و دەبێ بۆ سەرکەوتنی ژیان گەلێ ئەرک و ڕەنج بکێشێ و ئەمە هونەرە کە دەبێ ئەو بۆ ژیانێکی سادە و ساکار هان بدا و لە چەوتییەکان لای بدا و پەیامی سەرکەوتنی پێ بدا. کاتێ کە ژیان کرچوکاڵ بوو و، خۆر تازە چاوی دەپشکووت و مرۆ بیری دەبزووت، ئاسمان و ئەستێرە و دەریا کە تازە بەدی هاتبوون و چیا و درەخت و گژوگیا کە بەسروشتەوە لکابوون، زەوی هێشتا هاڵاوی نەدیبوو، زەردەشت لە مەڵبەندی کوردەواری سەری هەڵدا و ئاڤێستای بۆ کورد هێنا تا پەیامی ئەهوورامەزدا بەخەڵک ڕاگەیەنێ و ئەوان بخاتە سەر ڕێی ڕاست، چونکە زەردەشتیش هونەر بوو و، تا کورد خاوەن ئاوێستا بوو هەموو شتێکی لەژێر دەستابوو، بەڵام هەرکە ئاوێستایان لە کوردەکان دزی و وشە پیرۆزەکانیان لێ ڕنی، ڕووناکیی کورد کەوتە کزی و دەم و دڵ بیریان بەسترا و لەو ساتەوە تا ئێستا هەر هان لە ناو پەرۆشی، وەکو دەڵێ:

ژیان: هێشتا کرچ و کاڵ بوو

زمانی ئەیگرت و لاڵ بوو...

گەردوون: تەمەنی مناڵ بوو

خۆر: تازە چاوی ئەپشکووت

مرۆڤ: تازە بیری ئەبزووت!

پێغەمبەرانی خوا ناردوو...

ژمارەیان ئێجگار کەم بوو

ئاسمان و ئەستێرە و دەریا...

چیا و درەخت و گژوگیا...

تازە ئەبوون و ئەخوڵقان

بەسروشتەوە ئەلکان...

زەمین... هێشتا

هاڵاو لە لەشی هەڵئەستا!

کە – ئاوێستا!

لە ئاسۆی بیری زەردەشتا
بۆ کورد هەڵهات
کە پەیامی... ئاهورمزدا
لە لووتکەوە بانگی هەڵدا
بۆ گشت دنیا...
بوو بەئاوات!
***
تا کورد خاوەن ئاوێستا بوو
خۆریشی لەژێر دەستا بوو!!
هەتاکو چرای ئاوێستا
دائەگیرسا
بەرچاوی بیرمان ڕووناک بوو
سەرچاوەی دەروونمان پاک بوو
بەڵام کە ئاوێستا ...برا...
دزراو گۆڕا
بەنینۆکی ڕقوکینە
وشەی پیرۆزی لێ ڕنرا...
مۆری بێگانەی پیانرا...
ڕووناکیمان کەوتە کزی
بەربووینەوە بەرەو نزمی
کە لە دەسمان چوو... ئاوێستا
دەم و دڵ و بیرمان بەسترا
لەو ساکەوە هەتا ئێستا!

بەپێی بیروڕای شێرکۆ، هونەر دەبێ بکەوێتە هەوڵ و تێکۆشین و خەڵک وریابکاتەوە؛ چونکە ئەو ئازارەی کە لە ناخی دڵی هونەرەوە هەڵدەقوڵێت مرۆڤایەتی باوەشی بۆ دەکاتەوە و ئەوەی کە لە ناو دەرد و ژاندا بێ، هەر هونەرە بۆیە هەموو هەڵسوکەوتێکی هونەرە و هونەرمەندی ڕاستەقینە ئەوەیە کە دونیایەک بنیات بنێ کە بڕوای پێیەتی، نەک ئەو دونیایەی کە تیایا دەژی و جا لە پارچە هەڵبەستێکیدا ڕوو دەکاتە هونەران و دەڵێ: ئەی

هۆنەرانی وڵاتەکەم، بۆچی خۆتان تەنیا لە دەوارێکی هۆبەی هۆنراودا قەتیس دەکەن و هەر تەنیا ئاوازێک دەچڕن و تۆی گوڵێک دەچێنن کەچی هۆنراو هەموو جێ و شوێنێک دەبینێ، کەڵکەڵە و خەیاڵ کەی سنووری هەیە، ئەم دڵە بچکۆڵە دنیایەکی خەیاڵیی تیا جێ دەبێتەوە و دەتوانن هەمـوو شـتـێک دەربڕن و خـەڵک لەم ڕێگەوە وریاکـەنەوە، بەڵام بەمـەرجێ ڕاستەقینە بۆ خەڵک ڕوون کەنەوە و ئەمەش ڕاسپێری ئێوەیە، وەکو دەڵێ:

شاعیرانی وڵاتەکەم

بۆچی خۆتان لەناو تەنها

دەوارێکی هۆبەی شیعرا

قەتیس ئەکەن؟!

بۆ لە یەک ئاواز ئەخوێنن؟!

بۆ تۆی گوڵێک ئەچێنن؟!

چاوی شیعر، کوێ نابینێ!

گوێچکەی شیعر چی نابیسێ!

خەیاڵ کوا سنووری هەیە

بەهرە کوا ڕێی دووری هەیە

بڕوا بکەن!

ئا ئەم دڵە بچکۆڵەیە

کە ئەوەندەی هەرمێیەکە

نەک سەرزەمین

گەردوون جێگەی تیا بووەتەوە و

زمانیشم تەنها نووکی

بەگینگڵی قەڵەمێکە!

شێرکۆ کە یەکێ لە هۆنەرانی نوێبێژە، هۆنراوەکانی لە سنووری خۆیی پەلی هاوێشتووە و هەموو جۆرە هۆنراوێکی هۆنیوەتەوە: سروشتی، نیشتمانی، کۆمەڵایەتی، دڵداری، وە لە هەموویاندا وشەی جوان و ساکاری کوردیی بەکار بردوون، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەیدا کە لە سەردێڕی (کە تۆم ناسی) هۆنیویەتەوە دەڵێ: پەریی کەڵکەڵەی هەمیشە و خوای دڵداری تازە پیشەم و خولیای گەرمی هەرزەکاری و فریشتەی ژیانی تازە و ڕۆژانی پڕ لە خەم و پەژارەی ڕابردووم کە تۆم ناسی هەموویان لێم بەدەربوون و برینەکانم بەجارێ

ســارێژبوونەوە و هەوری ناســۆرم بەجــارێ توایەوە و ژیانم گــۆڕا و تەمــەنم لە نوێ نووسرایەوە، وەکو دەڵێ:

پەریی خــەیاڵی هەمــیشــەم
خــوای دڵداری تازە پیــشــەم
خــولیــای گــەرمی هەرزەکاریم
تاقـــــانەی بەری دڵداریم...
فــــریشـــتــــەی ژیانی تازەم
گــۆرانیی خــۆشی ئاوازەم

***

تەمـی خـــــەمی بـەری چاوم
ونبــــــووی ناو دڵداری ناوم:
ڕۆژانـی ئەوســـای ڕابوردووم
دڵی بێ هەسـتی وەک مـردووم
گۆشەگیـری و گـیـانی تەنگم
ســـــەراپا ژیـنـی بێ دەنـگم
کـە تۆم ناسی لێم بەدەربوون
وەک نەمدیبن لێم بەسەرچوون
کە تۆم ناسی سـۆزی گـیـانم
ســـارێژی کـــرد زامـی ژانم
کـە تۆم ناسـی ئاشـی بەخـتم
کـەوتە گـەڕی خـۆش وەخـتم
هـەوری نـاســــــۆرم تـوایـەوە
عـومـرم لە نوێ نووســرایەوە
پەری خـــەیاڵی هەمــیـشــەم
خــوای دڵداری تازە پیــشــەم

هەوێنی هۆنراوەکانی شێرکۆ لە کانگای ژیانی کوردەوارییەوە سەرچاوەیان گرتووە و لە هۆنینەوەی هۆنراودا لاسـایی هـۆنەرە پێـشـووەکـانی نەکـردووەتەوە و تەوقی عـەرووز و لاساکـردنەوەی شکاندووە و لەسـەر ڕێبازی شـێخ نووری و گـۆران ڕۆیشـتـووە و لەگـەڵ

ئەوەشدا ڕێز بۆ هۆنەرەکانی پێشوو دادەنێ و هەندێ جار لە هۆنراوەکانیدا دیاردیدان پێ دەکا، وە زۆربەی هۆنراوەکانی نوێنگەی ژیانی کوردەوارین، چونکە لە قوتابخانەی سروشتی نیشتمانەکەیدا پێ گەیشتووە و گەلێ ئاوارەیی و دەربەدەری دیوە، وە سۆزی نیشتمانپەروەری لە هۆنراوەکانیدا دەردەکەوێ و ئەویش هەر لەسەر ڕێی باوکیی دەڕوا.
ئەمەش چەند پارچە هەڵبەستێکی تری ئەم هۆنەرە کە دەڵێ:

**هەنگوین**

«نالی» پرسیی:
هەنگوین چ ڕۆژێ پەیدا بوو؟!
مەم و زین پێکەوە وتیان:
هەنگوین ئەو ڕۆژە پەیدا بوو
کە شانەی دەمی دوو دڵدار
هەنگی ماچیان بەخێو کرد و
لە لادێوە ناردیانە شار!

***

**بەفر**

منداڵ بووم و سەرەتا بوو،
خۆشەویستیت:
تۆپەڵە بەفرێ بوو بچووک
بەقەد تۆپێ!
ڕۆژ هات و چوو
سەرنج ئەدەم:
هەتا تەمەن
بەرەو لێژایی مل بنێ
تۆپەڵە بەفری ئەوینیش
خول ئەخوات و
دائەگەڕێ و
گەورە ئەبێ
ڕۆژێکیش دێ:

ئەی وڵاتە سپیکەڵە غەمینەکەم!
کە قورسایی کێوی بەفر
بەم دڵە بچکۆلانەیە
هەڵنەگیرێ و
هەر بەدەستی خۆشەویستی
تۆ بکوژرێ!

***

ئەسپ

ئەسپێک خۆی دا لە گێژەنێ
گێژەن وتی: ئەگەر هات و پەڕیتەوە
چیت ئەدەنێ؟!
ئەسپ وتی: سوارێک لە پاشکۆی خۆیەوە
خەمی دارستان هەڵبگرێ و
بەدەم هۆرەی ڕەشەباوە
پێ بکەنێ!

یەکێ لە بەرهەکانی شێرکۆ، چیرۆکی (کاوەی ئاسنگەرە) کە بریتییە لە خەباتی بێ وچانی کاوەی ئاسنگەر و بەشێکە لە مێژووی ئەفسانەیی نەتەوەکەمان کە گەلێ گرنگ و بایێدارە و نووسینی ئەم چەشنە بەرهەمە گەرچی وێنەی لە وێژەی کوردیدا کەمە، بەڵام لە وێژەی جیهاندا دەگەڕێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ لەمەوپێش کە یونانییەکان ئەم چەشنە داستانەیان بووە و ئەرەستوو دیاردی پێ کردوون و بەر لە شێرکۆش دوو هۆنەری تری کورد هەوڵی ئەوەیان داوە کە چیرۆکی کاوە بکەنە بەرهەمێکی شانۆیی کە یەکەمی زەکی ئەحمەد هەنارییە و دووەمی گۆرانە و بەرهەمەکەی هەناری تەواو بووە، بەڵام هی گۆران بریتییە لە تەنیا پەردەیەک کە هەردووکیان خۆیان بەستووەتە چیرۆکی کاوەی ئاسنگەری کە لە شانامەی فیردەوسیدا هاتووە و لەم چیرۆکەدا ئەژی دەهاک شەوێکیان خەوێکی ترسناک دەبینێ و دەکەوێتە ناو مەترسییەوە و داوا لە خەو لێکدەران و پیاوە ئاینییەکان دەکا کە خەوەکەی بۆ لێکدەنەوە و ئەوانیش دەڵێن دەبێ گەوانامەیەک بنووسێن و هەمووی خەڵک مۆری کا و لەم کاتەدا کاوەی ئاسنگەر خۆی دەکا بەناوی کۆشکەکەدا و داوای هەژدەیەمین کوڕەکەی دەکا کە پیاوکوژەکانی شا گرتبوویان تا مێشکەکەی دەربێنن و بیدەنە دەرخواردی مارەکانی سەر شانی شا؛ چونکە کوڕەکانی تریان بەو چەشنە

کوشتبوو، ئەوسا پیاوە ئاینییەکان داوایان لە کاوە کرد کە گەوانامەکە مۆرکا تا کوڕەکەی پێ بدەنەوە، کاوە کە ئەمەی بیست تووڕە بوو و گەوانامەکەی دڕی و لەگەڵ کوڕەکەیا دەربازبوو، ئەوسا خەڵکی لە دەوری خۆیا کۆکردەوە و داوای لێیان کرد کە هەموو ڕاپەڕن و ئەو پادشا ستەمکارە لەناوبەرن و ئەوە بوو کە کەوڵەکەی کردە ئاڵا و سەرەنجام هێرشی بردە سەر لەشکری ئەژیدەهاک و ئەوانی تێکشکان و ئەوسا ئەژیدەهاکیان لە دەماوەندا بەند کرد تا لەوێدا مرد. بەڕاستی شێرکۆ چیرۆکەکەی بەچەشنێکی جوانتر نووسیوە و هونەری تێدا نواندووە کە ئەوا چەند دێرێکی لێرەدا دێنین وەکو دەڵێ:

**تابلۆی هەشتەم**

جێگا دوکانەکەی کاوەی ئاسنگەرە، کات بەیانییەکی زووە، «پشتکۆ»ی هاوڕێی گوردۆ، لە دوای گرتنی گوردۆ بووەتە شاگردی کاوە، تازە دوکانەکەی کردووەتەوە و خەریکی ڕێکخستنی کەرەسەی ئیشە، پاش ماوەیەک بێ دەنگی، بەدەنگی بەرز لەبەرخۆیەوە دەڵێت:

لەگەڵ دڵی شێت و وێڵما
هەردە و دۆڵ و لووتکە نەما
نەیپێوم و پیا نەگەڕێم
یا دەوەن و دارێ نەما
نەمناسن و نەزانن کێم!
هەتا ئەژنۆ شل بوو گەڕام
تا سنوورێک خەیاڵ ئەیدی
گەڕام... ڕۆشتم
بەڵام ئەنجام... نەگەیشتم
بەو دنیایەی کە من ویستم
**– پشوویەک –**
سەردەمێکی تر هات و چوو
هەر ئاوارە، هیلاک، وێڵ بووم
بەڕووی ئاراما... شەوکێل بووم
سەر هەڵگرتوو
لەناو باوەشی سروشتا
ئەگەڕام بەشوێن بەهەشتا

بەڵام ئەنجام تێ گەیشتم
کە لەوێشدا خۆمم نەدی
خۆم نەناسی!
**- پشوویەک -**
سەردەمێکی تری تەمەن
بۆ خوای دادپەروەری گەڕام
تا لە دیلی ڕزگارم کەن
تا بگەمە ڕۆژی ئەنجام
کڕنووشم برد!
مانگم پەرست، خۆرم پەرست
دەریام پەرست، گڕم پەرست
بەڵام ئەنجام هەر وێڵی بوو
هەر تاریکی، هەر دیلی بوو
**- پشوویەک -**
سەردەمێکی تر چاوی یار
باڵای شۆخوشەنگی نازدار
ئاواتم بوون، خولیای گیان بوون
هەوێنی هەموو ژیان بوون
بەڵام ئەنجام، نەگەیشتم
بەو هیوایەی کە من ویستم
**- پشوویەک -**
بەڵام لە گەڕان نەکەوتم
ورەی ئاواتم بەرنەدا!
هەتا بەئارام گەیشتم
تاکو کۆڵم بەدیلی دا
تا وێڵ بوونم بەقۆناغی
ئاوەدانی ڕێگە گەیاند!
هەتا نائومێدی و ناخی
سەرگەدانیم لە دڵا مرد

**- پشوویەک -**

بیری ئازادیم دۆزییەوە

خۆم پێ ناسی

خۆی پێ ناسیم!

ڕووناکترین ڕێم بینیەوە

سەرکەوتنی ژینم تیا دی

زانیی من کێم!

لە کوورەیا خۆم توانەوە

تا لەگەڵیا ژیامەوە

سەرچاوەکان


١- تریفەی هەڵبەست، لە هۆنراوەی شێرکۆ بێکەس - بەغدا ١٩٦٨.

٢- دوو سروودی کێوی - شێرکۆ بێکەس - بەغدا ١٩٨٠.

٣- ڕووبار - چیرۆکە شیعر - شێرکۆ بێکەس - بەغدا ١٩٨٤.

٤- کازیوە - شێرکۆ بێکەس - سلێمانی ١٩٧٨.

٥- کەژاوەی گریان - شێرکۆ بێکەس - سلێمانی ١٩٦٩.

٦- من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ - شێرکۆ بێکەس - بەغدا ١٩٧٣.

٧- پیرەمێرد و زەریا - شێرکۆ بێکەس - بەغدا ١٩٨٣.

٨- ئاسک - شێرکۆ بێکەس - بەغدا ١٩٧٨.

٩- کاوەی ئاسنگەر - شێرکۆ بێکەس - سلێمانی ١٩٧١.


## خورشیدە بابان

١٣٦٠ - ...

خورشید، کچی ڕەئووف بەگی بابان لە ساڵی ١٣٦٠ی کۆچی لە هەڵەبجەدا هاتووەتە جیهانەوە و لە تەمەنی هەشت ساڵیدا بێ باوک بووە و لەمەوە تووشی گەلێ تەنگوچەڵەمەی ژیان و نەهاتی بووە و بەخوێندنی پچڕپچڕ توانیویەتی پۆلی شەشەمی ناوەندی تەواو بکا و پاشان بووەتە مامۆستای قوتابخانەیەک و ئەوسا چووەتە بەشی لەش ساخی و بۆ ماوەی دوو ساڵ خەریکی خوێندن بووە و بەپەیەکەم دەرچووە و ئێستاش هەر لەسەر ئەو کارەیە.

خورشیدە بابان یەکێ لە هونەرانی ئەم چەرخەیە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی هۆنراو

هۆنینەوە بووە و هەمووی ژیانی خۆی بۆ خوێندنەوە و هۆنراو هۆنینەوە تەرخان کردووە و لەم مەیدانەدا گۆی هونەری بردووەتەوە و لە ڕاستەقینەدا دەتوانین بڵێین کە هۆنەرێکی سروشتی خواداده و ڕەنگە لە داهاتوودا ئەو هۆنەرەمان بگاتە ڕیزی کەڵە هۆنەرانی کورد.

خورشیدە هۆنەرێکی زۆر بەرزە و تا ئێستا دوو کۆمەڵە هۆنراوی بەناوەکای: (تیشک) و (دیاری) و(یادگار) چاپ و بڵاوبوونەتەوە و هۆنراوەکانی هەتا حەز بکەی جوان و شیرین و پاراون و زۆربەی هۆنراوەکانی لەسەر کێشی خۆماڵی هۆنیوەتەوە و پتر وشەی ساکاری کوردیی بەکاربردوون و زۆربەی هۆنراوەکانی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتین.

خورشیدە یەکەمین پارچە هۆنراوی کە گیانی هۆنەریەتیی بزواندووە و ئەوی خستووەتە سەر هۆنراو هۆنینەوە بەناوی لەگەڵ قاسپەی کەوە کە بەشێوەیەکی جوان هۆنیویەتەوە و دەڵێ:

ئەی کەو بخوێنە لەگەڵ من بەکوڵ

من بۆ نیشتمان تۆ بۆ جوانیی گوڵ

تۆ لە مۆسیقای قورگێکی ڕەنگین

من لە سەرچاوەی دڵێکی غەمگین

دەسا بخوێنە لەگەڵ من بەجۆش

من بەوشەی جوان، تۆ بەقاسپەی خۆش

من بۆ کوردستان، تۆ بۆ کوێستانان

من بۆ سەربەستی، تۆ بۆ سەر شاخان

من بۆ تروسکەی هیوای خاکەکەم

تۆ بۆ سەر لووتکەی دڵگیر و بێ خەم

تۆ بقاسپێنە بۆ هاوڕێی لە دوور

من بۆ کوردەکەی ڕێی خەباتی سوور

تۆ بۆ سێبەر و چەشمەی دڵفرێن

من بۆ کوردەکەی مێژوو پڕ لە خوێن

تۆ بۆ ناو ڕەز و دار گوێز و نزار

من ئەڵێم بمرێ بەدکار و زۆردار

بخوێنە بەڵام بەقاسپەی زوڵاڵ

دڵ بێنەرە کوڵ بفرێنە خەیاڵ

بفـــڕێنه خـــهیاڵ بۆ کـــۆڕی هـهواڵ
بۆ زڕەی زنجـــیـــر، دەنگی ئاڵەئاڵ
کـــەوی وردیلەی کـــەژی پڕ گـــەوهـەر
ئەی باڵداری جـوان خـــاوەنـی هونـەر
لەگـــەڵ تیـــشکی ڕوون، گـــزنگی بـەیان
ڕووناک کــــه دەروون بەئاوازەی جــوان
لەگـــــەڵ کـــــاروانی ئازادیی گـــــەلان
بڵێ بژی کــورد، بژی کـــوردســـتـــان

خورشیدە بابان گراوی سروشتە، سروشتە جوانەکەی کوردستان، ئەو سروشتەی کە بەهاری پڕ لە گوڵ و گوڵاڵەیە و کێوەکانی پڕ لە شیناوەردی و گیا و ڕووەکە، بۆ ئەوەی کچان و کوڕان لە ئەوپەڕی شایی و خۆشیدا لەناویدا ژیان بەرنە سەر، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە سەردێڕی لەگەڵ بەهارا هۆنیویەتەوە دەڵێ:

بەهـار تـازەیـه ســـــروشــــتی جـــــوانت
پـڕ ئـاوازەیـه شــــــێـــــوەی ژیـانـت
زۆر جــوان خـــەمـــلاوە خـــەیمەی گـــوڵانت
بـەرز و ڕازاوە کـــــەژ و کـــــێـــــوانت
وەک ڕەوشـــــتی جـــوان وێنەی دڵگیـــرت
بـووەتـــه ئـاوێـنـەی ئـاوات و بـیــــــرت
ســــێــــبـــــەری گــــوڵ و لقـــوپۆی دارت
پـڕ لە بـەرهـەمــــــه هـەوڵ و کـــــــردارت
ئـەمــــــــەوێـت بـدوێـم لـه بـاسـت بـەیـنـێ
بەلام بێ کـــاتم بیـــخـــــه ســـبـــەینێ
بەم چەند وشـــــەیە لەگــــــەڵ تۆ ئەدوێم
چەند ئاواتێکن ئەمـــــەوێت بیــــڵـــێم
خــــۆزگــــه ئەمــــــئـــەدی تاقـــــه هـەژارێ
کــــز و کــــەســـاسی تۆزە غـــەمـــبـــارێ
خۆزگە گشت ڕوویەک وەک تۆ گەش بووایە
دڵی گشت کەسێک وەک تۆ خـوەش بووایە

جا ئەوسا ئەمن گەرمەی کارم بوو

خەزانی پایز نەوبەهارم بوو

خورشید بابان دیارە لە ژیاندا تووشی گەلێ تەنگوچەڵەمە و ڕەنج و ئازار بووە، چونکە بەهەتیوی گەورە بووە بۆیە لە پارچە هەڵبەستێکیدا سکاڵا لە دایکی دەکا کە بۆچی هێناویەتە کۆڕی ژیانەوە تا لە باوەشی خەم و پەژارەدا ژیان باتە سەر و تەمەنی بەخەم و خەفەت ڕابوێرێ و لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێ: من گەرچی ڕێم سەخت و ناهەموارە بەڵام هیچ کاتێ سەردانانەوێنم و ڕێگای خۆم دەبڕم و سەر شۆڕ ناکەمەوە، هەتا سەردەکەوم و ئەوسا گۆرانیی هیوا دەڵێم، وەکو دەڵێ:

دایکە لای لایەی چۆنت بۆ کردم

بۆ کۆڕی مەینەت بۆ چیت هاوردم

بۆ هەڵت گرتم بەباوەشی غەم

پەروەردەت کردم بۆ سەختی و ستەم

دایکە لای لایەی نیوەشەوانت

دەنگی بەسۆزی دەمەو بەیانت

گشتی بەئازار هاتە کایەوە

بۆیە بێزاری بۆ من مایەوە

بەڵام پێت ئەڵێم منی ڕۆڵەی غەم

ئەڕۆم ئەیبڕم گەرچی سەختە ڕێم

سەر دانانوێنم بۆ تاریکیی شەو

دۆش دانامێنم من بەو ئەکەم ڕەو

تاکو کڵپەی بێت ئاگری دەروون

ناڵە و کزەی بێت ئازاری بێ‌روون

زیاتر ئەیکەمە مەشخەڵی ڕێی ڕوون

باشتر ئەیناسم بەدەورانی دوون

دایکە ئەزانم داری بێشکەکەم

لە کوێ هانییان لە کام بێشە و چەم

بۆیە ستەمە سەر دانەوێنم

هەرگیز ملکەچ کەم کزۆڵ بنوێنم

دایە ئەزانم چۆن هانیمتە ناو
بەچی گۆش کرام بەکام هەوا و ئاو
ئەزانم لە کام سروشت پێ گەییم
لە کام هەستی پاک هاتم تێ گەییم
بۆیە هەر ئەڵێم بەمەردی مردن
نەک ساتێ ژیان بەسەرشۆڕکردن
دەنگی پڕ سۆزت بەدەم لایەوە
ئەزانم لە کوێ دەنگی دایەوە
بۆیە کاری کرد لە هەست و گیانم
جا تۆ گوێ بگرە لە بەستەکانم
گۆرانیی هیوا بەستەی سەرکەوتن
برایەتیی ڕاست، دەستی یەک گرتن
دایکە ئەزانم هەر چاوەڕێی تۆ
هەردەم گوێ ئەگری کەی من بێمە گۆ
بەڵێ تێکۆشین بۆ ئاواتی جوان
با دادپەروەر بین، شادکەین نیشتمان
ڕیشەی دڵ پیسی دەربێنین لەبن
هەرگیز لە یەکتر نەبین، بەدوژمن
گۆرانی هیوابەستەی سەرکەوتن
هەتاکو دوا کات مەبەستی منن

خورشیدە بابان لە فۆلکلۆریش گەلێ سوود و کەڵکی وەرگرتووە و گۆرانییە نەتەوایەتییەکانی خستووەتە سەر قاڵبی هۆنراو و بەشێوەیەکی جوان هۆنیونەتەوە و هۆنراوەکانی گەرچی سادەن بەڵام گەلێ شیرین و ڕەوانن، وەکو لەم هۆنراوانەدا دەڵێ:

نە دەردم وێنەی دەردەدارانە
نە زامم وێنەی گەستەی مارانە
دەردم ئاوێتەی دەردی فەرهادە
منیش چون فەرهاد ڕەنجم وە بادە
باخێکم ناشتووە لەو ڕەزە دەیمە
لە دەوریماڵتان گوڵ داویە خەیمە

لەیلێ خەوتگە چون خەرمانی گوڵ
پەنجەی چون شمشاڵ ها وە بانی دڵ
بالاکەت بەرزە بۆ خۆی هەڵچووە
ئەمامی بەیە سێوی گرتووە
بالاکەت بەرزە بەقەد چنارێ
کێ تەفرەی داوی بەردی لێ وارێ
ئەو بالا بەرزە ئەو تەل بەسەرە
منی کوشتووە و خۆی بێ خەبەرە
بالا وە بەرزی قەد وە باریکی
ئەستێرەی سیوەیل کەوتە تاریکی

سەرچاوەکان

١- تیشک، هۆنراوەی خورشیدە بابان - سلێمانی ١٩٧٠.
٢- دیاری و یادگار، هۆنراوەی خورشیدە بابان - سلێمانی ١٩٦٩.

## رەفیق سابیر

١٣٦٠ - ...

رەفیق سابیر لە ساڵی ١٣٦٠ی کۆچی لە قەڵادزێدا لە دایک بووە و دەوری سەرەتایی و ناوەندیی هەر لەو شارەدا تەواو کردووە و پاشان چووەتە بەغدا و لە زانکۆی ئەو شارەدا لیسانسی لە ڕشتەی وێژەی کوردیدا وەرگرتووە و ئەوسا لەسەر کاری میریدا دامەزراوە، بەڵام بەهۆی زەبروزەنگی ڕژێمی بەعسی عێراقەوە ناچار هەڵاتووەتە باکوور و چووەتە ڕیزی پێشمەرگە و لەوێدا دەستی کردووەتە هۆنراو هۆنینەوە و پاشان ڕۆیشتووەتە ئەورووپا و ئێستاش هەر لەوێ دایە. سابیر لە هۆنینەوەی هۆنراوی کوردیدا دەستێکی باڵای هەیە و زۆربەی هۆنراوەکانی لەسەر شێوەی نوێ هۆنراونەتەوە کە گەلێ شیرین و پاراو و ڕەوانن و تا ئێستا کۆمەڵە هۆنراوێکی بەناوی ڕێژنە لە چاپ دراوە.

ڕەفیق سابیر هۆنراوەکانی لەسەر گیروگرفتی کۆمەڵ هۆنیوەتەوە و لە پارچە هەڵبەستێکیدا کە لە سەردێڕی ولاتەکەم هۆنیویەتەوە، باسی ئەوە دەکا کە چۆن سەدان ساڵە خوێنی خەڵک دەرێژن و پەنجەی نەوەکان بەخوێناو دەخشێنن و کوردستانیان بەئاگر گرداوە و گەلەکەی دەچەوسێننەوە، وەکو دەڵێ:

وڵاتەکەم
سەدان ساڵە خوێن دەچێنێ،
کراسی گڕ دەکاتە بەر نەوەکانی
پەنجەکانی
بەخوێناوی ڕۆڵەکانی دەنەخشێنێ
گیانە مەگری!
ها... ئەوە پێشانگای خوێن و
وەرە خوێنی دڵدارەکەت بناسەوە
ئەوەتانێ شەهیدەکان
بەڕیز سەریان لە گۆڕەوە دەرهێناوە
وەرە دڵدارە ونەکەت بدۆزەوە
گیانە مەگری...!
ها بمکوژە و چۆڕ چۆڕە خوێنم بخۆوە
بەڵام مەگری...
چۆن نازانی؟
دڵدارەکەت
ڕێبواری ڕێگەی هەتاوە
پرچی بەیان و برووسکە شانە دەکا
باوەش بەلووتکە و گۆرانی و ئاسۆیەکی سوورا دەکا
دە تۆ مەگری
چۆن نازانی؟
کوردستانم کراسی گڕ دەکاتە بەر ڕۆڵەکانی و
پەنجەی بەخوێنی نەوەکان دەنەخشێنێ
کوردستانم
لەژێر شمشێر بەر پەتی سێدارەشدا خەو دەبینێ
خەو دەبینێ
خەو دەبینێ
لە پارچە هەڵبەستێکی تردا کە لە ژێر سەردێڕی ڕێژنە هۆنیویەتەوە، گیروگرفتەکانی

خۆی بۆ خۆشەویستەکەی دەگێڕێتەوە و خۆی دەکاتە برووسکە و دەڵێ: دەروازەی شاریان لە ڕوو داخستووم، بەڵام سینگم تەنووری خۆشەویستییە و دڵی هەزاران برسی و ئاوارەم تیا حەشار داوە و هاتووم کە ئاسمانی شار و ئاسۆ ڕابگرین وەکو دەڵێ:

بەرەو لات هاتم
شانم دایە بەر تەرمی بەیانی،
لەگەڵ هەنگاو و نسێی پێکراوما
ئاسۆیەکی سوور، ژانی سەدەکان
بەدواما دەکشان
وەکو برووسکە
بەرەو لات هاتم
کێو و بیابانم دەکرد بەکانی
ئامێزم دەدا لە ڕێژنە و زریان
گەرووم دەکردە
هێلانەی چریکە و پشکۆ و گۆرانی

***

دەروازەی شاریان لە ڕوو داخستم
لەژێر سێبەری ئێوارەیەکا
چنگم بۆ تیشک و سەرما گرتەوە
دارستانێکی چڕم داگیرساند
کانیی سەهۆڵ و ئەستێرەکانم گەرم کردەوە
بەچەپکە شیعرێ
ڕوخساری ئاسۆم ڕووناک کردەوە

***

دەروازەی شاریان لە ڕوو داخستووم
باڵم بەهەور و لووتکەی گڕ داوە
وڵاتەکەم و
ئەستێرەیەکی ڕەتێندراوم بەکۆڵدا داوە
سینەم تەنووری خۆشەویستییە،

کانیی هەتاوە
نهێنیی زەوی و
دڵی هەزاران برسی و ئاوارەم تیا حەشار داوە
***
هاتووم پێکەوە،
لەبەر ڕێژنەدا
لە ڕووی دەسرێژدا
ڕیزێ ببەستین،
بەبازووەکانمان،
بەچەکی دەستی پێشمەرگەکانمان
ئاسمانی شار و ئاسۆ ڕابگرین

هۆنراوەکانی ڕەفیق سابیر نوێنگەی کۆمەڵی کوردەوارین، نوێنگەی دەرد و ڕەنجی گەلی کوردن، ئەو دەرد و ڕەنجانەی کە بەدەستی ئیمپریالیزمەوە چێژایانە و بەرگەی هەموو چەشنە برسییەتی و هەژاری و دەربەدەرییێکیان گرتووە و هەر بەو تەنگوچەڵەمانە ڕاهاتوون وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە سەردێڕی لە ئاوێنەدا هۆنیویەتەوە دەڵێ:

لە ئاوێنەوە دوو چاو دەڕوانن
برسێتی... دەوار
کرێوە... کێشە
دەموچاوێکی شێوا دەبینین
بەباڵای لووتکە و تیشکا هەڵدەزنێن
شوێن پێی دەنگێکی خنکێندراو و
هەور هەڵدەگرن
دوو چاوی بزێو
لە ئاوێنەشدا دەبریسکێنەوە
هەتاوێکی سوور دەدرەوشێننەوە
ئاوێنەکەیان تیرەباران کرد
دوو چاو لە پارچە وردەکانەوە
دەڵێی ئەستێرەی دەمەو بەیانن

بۆ ئاسمانێکی ڕوون و بەرینتر
بۆ وڵاتێکی هێمن دەڕوانن

سەرچاوەکان

١- ڕێژنە هۆنراوەی ڕەفیق سابیر - مەهاباد ١٩٧٩.
٢- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەڕەفیق سابیر.

## د. سەدیق بۆرەکەیی

١٣٦٤ - ...

ناوم سـەدیق و کـوڕی تۆفـیق بۆرەکـەیی و نـاوی بنەمـاڵەکـەم سـەفی زادە و نازناوم لە هۆنراودا هەر سـەدیق و لە سـاڵی ١٣٢٢ی هـەتاوی بەرانبـەر بـەسـاڵی ١٣٦٤ی کـۆچی و بەرانبەر بەساڵی ١٩٤٦ی زاینی لە دێی زەڕینەی وەرمزیاری هۆبەتووی سەر بەدیواندەرە لە دایک بووم. دەوری سـەرەتاییم لە تیکانتـەپەی هەوشـار و دەوری نـاوەندیم لە شـاری بەغـدا تەواو کردووە و پاشـان ماوەیەک لەلای شێخ ئەمجەدی زەهاوی ڕێزمانی عەرەبی و شەرعی ئیسلام و لێکدانەوەی قورئانی پیرۆز و فەلسەفە و وێژەی عـەرەبیم خوێند تا ئیـفتام لێ وەرگرت و لە پاشـا گـەڕامـەوە وڵات و لە تاراندا لە کـاری دەوڵەتی دامـەزرام و لـە زانکۆی تاراندا خەریکی خوێندن بووم تا دوکتۆرای وێژەی فارسیم وەرگرت.

ماوەی ژیانم لە بەغدا ئاسۆی بیرمی فراوانتر کردەوە، چونکە لەگەڵ گەلێ لە هۆنەران و نووسەران و وێژەوانان و زانایانی عەرەبدا ئاشنایەتیم پەیدا کرد و ئەمەش کارێکی گەورەی کردە سەر مشتومـاڵکردنی بیرم و هـەر لەو کاتەوە حـەزم لە وێژە و زانست کرد کە پاشـان کەوتمەوە هەوڵ و تێکۆشان.

ئەو دەمـەی کـە هاتمە تاران لەگەڵ گـەلێ لە بوێژان و هۆنەران و نـووسـەران و زانـایاندا ئاشنایەتیم پەیدا کرد و هەر ئەوان بوون کە هانمیـان دا لەسـەر وێژەی کوردی بکۆڵمەوە و لە پاشا لەگەڵ گەلێ لە پیاوە ئاینییەکانی یاری یا کاکەیی ئاشنایەتی و دۆستایەتیم پەیدا کرد. بەجۆرێ کە زۆربەی نووسراوە دەستنووسەکانی یاریم لێیان دەست کەوت و پاشـان توانیم کەڵک و سوودیان لێ وەرگرم.

ئەڵبەت لە ژیاندا تووشی گەلێ گێرەوکێشە و تەنگوچەڵەمە بووم و گەلێ سارد و گەرمیی ڕۆژگارم چەشت بەتایبەت دەوری خوێندنم بەهەزار ئەرک و کێشە تەواو کردووە، بەڵام خوا هەموو دەم لە کارەکاندا سەرمی خستووە.

هەر لە منداڵییەوە حەزم لە هۆنینەوەی هۆنراو دەکرد و لە چواردەساڵیدا خەریکی هۆنراو هۆنینەوە بووم و پتر کاتی خۆمم بەخوێندنەوەی دیوانی هۆنەرانی کورد دەبردە سەر و هەروەها لەسەر وێژەی فارسی و عەرەبی و تورکییش دەکۆڵیمەوە و پاشان ماوەیەک کاتی خۆمم بەلێکۆڵینەوە و تۆژینەوەی وێژەی کوردی بردە سەر کە لە بەشەکانی جۆر بەجۆردا تا ئێستا نزیکەی سەد و شەست و پێنج بەرگ پەڕتووک و نامیلکەم بەزمانەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی لەسەر کورد و مێژوو و، وێژەی کوردیدا نووسیوە و دەیان وتاریشم بۆ گۆڤارەکان و ڕادیۆ نووسیوە کە زۆربەیان بڵاوبووەتەوە.

هەندێ لەو نووسراوانەم کە چاپ و بڵاوبوونەتەوە بریتین لە: چوار خشتەکییەکانی خەیام، دوو بەیتییەکانی بابە تایەر، هیوا، زەمبیل فرۆش، پیری دەریا، گەڕانەوە سەرخۆ، سیمای موحەممەد، داهاتووی ئیسلام، داستانی ڕاستان، پێشبینییەکانی عێل بەگی، سەلاحەدینی ئەیووبی، تەفسیری بۆرەکەیی، ئێمە چی دەڵێین، مێژووی قورئان، خەسرەو و شیرین، دیوانی مەولەوی، پێشبینییەکانی خان ئەلماس، تەلای دەستەو شار، مێژووی وێژەی کوردی، ناسینی ڕاستەقینەی پێغەمبەری گەورەی ئیسلام، مێژووی نەتەوەی کورد، مێژووی فەرمانڕەوایانی ئەردەلان، مێژووی فەرمانڕەوایانی هەورامان، فەرهەنگی گۆرانی، پەندی پێشینان، کورد و نەورۆز، کورد و شانامە، مێژووی کورد و پەیوەندیی نەژادیی ئەو، ماریفەت و پیر شالیاری، بەندوباوی کۆمەڵایەتی، دیوانی نالی، دیوانی وەلی دێوانە، دەورەی حەوتەوانە، دەورەی بالوولی ماهی، سەرئەنجام و، دەیان پەڕتووک و نامیلکەی تر.

ئەز لەبەرئەوەی بتوانم پتر بەزمان و وێژەی نەتەوەکەم ڕاژە بکەم ماوەیەک لەلای مووبەدەکانی زەردەشتیدا خەریکی فێربوونی زمانەکانی ئاوێستایی و پەهلەوی و پارسیی کۆن بووم کە پاشان سێ پەڕاوم بەناوی هاوچەشنی وشەکانی ئاوێستایی و پارسی کۆن و پەهلەوی لەگەڵ کوردیدا نووسی و هەروەها گاتەکانی زەردەشتم بەهۆنراو وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی و گەلێ وتاریشم سەبارەت بەئاوێستا و پەڕتووکەکانی پەهلەوی نووسی کە هەندێکیان بڵاوبوونەتەوە.

تا ئێستا چەند کۆمەڵە هۆنراوەم بڵاوکردوونەتەوە کە لێرەدا لە بارەیانەوە دەدوێم و هیوادارم کە توانیبێتم ڕاژە و خزمەتم کردبێتە وێژە و فەرهەنگی گەلەکەم. ئەوەی کە ڕوونە هۆنراوەکانم زۆربەیان بەزمانێکی سادە و بەکوردییەکی پەتی هۆنیوەتەوە و لە هۆنینەوەی هۆنراودا پێڕەویم لە شێوەی گۆران کردووە و دیارە سەرەتا دیمەنە جوان و دڵڕفێنەکانی کوردستان، کێو و بەندەنە بەرز و سەختەکان و قەڵبەزە کەف پەخشانەکان و چەم و ڕووبارەکان و دەشتە پان و پڕ لە گوڵاڵە سوورەکانی کە پڕن لە باڵندەگەلی جوان و

ڕەنگاوڕەنگ هەستی منیان بزواند و پاشان وەکو هۆنەرانی تری کورد هۆنراوی دڵداریم هۆنیوەتەوە، چونکە منیش گراو و سەوداسەری دڵبەرێک بووم و ئەو دڵبەرە بەجارێ هەست و هۆشمی لێ سەند و منی خستە مەیدانی وێژە و هۆنراوەوە و کورتژمی هۆنراوی پێم بەخشی، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا شەماڵم کردووەتە ڕاویار، تاکو هەواڵی ئەو دڵبەرەم پێ بگەیەنێ و بەدیتنی دڵم ڕوون و شاد بکاتەوە:

شەماڵ کە هاتی دڵبەرت نەدی
تۆ شێوەی بالا عەرعەرت نەدی
تیشکی بینایی دوو چاوت نەدی
دەوای پەژارە و زوخاوت نەدی
بالندەی هەرد و کێوانت نەدی
گوڵاڵە سوورەی شێوانت نەدی
ئەتۆ تاوسی باخانت نەدی
مامزی بێشە و شاخانت نەدی
تۆ بالا بەرزی شۆخ ئاسات نەدی
تۆ ڕوومەت گوڵی بێ وەفات نەدی
بەڕەزای کەنار شەتاوت نەدی
سۆسەن و شەوبۆی گۆلاوت نەدی
دوو چاوی ڕەشی دڵدارت نەدی
دوو کوڵمی ئاڵی وەک نارت نەدی
ئەگریجەی ڕەشی شێواوت نەدی
دوو شێری برۆی بان چاوت نەدی
دوو لێوی سووری وەک گوڵت نەدی
مەرهەمی دەردی ناو دڵت نەدی
ڕوومەتی گەشی گوڵنارت نەدی
جووتە مەمکۆڵەی هەنارت نەدی
شێوەی ئەو لەیلا تەرزەتە نەدی
قەدی ئەو بالا بەرزەتە نەدی
شەماڵ دەخیلتم دڵبەرم ئەوڕۆ
کاتێ ئەهاتی نەهاتە لای تۆ

نەهاتە لای تۆ بپرسێ حاڵم
بزانێ بۆچی شەوگار ئەناڵم
نەهاتە لای تۆ ئەو شۆخوشەنگە
بزانێ بۆچی دڵم وا تەنگە
وەبزانم شەماڵ ئەو بێ وەفایە
دڵداری لە لا دەرد و جەفایە
هیچ بەزەی نایە بەحاڵی گراو
دڵی ئەکاتە هێلانەی زوخاو
یاخوا هەمیشە لە ژین بێزار بێ
بەوێنەی «سدیق» هەر گرفتار بێ

هەروەها گەلێ هۆنراوم سەبارەت بەدەردی کۆمەڵ هۆنیوەتەوە و لە بارەی کورد و کوردستانیش هۆنراوەم زۆرە ئەو کوردستانەی کە پڕ لە شاخوداخ و دەشت و مێرگ و ڕەوەز و ئەوەند جوانە کە دەڵێی بەهەشتە، وە هەر ئەو سەرچاوەی هەڵبەست و هەوێنی بیر و هەستمە کە لەم پارچە هەڵبەستەدا وتوومە:

کوردستانی جوان جێی باوباپیرم
مایەی مەبەست و کەڵکەڵە و بیرم
ئاواتی دڵ و هیوای ژیانم
بزوێنەر هەست و ئارامیی گیانم
ئەتۆ هەوێنی بیر و هەستمی
هەر تۆ سەرچاوەی گشت مەبەستمی
هەتاکو مابێ لە گیاندا هێزم
ئەمن لە دوژمن تۆ ئەپارێزم

چارینەکانی عومەر خەیام (... - ٥٢٦ی کۆچی)یشم وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی، ئەڵبەت تا ئێستا چەند هۆنەری تر وەکو: گۆران و سەلام و کامەران بەدرخان و هەژار چوار خشتەکییەکانی خەیامیان وەرگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی بەڵام هەموویان دەقی هۆنراوەکانیان وەرنەگێڕاون، بەڵکو گەلێ دەسکاریی هۆنراوەکانیان کردوون و لە ماناکانیشیان زۆر دوور کەوتوونەتەوە و مەبەستەکەیان بەجۆرێکی تر دەربڕیوە، بۆیە منیش کەوتمە سەر وەرگێڕانی چارینەکان کە لێرەدا بۆ نموونە چەند چارینەی دەنووسمەوە:

١

آنکس که زمین و چرخ افلاک نهاد
پس داغ که او بردل غمناک نهاد
بسیار لب چو لعل و زلفین چومشک
در طبل زمین و حقهء خاک نهاد

***

ئەو کەسەی چەرخ و زەوی دارێژا
هەر دانەی داخی لە دڵدا بێژا
گەلێ لێو ئاڵ و زڵف و قژ ڕەشی
یەک یەک لە ناخی زەویدا نێژا

٢

تا خاک مرا به قالب آمخته اند
بس فتنه که از خاک برنگیختەاند
من بهتر ازین نمیتوانم بودن
کز بوته مرا چنین برون ریخته اند

***

کە خاکەکەمیان بەقاڵب دارشت
گەلێ پێکوڵیان بەسەر منا ڕشت
ئەمن ناتوانم لەمە چاکتر بم
لە ڕۆژی بەرین قاڵبمیان وارشت

٣

درگوش دلم گفت فلک پنهانی
حکمی که قضا بود زمن میدانی
درگردش خود اگر مرادست بدی
خودرا برهاندمی ز سرگردانی

***

لە گوێی دڵما چەرخ وتی پەنهانی
چی دێتە سەرتا لە منی ئەزانی

له گەردشی خۆم گەر دەستم ئەبوو
خۆم ڕزگار ئەکرد لە سەرگەردانی

٤

افسوس کە سرمایە زکف بیرون شد
دَرپای اجل بسی جگرها خون شد
کس نامد از آنجهان کە پرسم از وی
کاحوال مسافران دنیا چون شد

***

داخم سەرمایەی ژینم لە دەست چوو
لەبەر پێی ئاکام دڵان بەخوێن بوو
کەس نەهاتەوە تا لێی بپرسم
کە چۆنە حاڵی بەرەی کۆچکردوو

٥

جامی است کە عقل آفرین می زندش
صد بوسە زمهر بر جبین می زندش
این کوزەگر دهر جام لطیف
من سازدو باز بر زمین می زندش

***

ئەو جامی مەیەی وا جوان و ڕەنگین
ئاوەز لە خۆشیان ئەخاتە خەنین
هەورگەرەکەی چلۆنی دڵ دێ
وا بەقینەوە بیدا لە زەوین

٦

پیری دیدم بەخانەء خماری
گفتم نکنی ز رفتگان اخباری
گفتا می خور کە همچو ما بسیاری
رفتند و کسی باز نیامد باری

***

پیـــرێکم بینی مـــەست بوو لەو ناوە
وتم بۆ مـــەســـتی چیت پێـــوە مـــاوە
وتـی مـــەی بخـــۆ کـــە وەک من و تۆ
گـــــــەلێ ڕۆیشتن نەهاتنە دواوە

٧

گویند بهشت و حور عین خواهد بود
وآنجـــا می ناب وانگبین خـــواهد بود
گر مـا می و معشوقە گزیدیم چەباک
آخـر نەبە عـاقـبت همین خـواهد بود

***

ئەڵێن کـە بەهەشت پەری تیـــا هەیە
لەوێ هەنگوین و جـــۆگـــەلەی مـــەیە
گـەر لێرە لەگـەڵ دڵبـەر مـەی بخـۆین
بەشـیـشـمـان لەوێ خـۆ هەر ئەمـەیە

٨

هنگام سـپـیـد دم خـــروس سـحـــری
دانی کـــە چراهمی کند نوحـــە گـــری
یمنی کـــە نمودند در آئینەء صـــبح
کز عـمر شبی گزشت و تو بێ خـبری

***

ئـەزانـــی بـۆچـی دەمـــی بـەیـانـــی
کـەڵەشـێـر کـەوتە سـەر نەواخـوانی
ئـەڵێ تـێ پـەڕی شـــــەوێ لـە ژینـت
هەڵسـە مـەیی بخـۆ مـەی ئەرغـەوانی

هەروەها دوو بەیتییەکانی بابە تایەری هەمەدانی (٣٩٠ - ٤٥٠ی کۆچی)م کردە سۆرانی کە بەر لە منیش دڵزار ئەو کارەی کردووە، بەڵام لەبەرئەوەی نەیتوانیوە دوو بەیتییەکانی بەتەواوی وەرگێڕێتە سەر سۆرانی و گەلێ کەموکوڕییان تێدایە ئەوەبوو کە هاتمە سەر ئەوە کە سەرەتا هۆنراوە لوڕییەکانی بابە تایەر پەیداکەم و ئەوسا بیکەمە سۆرانی و بۆ ئەوەش

بەناو کتێبخانەکاندا گەلێ سووڕام تا چەند دەستنووسی کۆنی دوو بەیتییەکانیم پەیدا کرد و ئەوسا کردمنە سۆرانی کە لێرەدا چەند دوو بەیتیی بابا و سۆرانییەکەی دێنم:

١

سیه بختم که بختم واژگون بی
سیه روزم که روزم سرنگون بی
شدم خار سرکوی محبت
زدست دل که یارب غرق خون بی

***

ئەم چارە ڕەشەم بەلەتە گوێن بێ
ئەم ڕۆژە ڕەشەم بێ سەروشوێن بێ
دڵداری منی بەو ڕۆژە گەیاند
خوایە ئەو دڵەم شەلاڵی خوێن بێ

٢

قدم دائم زبار غصه خم بی
چو من محنت کشی دردهر کم بی
مو هرگز از غم آزادی ندیرم
دل بی طالع مو کوه غم بی

***

بالام چەمی خەم وەکو کەمانە
بۆ خەم بێ هاوتام لە ڕووی زەمانە
هیچ کاتێ لە خەم ڕزگاریم نییە
دڵەی نەگبەتم کێوی خەمانە

٣

من آن آوارهء بی خان و مانم
من آن محنت نصیب سخت جانم
من آن سرگشته خارم در بیابان
که پر بادی وزد پیشش دوانم

***

بێ ماڵ و حاڵ و وێڵ و دەربەدەر
مەینەت لە دڵ و کز و خاکەسەر
سەرلێشێواوم وەک پووش لەو چۆڵە
هەر بایێک هەڵکا من ئەداتە بەر

٤

مو آز لالە رخان دل ریش دیرم
ز لالە داغ بر دل بیش دیرم
شکایت نە زگردون نەز آفاق
گلە از سرنوشت خویش دیرم

***

دڵ گیرۆدەیە بەو خەت و خاڵە
جەرگم ڕەش وەکو جەرگی گوڵاڵە
سووچی کەس نییە من وا کڵۆڵم
گلەم لە ڕەشیی بەخت و ئیقباڵە

٥

اگر آهی کشم دریا بسوجم
جهان را جمله تا پا بسوجم
بسوجم عالم ار کارم نساجی
چە فرمائی بساجی یا بسوجم

***

بەهەناسەی سارد کێو لەبن دێنم
سەرتاپای دنیای پێ ئەڕووخێنم
گەر چارم نەکەی ئاخ هەڵئەکێشم
دادی من ئەدەی یان بتسووتێنم؟

٦

خرم آنان کە ازتن جان ندانند
ز جانان جان ز جان جانان ندانند

به دردش خو کرن سالان و ماهان
به‌عمر خویشتن درمان ندانند

***

ئه‌وی گیان و یار هه‌ریه‌که بۆیان
له هه‌ردوو دنیا روونه ئاسۆیان
نه ده‌رد ئه‌زانن نه ده‌رمان خوازن
خۆشن به‌ئه‌وین خۆشی له خۆیان

٧

به‌خنجر گر رد آرند دیدگانم
به آتش گر بسوزند استخوانم
اگر بر ناخونانم نی بکوبند
نگیرم دل زیار مهربانم

***

ئه‌گه‌ر به‌خه‌نجه‌ر ده‌رکه‌ن چاوانم
به‌ر ئاگری ده‌ن هه‌موو ئێسقانم
په‌له قامیشم له نینووک راکه‌ن
ده‌ستبه‌ردارت نیم ئارامی گیانم

٨

من آن بحرم که در ظرف آمدستم
چو نقطه بر سر حرف آمدستم
به هر الفی الف قدی بر آیو
الف قدم که در الف آمدستم

***

زه‌ریام و له‌ناو ده‌فرێ کراوم
خاڵێکم له‌سه‌ر پیت دانراوم
بۆ هه‌ر هه‌زار ساڵ نه‌مامێک هه‌یه
له‌م هه‌زاره‌دا منم رواوم

***

یەکێ لە کارەکانی ترم ئەوەبوو کە یەکێ لە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان بەناوی زەمبیل فرۆش، بەهۆنراو بهۆنمەوە و ئەوەبوو کە ئەم کارەم بەئەنجام گەیاند و بلاوم کردەوە و ناوی ڕاستەقینەی زەمبیل فرۆش میر سەعیدی دیاربەکرییە کە وەکو دەگێرنەوە ڕۆژێکیان چووە ڕاو و دەمەدەمی ئێوارە گەڕایەوە و لە ڕێدا چاوی کەوتە کۆمەڵێک لە خەڵک و دی دارە تەرمێکیان گرتووەتە شانیان بۆ گۆڕستانی دەبەن و ئەویش هەرکە لێیان نزیک بووەوە، دیتی کە پیرەمێردێکی بەسالاچووە و لە دڵی خۆیدا وتی ئەو پیاوە ژینی خۆی کردووە و پیر بووە و مردووە بەلام من لاوم و خۆ جارێ پیر نەبووم، چەند ڕۆژێکی تر دیسان ڕۆیشتە ڕاووشکار و لە کاتی گەڕانەوەیدا چاوی کەوتە تەرمێکی تر و خێرا لە ئەسپەکەی دابەزی و سەری مردووەکەی هەڵداوە و دی کە لاوێکی پێکەوتووە و مردووە و بۆی دەرکەوت کە ڕۆژگار لاوانیش دەمرێنێ و ئەوەبوو کە بڕیاری دا ڕێی خوا بگرێ و ببێتە دەروێش و لەگەڵ خێزانەکەیدا لە ماڵ دەرچوو و، ڕووی کردە هەندەران و ئەوسا ماوەیەک خەریکی زەمبیل چنین بوو تا گوڵ خاتوونی ژنی میری ئەو شارە دڵی لێ چوو و، بەزۆر گرتیان و بردیانە کۆشکەکەی و ئەویش داوای لێ کرد کە لەگەڵیدا ڕێ کەوێ و زەمبیل فرۆش بۆ ئەوەی تووشی گوناه نەبێ، خێرا خۆی لە پەنجەرەی کۆشکەکە خستە خوارەوە و بزربوو، کە ئەوا لێرەدا بەندێ لەو چیرۆکەتان پێشکەش دەکەم:

گوڵ خاتوون کاتێ بیستی وەلامی
زیاتر کولاوە برین و زامی
وتی شازادەی جوان و شیرینم
خۆ تۆ ئەزانی من دڵ برینم
بەدەست دڵەوە پەشێوە ژینم
لە دووری تۆوە هەردەبوو ژینم
خۆ تۆ ئەزانی دەردم کارییە
شەو و ڕۆژی من ئاه و زارییە
بۆ هەر کەسێ وا جوان و نازار بێ؟
ئەبێ دڵ بەرد و مەردوم ئازار بێ؟
گەر مێهرەبان و نەرم و نیانی
دەست لە ملم کە شەو تا بەیانی
چونکە نەماوە ئارامم ئیمشەو
گیانە کولاوە من زامم ئیمشەو

گیانم ئەکەمە قوربانت ئیمشەو
فەرمانبەردارم فەرمانت ئیمشەو
دەروونم وەک شەم ئەسووتێ ئیمشەو
بۆی قرچەی دەروون پەی پەی تێ ئیمشەو
ئەگەر بگەیتە فەریادم ئیمشەو
ناوت دەرناچێ لە یادم ئیمشەو
سووتاوم یەکسەر وەکو شەم ئیمشەو
گڕی گرت هێسک و هەم پێشەم ئیمشەو
دڵت ناسووتێ تۆ بۆ من ئیمشەو
دوژمن واناکا لە دوژمن ئیمشەو
بێ لە ڕێی خوادا دەردم دەواکە
من بۆ تۆ سووتام شەرمێ لە خواکە
چی بکەم ناچارم بوومە ڕەنجەڕۆ
دڵم سووتاوە و کوون کوونە بۆ تۆ
دڵم لای تۆیە چارم ناچارە
خۆتیش ئەزانی بوومە بێچارە
خۆ نەسەقچی نیت مێهرێ بنوێنە
یا بێ دڵەکەم ئازا دەربێنە
یا بێ بگەیێ بەناڵە و فریام
من بۆ تۆ شەوان هەتا ڕۆژ وریام
یا بێ هەر ئیمشەو ئازا چارم کە
یا بێ بمکوژە دی ڕزگارم کە

یەکێ تر لە کارەکانم خەوێک بوو کە شەوێکیان ئەو خەوەم دی و لە پاش ئەو خەوە گیروگرفتێکم بۆ پەیدا بوو کە تا ماوەیەک لە ماڵا مامەوە و ئەوسا خەوەکەم بەهۆنراو هۆنییەوە و ئەمەش بەندێک لەو خەونامە کە ناوم ناوە پیری دەریا و خەوەکەش ئەوەبوو کە لە دەریادا گیروگرفتێکمان بۆ پەیدابوو، ئەوسا پیری دەریا سەری هەڵدا و لەو گیروگرفتە ڕزگارمانی کرد و وتی هەر پرسیارێکتان هەیە، بیکەن تا وەڵامتان بدەمەوە، وەکو لەم بەندەدا لاوێک پرسیار دەکا:

ئەوسا لاوێک زۆر بەگــرژی
کــە ڕق لە ڕوومــەتی ئەڕژی
وتی پیــری نەرم و نیــان
بـکـە باسـێ تـۆ لـە ژیـان
خـۆ مـن لەگـەڵ دەرد هاوڕازم
بـەچیـی ئـەم ژیـنـە بنـازم؟
پیـر کـەوت ناو بیـرێ بێ بن
وتـی: لـە پێـنـاویـا ئـەچـن
ئەگــەر ســاتێکی گــرینە
هەندێ جـاریش زۆر شـیـرینە
ئەبێ کـــۆشش بکەن لە ژین
تـا بگـەنـە ئـامـــانج بژین
بەکـۆشش بەئامــانج ئەگـەن
لە بەریشــیـا شـادی ئەکـەن
بەڵام کــەســێک ببێ ئاڵۆز
ڕووی گـرژ بکا لە با و باهۆز
بەرگەی کـۆسپی ژیان نـاگرێ
سـەرناکـەوێ و هەروا ئـەمـرێ
وەلێ ژینیش تا سـەر نـیـیـە
ئەو مـاوەش بێ کـەسـەر نییە
تۆفـیـر ناکـا بۆ پیـاو و ژن
تا ئەگـاتە هیـوا و ئۆخـژن
دەرد و ڕەنجــی زۆری ئــەوێ
تاکــو لە ژینا ســەرکــەوێ
تا مـــاوە ئـەم ڕێگە بگرێ
ســەرئەنجـامیش ئەبێ بمرێ
هـەمـــوو ولس و زینـدەوەرێ
بــەرگــی ژیــانــی ئــەوەرێ

ئەوانیش هەر وەکو مرۆ
خەبات ئەکەن لە شەو و ڕۆ
کەند و لەند ئەکەنە بەون
لە گەوەی ژین سەرئەکەون
تا ئەتوانی خەبات بکە
ئەوسا بەئامانجت بگە

یەکێ تر لە کارەکانم ئەوەبوو کە لە پاش فێربوونی زمانی ئاڤێستایی دەستم کردە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی ئاڤێستا کە پاشان گەلێ وتارم لەبارەی ئاڤێستاوە لە گۆڤارەکاندا بڵاوکردەوە و ئەوسا گاتاکانم بەهۆنراو هۆنییەوە و ناوم نا وتەکانی زەردەشت کە ئەوا لێرەدا بەندێکی دێنم:

ئاور خۆشەویست هوورەمەزدایە
هەر خۆشی و شایی وا لە بەرایە
ئاور دیارییەکی خواسراوە بۆ مە
بەنرخە لە بۆ ئەم مەرز و بۆمە
گەلێ شیاوی پێ هەڵگوتنە
مایەی خۆشبەختی و شادی بێ بنە
لە هەرماڵێکا خۆ ئاگر هەیە
سوود و دەستکەوتی زۆر و بێ پەیە
خۆشبەخت کەسێکە کە ئاوری بێ
ماڵێکی گەورە و گەرموگوڕی بێ
خۆشبەخت کەسێکە زەنگە لە دەست بێ
لە گڕی ئاگر سەرخۆش و مەست بێ
خۆشبەخت کەسێکە کە بیپارێزێ
چێو بنێتە ناو دەست و ئامێزی
خۆشبەخت کەسێکە کە لەبەر گڕیا
خەوی ژیانی بەجارێ زڕیا
دەسا هەر گڕت لە ماڵا بەرز بێ
گەرمات لە بۆ خەڵک بەهەزار تەرز بێ

گەرمات بۆ مرۆ و مالاتیش ببێ
گرت بۆ تاوڵە و گەلەخان بچێ
هەتاکو هەموو بکەونە خۆشی
دەرچن لە ناوی خەم و پەرۆشی
تاکو ڕۆشناییت ئەهریمەن ورکا
دێو و درنج و درۆزن قڕ کا
هەر ئەشم و هوو و هیشتم ئەستی
بخوێنە تاکو دوور بی لە پەستی

یەکێ تر لە کارەکانم هۆنینەوەی چیرۆکی ڕاپەڕینی کاوەی کوردە کە بەپێی ئەفسانەکانی کۆنی کوردی هۆنیومەتەوە کە دەم بەدەم دەیگێڕنەوە و لەگەڵ شانامەی فیردەوسیدا کەمێک تۆفیری هەیە، بەڵام هەردووکیان هەر لە سەرچاوەیەکەوە هاتوون کە لێرەدا بەندێکی دێنم:

کوردانی دلێر وەک شێری بێ باک
بۆ ئازادی بوو ڕاپەڕین لە خاک
ئەوساکە هەموو هۆز و تیرەی کورد
هەر لە پیاو و ژن تا درشت و ورد
گشتیان یەکیان گرت لە کەژ و لە دەشت
دەشتیان ڕازانەو هەر وەکو بەهەشت
گشت کۆبوونەوە بەشایی و خۆشی
ئیدی لە دڵیان نەما پەرۆشی
ژنان و کچان بەچەپڵەڕێزان
دڵی لاوانیان ئەکرد ئاوێزان
دی بووە بەزم و هەڵپەڕکێ و شایی
هەموو ڕزگار بوون لە دەست تەنیایی
کچان ئەهاتن گوڵیان ئەچنی
ژنان گێلاخە و شنگیان ئەڕنی
ناز و خەمزەیان ئەکرد بەدەستە
هەر کامیان ئەتوت سەرخۆش و مەستە
لاوان بەچیلە و چەپڵە و هەڵپەڕکێ
نەیانئەزانی بڕواننە کێ

کوڕیان گەرم کرد لە بۆ گۆرانی
لە بۆ ئاهەنگ و هەم نەواخوانی
هەموو ئاگری نەورۆزیان هەڵکرد
ئاگریان کردە و لەسەر کەژ و گرد
جەژنی نەورۆزیان گرت گشت بەخۆشی
ئیدی لە دڵیان نەما پەرۆشی
وتیان کە تەوقی دیلیمان پسان
ئەژدیهاکیشمان ئاوا حەپەسان
دی ئەمە جەژنی گشت کوردە ئەمڕۆ
جەژنی درشت و هەم وردە ئەمڕۆ
دەبا ئاگری نەورۆزمان هەر ساڵ
بەرزە و بێتەوە هەر بەگاڵەگاڵ
دەبا بڵێسە و گڕ ئەو ئاگرە
هەر بەرزبێتەوە و تۆش خۆت ڕاگرە
ئەوساکە کاوە و کورەکەی هاتن
دییان کە هەندێ زۆر کز و ماتن
وتی بۆ ماتن وتیان بۆ لاوان
بۆ ئەو لاوانەی کوژران بێ تاوان
وتی وا ستەم نەما و گشت شاد بن
هەتاکو ماون با هەر ئازاد بن
کاوەیان کردە سەرۆکی خۆیان
چونکە زانییان ڕەنجی دا بۆیان

یەکێ تر لە کارەکانم هۆنینەوە و نووسینی پەڕتووکێکە بەناوی کورد و شانامە کە بریتییە لە مێژووی ڕامیاری و بەسەرهاتی فەرمانڕەوایان و نەبەزی و قارمانییەتیی قارەمانان و پاڵەوانانی وڵاتەکەمان کە پێشینەیەکی مێژوویی کۆنیان هەیە و چیرۆکەکانیان هەر لەمێژەوە تا ئێستا پشت بەپشت و دەم بەدەم هاتوونەتە خوارەوە و بەیادگار ماونەتەوە و ئەم چیرۆکانە بەر لە فیردەوسیش هەر لەناو کوردەکاندا باوبوون و گەلێک لە هۆنەرانی کوردیش لە سەدەکانی سێیەم و چوارەمی کۆچیدا دیاردییان کردووەتە

ئەو چیرۆکانە و پاشان هۆنەرانی کورد گەلێک لەو چیرۆکانەیان کردە هۆنراو و بەیادگار بەجێیان هێشتن کە هەندێکیان بریتین لە: بارام و گوڵەندام، خەسرەو و شیرین، رۆستەم و زۆراب، جیهانگیر و رۆستەم، برزوو و فلامەرز، بەبری بەیان، بێژەن و مەنێژە، حەوت رەزم، نۆ رەزم، یانزە رەزم، رۆستەم و ئەسفەندیار، وە من ئەم پەڕاوەم بەپێی ئەو چیرۆکانە و شانامەکەی فیردەوسی نووسی و هۆنییەوە تا هەموو کەڵک و سوودی لێ وەرگرن، ئەمەش چەند هۆنراوێکی ئەو نووسراوەیە:

نەمامێک رووا گەورە بوو تا سەر
لقوپۆی بڵاو بووەوە یەکسەر
بووە دارێکی پڕ بەر و جوان
خەڵک هاتنە سەری وەکو سفرە و خوان
گەڵاکەی پەند و بەری ئاوەز بوو
ئەو دارە بۆ گەل هەر هەرەوەز بوو
چڵی ئەو دارە تا حەزکەی خوەز بوو
لە بۆ نەیاران وەکو رەوەز بوو
ناوی پیرۆزی ئەشوو زەردەشت بوو
تەنیا ئامانجی ئەو هەر بەهەشت بوو
بەشای وت کەوا من پێغەمبەرم
لە رێی خوا ئەتبەم چونکە رێبەرم
پلۆختەیەکی هێنا لەو ناوە
وتی ئەمەم لە بەهەشت هێناوە
بێ ئایینەکەم وەربگرە بەدڵ
چونکە سبەینێ ئەچیتە ژێر گڵ
رێ و رچەی خودا فێر ببە لە ژین
بەرەی پێ بدە بەبێ رق و کین
لە رووی ئاوەزە و تێ فکرە ساتێ
گشت پیاوانیشت بەو رێیە داتێ
فێر بە ئاین و دینی زەردەشتی
ئەگەر لایەنگر مینۆ و بەهەشتی

سا کە ئەمەی بیست چووە سەر دینی
چەن کەسی تری ئەو ڕۆژە بینی
ئەوانەشی زوو هێنایە ڕێی خۆی
تا پەرە بدەن ئەو ئائینە بۆی
کاتێ پادشا بەرەو بەلخ ڕۆیشت
هەموو کەوتنە دووی ئەو چاک تێ گەیشت
کە گشت یارانی هەر لە ڕێی ئەودان
گشتیان هەروەکو تانوپۆ و هەودان
تیشکی خوایی دای لە دەروونیان
ئیتر داساکا دڵی زەبوونیان
دی بتپەرستی لەناوچوو یەکجار
ئاور کرایەو لە دەشت و هەوار
ئاور لە ناوی گشت ماڵێ گڕا
تۆمی خراپەش بەجارێ بڕا
گوشتاسپ چەند کەسی ناردە سەر بەندەن
تا ئەو ئایینەی پەرە پێ بدەن
بەم جۆرە دینی زەردەشت پەرەی سەند
بنج بتپەرستی لە زەوی هەڵکەند
وا زەردەشت ئێژێ هیچ درۆ نەکەن
لە درۆ ئێوە بەهیچێ ناگەن
ئەوەی درۆ کا دوژمنی خوایە
دوژمنی من و دین و بڕوایە
هەروەها دەڵێ: چاپلووسی مەکەن
بەدخوازی و ڕژدی و قرنووسی مەکەن
فروفێڵ بەکار مەبەن لە ژینا
مەچنە ناو ڕک و دەخەز و قینا

یەکێ تر لە کارەکانم ئەوەبوو کە کورتەی شەرعی ئیسلام و ژیانی پێغەمبەرانی خوام بەهۆنراو هۆنییەوە تا هەموو کەڵک و سوودی لێ وەرگرن و بۆ ئەم کارەش کەڵکم لە

قورئانی پیرۆز و پەڕاوە ئاینییەکان وەرگرت و ناوم نا دیاری پێغەمبەران کە ئەوا بەندێکی لێرەدا دێنم:

چوارەم سی ڕۆژەی مانگی ڕەمەزان
ڕۆژووەکەت بگرە بێ درۆ و بوختان
خواوەن مەزن فەرزی کرد بۆمان
ئەبێ بیگرین لە مانگ ڕەمەزان
چونکە قورئانی تیا نازل بووە
مزگێنی لە بۆ ئیسلام هاتووە
بەلام هەر کەسێ ڕۆژووەکەی نەگرێ
دەرگای ڕەحمەتی خوا لە خۆی ئەبڕێ
ڕۆژوەوان ئەبێ بەد بەکەس نەڵێ
نا ئەهل ببینێ بەڕێگای هەڵێ
هاواریش نەکا لەگەڵ نەزانان
هەمیشە دووری بگرێ لە نادان
چۆن ڕۆژوو مرۆ پاک ئەکاتەوە
گوناهی پێشووی لا ئەباتەوە
خودا فەرمووییە بێ زیاد و کەم
ڕۆژوو بۆ منە و خۆم جەزای ئەدەم
ڕۆژوو لە بۆ ئەم دەستە هاتووە
یەکەم هەر کەسێ خاوەندی خووە
یانێ ئەو کەسەی عاقڵ و ژیرە
ئەبێ ڕۆژووەکەی بگرێ گەر پیرە
شێت و دێوانە ڕۆژووی بۆ نییە
چونکە ئەو شێتە دەسەلات چییە
دووهەم لەسەری باڵغیش فەرزە
ئەبێ ڕۆژووەکەی بگرێ بێ عەرزە
سێیەم بۆ سالم ڕۆژوو هاتووە
ڕۆژووگرتنی کاکە بێ سووە

ڕێبواریش چەند ڕۆژ ڕێگاکەی ببڕێ
ئەبێ بەقەزا ڕۆژووەکەی بگرێ
پێنجەم بۆ ژنی بێ نوێژ و زەیسان
لەو دەمە ڕۆژوو نەگرێ ڕەمەزان
بەلاّم دوای پاکی ڕۆژووی قەزایە
ئەبێ بیگرێ و فەرمانی خوایە
ئەبێ ڕۆژەوان قورئان بخوێنێ
بەقسەی خراپ دڵ کەس نەشکێنێ

یەکێ تر لە کارەکانم ئەوەیە کە گەلێ لەو پەندانەی کە دەم بەدەم دەیانگێڕنەوە و هەر لەمێژەوە کەوتوونەتە سەر زاری خەڵک، وە چۆنییەتیی ژیان و بیروباوەڕی باو و باپیرانمان بۆ دەردەخەن هەریەکە کردوومن بەهۆنراو و بەناوی پەندی پێشینانی کوردی ئامادەم کردوون بۆ چاپ کە ئەوا چەند پەندێکیان دێنمەوە:

پەندی پێشینان وەک زێڕ و زێوە
قسەی باش بکە و خراپ دزێوە
قسە کەوتە زار ئەکەوێتە شار
ڕازت ئاشکرا ئەبێ لای نەیار
ئاش با بگەڕێ و دانی خۆی بێنێ
چەقچەقەش با هەر سەر خۆی بشکێنێ
قەل بەقەلی وت ئەتۆ ڕوو ڕەشی
بۆیە لە دونیا بێ بەهرە و بەشی
چەپلّە بەدەستێک خۆ لێ نادرێ
پیاو ئەبێ دۆسیش بۆ خۆی ڕاگرێ
کەسێ ناتوانێ لای خوات لێ ببڕێ
ئەوی لە مشک بێ جەواڵ ئەدڕێ
خوا ئەو خوایەیە چاو ئەکاتە خەو
قەدری مانگ نییە تا نەگاتە شەو
دڵ خەڵک مەشکێنە لە ژین تاکو سەر
مار بەقسەی خۆش لە کون دێتە دەر

بچۆرە شوێنێ کە کەس نەتناسێ
جا خۆت هەڵکێشە پڕ بەکراسێ
زمان ڕاوەستێ سەریش ڕەحەتە
ڕێسی ناپیاویش ئەبێتە پەتە
ئەگەر خوا باڵی بەمار بدایە
ئەبوا گشتمانی ئەو بگەستایە

یەکێ تر لە کارەکانم هۆنینەوەی هۆنراوی ئاوییەرە کە داگری دووسەد و پەنجا هۆنراوە و ماوەیەک لەمەوپێش کە چوومە سنە چاوم کەوتە ئەو کێوە و چاوەندازەکانی و لەگەڵیدا کەوتمە دووان. ئەم کێوە کە کەوتووەتە باشووری سنەوە، گەلێ گوڵ و گیا و ڕووەکی بۆنخۆشی تێدا ئەڕوێ و هەروەها گەلێ هەوارگە و خانووبەرەی جوان لە پاڵی ئەم کێوەدا هەیە کە خەڵک هەموو ڕۆژێ ئەچنە دیتنی، وە هەندێ لە شوێنە خۆشەکانی ئەم شوێنە بریتییە لە: خدری زیندە، کانی شەفا، کانی سەفا، سەرتەخت، زەفەرییە، ئەمانیە، کاوسالە، مبارەک ئاوا، نەقدی، تەکیەی شێخ عەلی، چیمەنی شەرەفولولک، وێڵە. ناوی ئەم کێوە لە ئاڤێستادا ئاپەدرییە واتە: ئەو شوێنەی کە ئاو دڕیویەتی، وە لە نامیلکەی هۆرمز یەشتدا نووسراوە کە زەردەشت لەسەر ئەم کێوەدا بووەتە پێغەمبەر و پاشان خەڵکی بۆ یەکتاپەرستی بانگ کردووە. ئەڵبەت گەلێ لە هۆنەرانی تر لەگەڵ کێودا کەوتوونەتە وتووێژ، بۆ وێنە مەسعوودی کوڕی سەعدی سەلمان لە پارچە هەڵبەستێکدا لەگەڵ کێوێکدا ئەدوێ و حەمە حوسەینی شالیاریش لە هۆنراوی حەیدەر باوەدا لەگەڵ کێوی حەیدەر باوەدا دواوە. ئەمەش چەند هۆنراوێک لە ئەو کۆمەڵە هۆنراوە:

ئاوییەر باخی باویت دی چۆڵە
کوند دێ و لەسەریا هەر ئەکا بۆڵە
داخەکەم لە جێی قوڵنگ و قازان
دالاش و کەرگەز ئەفرۆشن نازان
لە جێگەی بولبوڵ هەر قەل ئەخوێنێ
ڕەشەباش خێرا تۆز هەڵئەستێنێ
نێرگزیش ئەوا نوستووە لە خەو
ڕایەخی بووە بەزیخ و بەچەو
دەسا سا هەڵسە ڕازی مەبێژە
چونکە ئەزانم تۆ بیرت تێژە

***

ئاوییەر زەمان ڕابردو ڕۆیی

ئەبێ گشت بژین بەسەربەخۆیی

چوکە کۆیلەیی و دیلی چووە سەر

ئەبێ ئازاد بین بێ دەرد و کەسەر

ئەبێ گشت هەوڵ دەین بۆ کورد و کوردسان

ئەو کوردەی کەوا ئاگری هەڵسان

ئەو کوردەی کەوا نەبووە بەیدەست

هەتا مافی خۆی بهێنێتە دەست

منیش بۆ بەرزی ئەچم چون وردم

خاکی بەری پێی لاوێکی کوردم

***

یەکێ تر لە کارەکانم هۆنینەوەی کارەساتی هەڵەبجەیە، بەهۆنراو کە لە پاش بۆمبارانکردنی هەڵەبجە بەچەکی شیمیایی ئەو هۆنراوانەم هۆنییەوە و لە ڕاستەقینەدا ڕووداوی هەڵەبجە ژانێکە کە بەسەر لەش و گیانی هەموو کوردێک تەوژم دێنێ و ئەم هۆنراوانەش هاوارێک کە لە کانی دڵمەوە هەڵقوڵیوە تا کار بکەنە سەر بەرەی مرۆ، کە ئەوا چەند هۆنراوێکی لێرەدا دێنم:

شاری هەڵەبجە وەک ئاوێنەیە

لەناو مێژوودا زۆر بێ وێنەیە

چونکە بەخوێنی کوردان ڕەنگین بوو

لە بۆ کوردستان وەکو نگین بوو

گولاڵەی باخان گشت وشک و زڕ بوو

شارەکە لە گاز شیمیایی پڕ بوو

منداڵی ساوا لە پاڵی داکی

سەریان نایەوە هەردوو بەپاکی

هەموویان لە ئەو شارەدا کوژران

بەدەسەجەمی لە خاکا نێژران

لاوان بەهیوا سەریان نایەوە

هەر خەم و خەفەت بۆ مە مایەوە

هەڵەبجە لەناو خوێنی خەڵک گەوزا
پیرانیش خنکان لە ناوەنەوزا
ناوی شارەکە بووە تەم و تۆف
منداڵان خنکان هەر بەداخ و ئۆف
ئاسمان بەجارێ سپی و ڕەش بوو
دارەکان سووتا و وەک خەڵووز گەش بوو
وڵاتەکانی یەکگرتووی جیهان
کە بۆ ئاشتی گەلان ئەدەن هان
ئەی بۆچی لەبەر ئەم گشت ستەمە
هیچێکیان نەوت لە ئەم سەردەمە؟
وەرن ئەی ڕۆڵەی کوردانی دلێر
هەموو یەک بگرن وەکو بێچووە شێر
ڕاپەڕن هەڵسن سەدام لەناوبەن
لەناو دونیادا ئەو بکەن بەپەن
سەدام خوێنمژ و دوڕوو و خوێنخۆرە
بڕوای هەر لەسەر ستەم و زۆرە
بەقەد داڵەهۆ خەم لە دڵمایە
بەهارە و ئیتر قاسپەی کەو نایە

یەکێ تر لە کارەکانم دانانی گۆرانییە بۆ گۆرانیبێژانی کورد کە ئەمەش یادگاریی تافی جوانیمە؛ بۆیە تەواوی ئەو گۆرانییانە ئاوات و هیوا و گلە و گازندە و سکاڵایە لە یار، کە ئەمەش گۆرانییەکم بەناوی نەسرین دێنمەوە:

نەسرین کەژاڵە چاوەی سوخمە ئاڵ
ڕوومەت گەشەکەی گوڵاڵەی سەر یاڵ
ئەستێرە وێنەی ئاسمانی جوانی
تا کەی دانیشم بەچاوەڕوانیِ
کاتێ ئەتبینم نازداری دڵبەر
دڵم وەک شەماڵ دەشت ئەگرێتە بەر
کاتێ لە دەشتا گوڵێ ئەبینم
بەوێنەی بولبول بۆی ئەچریکێنم

چونکه شێوەتی پێوە دیارە

نەسرین تۆ جوانی وێنەت تەیارە

کەم جەزرەبەم دە لە ڕێی ئەو خوایە

ئەگەر ئەمزانی ئەمەگت وایە

نەئەکەوتمە داوت شۆخی بێ بەینەت

صدیق» سەرسامە نەسرین لەم کەینەت

یەکێ تر لە کارەکانم هۆنینەوەی شانامەی بۆرەکەییە کە بریتییە لە مێژووی کورد و کوردستان هەر لە گووتییەکانەوە تا لۆلۆییەکان و کاسییەکان و میتانییەکان و مانابییەکان و ئۆرارتوەکان و مادەکان و ساسانییەکان و لەم بارەوە کەڵکیشم لە شانامەی فیردەوسی و چیرۆکەکان و ئەفسانەکانی کوردیش وەرگرتووە و بەم چەشنە شانامەکەم پێک هێناوە و ئەمەش چەند هۆنراوێک لە بارەی پادشایەتی هۆشەنگەوە:

هۆشەنگ شا بووە سەرۆکی وڵات

هەتاوی دادی لە مەڵبەند هەڵات

چل ساڵی تەواو فەرمانی ڕانی

دی خەڵکی دەرکرد لە نیگەرانی

پاشان جیهانی ئاوا کرد یەکسەر

دی نەما لە دڵ پەژارە و کەسەر

تەواوی گیتیی ئەو لە داد پڕ کرد

دێو و نەیاری بەجارێ وڕ کرد

ڕۆژێکیان هۆشەنگ چووە دەشت و کێو

گەڕا کۆساران نشێو بەنشێو

لە دوورەو شتێ زۆر ناباری دی

لەپڕ داخوریا دڵی بەهێدی

دی کە خشپەی دێ بەهێدی ئەڕوا

دووکەڵ لە دەمیە و پەی پەی دێ بۆ دوا

تومەز کە ئەمە مارێکە درێژ

کە هەر ئەخزێ لە دەشتا بەچێژ

بەردێکی خێرا لە بۆ ئەو هاوێشت

گەلێ نیشانە و شوێنی بەجێ هێشت

دای لە بەردێ تر چەخماخەی وەشان
گڕی لە پووشی ئەو شوێنە هەڵسان
مارەکە نەکوژرا بەڵام لە پڕێ
لەو بەردە هەڵسا هاڵاو و گڕێ
ئاگری پەیدا کرد بەفەڕ و بەهەنگ
تا کۆبوونەوە یارانی یەکڕەنگ
جەژنێکیان بەدی هێنا هەر ئەوڕۆ
ناویان نا سەدە بەفەڕ و شکۆ
هۆشەنگ سپاسی خوای بێ هاوتای کرد
کە ئەوی بەرەو ئەو ڕێ و شوێنە برد
وتی: ئەم تیشکە تیشکێ خواییە
گەلێ بەنرخ و زۆر بە باییە
کە شەو هات کێوێ ئاگریان هەڵکرد
ناوی یەزدانیان لە خۆشیا ئەبرد
دی بووە بەزم و شایی و هەڵپەڕکێ
کەس نەیئەزانی بڕوانێتە کێ
ئەو جەژنە بەناو هۆشەنگ مایەوە
لە ئەو دەمەدا دەنگی دایەوە
بۆیە ئەو جەژنە سەدە ناونرا
چونکە سەد ڕۆژی زستان ڕابرا

سەرچاوەکان


١- هیوا، هۆنراوەی سەدیق بۆرەکەیی - تاران ١٣٦٠.
٢- چوار خشتەکییەکانی خەیام، وەرگێڕاوی سەدیق بۆرەکەیی - تاران ١٣٥٨.
٣- دوو بەیتییەکانی بابە تایەری هەمەدانی، گۆڕینی سەدیق بۆرەکەیی - تاران ١٣٦٠.
٤- زەمبیل فرۆش، هۆنراوەی سەدیق بۆرەکەیی - تاران ١٣٦٣.
٥- پیری دەریا، هۆنراوەی سەدیق بۆرەکەیی - تاران ١٣٦٩.
٦- وتەکانی زەردەشت، هۆنراوەی سەدیق بۆرەکەیی.
٧- ڕاپەڕینی کاوەی کورد، هۆنراوی سەدیق بۆرەکەیی.

٨- پەندی پێشینان، هۆنراوەی سەدیق بۆرەکەیی.

٩- گۆرانی، هۆنراوەی سەدیق بۆرەکەیی.

١٠- هەڵبجەی خوێنین هۆنراوەی سەدیق بۆرەکەیی.

١١- ئاوییەر، هۆنراوەی سەدیق بۆرەکەیی.

١٢- کورد و شانامە دانراوی سەدیق بۆرەکەیی.

١٣- شانامەی بۆرەکەیی، هۆنراوەی سەدیق بۆرەکەیی.

## ئەنوەر قادر محەمەد

١٣٦٨ - ...

ئەنوەر، کوڕی قادر کە نازناوی ئەنوەرە لە ساڵی ١٣٦٨ی کۆچی لە ناوچەی عەربەتی سەر بەسلێمانی لە دایک بووە و دەورەی سەرەتایی و ناوەندیی هەر لەو ناوچەیە تەواو کردووە و پاشان چووەتە بەغدا و لە کۆلێژی ئاداب لیسانسی لە زمانی کوردیدا وەرگرتووە و ئەوسا بووەتە مامۆستا و ماوەیەک خەریکی وانە وتنەوە بووە و لە پاشا چووەتە ئەوروپا و وەکو دەڵێن لەوێشدا دوکتۆرای وەرگرتووە و ئێستاش هەر لەوێدایە.

ئەنوەر قادر بەیەکێ لە هۆنەرانی هاوچەرخ دێتە ژمار و هۆنراوەکانی لەسەر شێوەی نوێ هۆنیویەتەوە کە گەلێ شیرین و ڕەوانن. ئەو تا ئێستا کۆمەڵە هۆنراوێکی بەناوی زریان بڵاوبووەتەوە و هەروەها گەلێ لە هۆنراوەکانشی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا چاپ کراون.

هۆنراوەکانی ئەنوەر قادر بریتیین لە دەردی کۆمەڵ، بریتییە لە دەربەدەری و ئاوارەیی گەلی کورد کە بەدەست ڕژێمی ستەمکاری سەدامەوە چەوسادنەتەوە، بریتین لە خەم و پەژارە و ئەم چەشنە بابەتانەن لەناو هۆنراوەکانیدا دەردەکەون، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە سەردێڕی ئێوارەیە و کۆچ ئاگرە و ناکوژێتەوە دەڵێ:

لە هەواری ماتی تەما

دەواری دەروون هەڵئەدەم

بەکۆچە ڕێی دووری خەما

بارگەی وشەم بەرێ ئەخەم

باوبۆرانێ لە دڵمایە، گەر بباری

هەسوونە زێڕینە و هەتاو

ئەدا لە یەخەی بەهاری

***

هەورەکانی ئاسمانی شار
بۆ باوەشی گۆماوەکەی دەربەند ئەفڕین
وتیان نامە... سڵاو، هەواڵ
بۆ باوک و دایکت نانێری
ئەی نامەی ئەوانت ناوێ؟!
وتم سیروان هەموو ڕۆژێ
هەواڵیانم بۆ ئەهێنێ

***

ئەوا دیسان... جانتا و کۆڵە بێ نازەکان
وەکو بێچووە پشیلەی چاو نەپشکوتوو
بۆ ژوورێکی ترسناکتر هەڵئەگیرێن
بەگالیسکە و بەکۆڵ و شان

***

ئەی وڵاتە شیرینەکەم!
وڵاتی سوێ و بەفر و بەهار
وێنەکەی تۆ لە قووڵاییی زامەکانما
هەڵئەگرم...
لە کۆمۆنەی ڕووتەکانا
وێنەکەی تۆ و زامەکانم
دروشمێکە لەسەر سەرم هەڵی ئەگرم

***

ئەو دەریایە و خەم دەریایە
شیعرەکانی منیش ماسین
بێ ئەو ناژین... بێ خەم ناژین
گیانە!...
سەروملم دوورگەیەکە، دوای کۆچی تۆ
لە تینوانا وا ئەخنکێ، دە بێرەوە
دە ڕووباری باسکەکانتی لێ ئاڵێنە
با تینوویەتی و تاسەم بشکێ

ئەنوەر قادر هۆنراوەکانی خۆی بەکوردییەکی پەتی هۆنیونەتەوە، بۆ ئەوەی هەموو لێی تێ بگەن، وە لەگەڵ ئەوەش گەلێ زاراوی نوێی بەدی هێناون و لە هۆنراوەکانیدا بەکاری بردوون، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لەسەردێڕی: ئێوە ئەو بایەن کێو لەبن دێنن، هۆنیویەتەوە کە دەڵێ:

ئەڕۆی ئەگریا، دڵێ ئاوێنەی تەماوی و لێڵ بوو،
ئاسمانێ بوو دوایی نەهاتوو، ئەسپی سەرکەش و
تینووی ئارەزووی هەر ئەیحیلاند و چەپۆکانی بوو...
لەسەر درەختی ماتی تەنیایی، پۆلێ باڵندەی لانە شێواو و
وێڵ هەڵئەنیشتن... ئەڕۆی هاواری (خانی) لە کەژی
نەبڕاوەی بیریا... دەنگی ئەدایەوە:
گورگی ڕۆژگار بەرخی سێ سەدەی مل شکاندووە،
زامیش گوڵی کرد، بەڵام مەم و زین دوو ئەستێرەکەی
شەوی هاوینن، یەکتر ماچ ناکەن ئەکوژێنەوە...
لەبەردەم خوادا، لەناو گومان و دڵنیاییدا
هەڵەت و سوورکەی هەوری ئاسمانن
هەتا چاو بزەی نابڕێنەوە...
ئەڕۆیشت و ئەیوت: تاوی بارانی گریانی (خانی)
بەسەر پەنجەرەی خامۆشیماندا، ڕەشت و لوول ئەکا
شەقەی شاباڵی درن بەهەوری ماتیمان ئەدا
بانگمان لێ ئەکا:
ئەی هەژارینە! ئێوە ئەو بایەن کێو لەبن دێنن

***

بەدەم سۆزەوە هاواری ئەکرد:
دەم ئەبەم لێوی وەک سکڵی ڕووتی ئەو کچە شەنگە
ئەکەم بەبرین... بەگوڵاڵەی زام
نەء! ئەو تۆی ناوێ
بۆ منی ناوێ؟! شیرین چیت ئەوێ؟!
شیرین کەژاوەی بارانت ئەوێ؟!

شیرین ڕووباری گریانت ئەویّ؟!
ئەوا من ئەڕۆم کەژەکەی بێستوون ئەهەرۆژێنم
گەردوونە بەرزەت بۆ ئەهەژێنم

سەرچاوەکان

١- زریان، هۆنراوەی ئەنوەر قادر محەمەد - بەغدا ١٩٨٧.

٢- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بە ئەنوەر قادر.

## عەبدوڵلا پەشێو

١٣٧٥ - ...

عەبدوڵلا، کوڕی محەمەدە و نازناوی پەشێوە، لە ساڵی ١٣٧٥ی کۆچی لە دێی بێرکۆتی سەر بەهەولێر لە دایک بووە و دەورەی سەرەتایی و ناوەندیی لە هەولێر تەواو کردووە و پاشان بەهۆی کوردپەروەرییەوە گیراوە، بەڵام لە زیندان ڕای کردووە و چووەتە ئەورووپا و ماوەیەکیش لە مۆسکۆدا ماوەتەوە.

عەبدوڵلا پەشێو هەر لە منداڵییەوە حەزی لە هۆنراو کردووە و جاروبار هۆنراوی هۆنیوەتەوە و باشترین هاندەری ئەو بۆ هۆنراو هۆنینەوە دۆستانی بوون و پتر حەزی لە هۆنراوەکانی گۆران دەکرد و لە ڕاستەقینەدا ئەو گیانێکی تری دەماندە هۆنراوی کوردی و هۆنراوی نوێی گەیاندە پلەوپایەیەکی بەرز و تا ئێستا چوار کۆمەڵە هۆنراوی بەناوی: فرمێسک و زام، بتی شکاو، شەونامەی شاعیرێکی تینوو، شەو نییە خەوتان پێوە نەبینم، بڵاوکردووەتەوە.

عەبدوڵلا پەشێو هەر لەسەر ڕێ و ڕچەی باو و باپیری دەڕوا، ئەو ڕێ و ڕچەیە کە باو و باپیری بۆ هێنایانە دی کە جەژنی نەورۆزیش هەر دەچێتە سەر ئەو ڕێ و ڕچەیە، ئەو نەورۆزەی کە بەپێی چیرۆکەکانی نەتەوایەتی کاوەی کورد هێنایە دی و ئەژیدەهاکی ستەمکاری گەیاندە سزای خۆی، وەکو لە پارچە هەڵبەستێکیدا باسی ئەوەمان بۆ دەکا و دەڵێ:

لە کاوەی باپیرم پرسی، چۆن دەگەمە نەورۆزەکەی سەدەی بیستەم وتی: ڕۆڵە گیان ئەگەر کوردستان بکەنە پارچە ئاگرێک، نەک ئەژدەهاکێ بەڵکو هەزار ئەژدەهاک بۆ گەلی کورد ملکەچ دەکا و خۆی ناگرێ، وەکو دەڵێ:

پرسیم لە کاوەی باپیرم
گوتم: بابە وا دەست بەدەستم

دە پێم بڵێ، چۆن ئەگەمە
نەورۆزەکەی سەدەی بیستەم
گوتی: ڕۆڵە، گەر کوردستان
بکەن بەپارچە ئاگرێ
نەک زوحاکێ، هەزار زوحاگ
ملکەچ ئەکا و خۆی ناگرێ

هۆنەر لەگەڵ ئەوەی لە کوردستان دوورکەوتووتەوە، بەڵام کوردستانی هەروەکو گیانی خۆی خۆش دەوێ، چونکە زێد و مەڵبەندیەتی و لەوێدا لە دایک بووە و لەوێدا پێ گەیشتووە و گەورە بووە دیارە دەبووا وەکو بیبیلەی چاوی بیپاراستایە، بەڵام لەبەرئەوەی لێی دوور کەوتووەتەوە ئەوەیە کە گۆرانی پیادەڵێ و دەڵێ: کێڵگە بۆ باران دەستری و چیا بۆ هەڵۆ و ڕووبار بۆ نەوەستان و خۆر بۆ ئاسۆ و ئاگرپەرست بۆ ئاورگە و با بۆ چرۆ و ئەستێرە و مانگ بۆ بەرەیان و منیش بۆ تۆ ئەی کوردستانەکەم، وەکو دەڵێ:

کێڵگە دەستری بۆ باران
چیا بۆ هەڵۆ
ڕووبار و چەم بۆ نەوەستان
خۆر بۆ ئاسۆ
ئاگرپەرست بۆ ئاتەسگە
با بۆ چرۆ
ئەستێرە و مانگ بۆ سپێدە
منیش بۆ تۆ
کوردستانم: منیش بۆ تۆ!

هۆنراوەکانی عەبدوڵڵا پەشێو ئاوێنەیەکی باڵانمان بۆ ژیانی کوردەواری. لە پارچە هەڵبەستێکیا کە لە بارەی بڵاوبوونەوەی (کەژاوەی گریان)ی شێرکۆ بێکەس هۆنیویەتەوە ژیانی قارەمانی کوردمان بۆ دەردەخا کە چۆن کەژاوەکەی گریانی ئەو، وەک بنیادەمێکی ڕاپەڕیو خەنجەرێکی پاشا کۆرەی لە کەمەر دابوو، وە لەو مەیدانەدا ئالاخوێنینی مەهاباد هەڵکرابوو، وە پەیامێکی لەوێدا بڵاوکردەوە کە وشەکانی پریشکی ئاگری زەردەشت بوون و کتومت هەر لە وشەکانی ئاڤێستا دەچوون، وەکو دەڵێ:

برام شێرکۆ...
کەژاوەکەی گریانی تۆ

وەک ئادەمزادی ڕاپەڕیو
گیانی گەرمی لەبەردا بوو
خەنجەرێکی جەوهەرداری،
«کوڕ پاشا»ی لە کەمەر دابوو
لە پێشەنگی، کەژاوەتا،
ئالای خوێنینی مەهاباد... هەڵکرابوو
لە تەک ئەوا، سێدارەکەی، چوارچرا بوو
کە هاتە لام،
پەیامێکی وای بۆ هێنام:
وشەکانی،
وەک پریشکی ئاگر وابوون
هی ڕۆژانی، ئاڤێستا بوون
خوێندمەوە
گەلێک گریام...
گریام بۆ خۆم...
گریام بۆ تۆ...
بۆ هەزاران، زیندووی نێژراوی ناو گڵکۆ!
***
برام شێرکۆ
ڕاست ئەکەی... تۆ
دوو هەزار و پێنجسەد ساڵە
ئەنوین... ئەخۆین... لەسەر درۆ!
ڕاست ئەکەی... تۆ
دوو هەزار و پێنجسەد ساڵە
گوێمان... کەڕە!
زمانمان... گیرۆدە و لاڵە!
بەڵام هەیهۆ
کەی لای ئێمە،

پەسند بووە پیاوی ڕاستگۆ؟!

***

برام شێرکۆ...

بەو چاوە دیم،

زەردەخەنەی، لە دواوە بوو،

کەژاوەکەی، گریانی تۆ!

لە تنۆکی فرمێسکتا

دەماری بازووی کاوەم دی

لاشەی کەوتووی زوحاکم دی

ئالای بەرزی شەکاوەم دی

ئاسۆیەکی ڕووناکم دی!

***

لە تنۆکی فرمێسکتا...

زەردەشتم دی

باوەشی خۆی ئەگرتەوە

بۆ هەژار و چەوساوەکان

بەهەشتم دی،

ڕاست ئەبۆوە،

لەسەر لاشەی، چوار دیوارە، ڕماوەکان

***

عەبدوڵڵا پەشێو گەلێ گۆرانیی جوان جوانیشی بەهۆنراو بۆمان هۆنیوەتەوە کە لەوانەدا بەیارەکەی هەڵدەڵێ و لەگەڵیا ڕازونیاز دەکا، وەکو لە پارچە هەڵبەستێکدا کە لە سەردێڕی تۆش بەجێم دێڵیدا ئەوەمان بۆ دەردەخا و دەڵێ:

تۆش بەجێم دێڵی

زۆرباش دەزانم تۆش بەجێم دێڵی

تۆش سەرخۆش دەبی و

وەک بادەیەکی بۆش بەجێم دێڵی

***

تۆش بەجێم دێڵی
وەک چۆن سەوزایی باخ بەجێ دێڵی
وەک چۆن تەمومژ شاخ بەجێ دێڵی
تۆش بەجێم دێڵی!

***

تۆش بەجێم دێڵی
چۆن ئەسپێکی خورت سوار بەجێ دێڵێ
چۆن وشەی تادار زار بەجێ دێڵێ
تۆش بەجێم دێڵی

***

ئەگەر دەزانیت، ئەمجارە
بڕیارەکەت دوا بڕیارە
ناوونیشانی خۆت بگۆڕە
جێ پێیەکانمان بسڕەوە
لەژێر ئاسمانی ئەم شارە
ئەوسا خوات لەگەڵ
چۆن ئەسپێکی خورت سوار بەجێ دێڵی
وام بەجێ بێڵە!
چۆن وشەی تادار زار بەجێ دێڵی
وام بەجێ بێڵە!

***

سەرچاوەکان

١- بتی شکاو، هۆنراوەی عەبدوڵڵا پەشێو - کەرکووک ١٩٦٨.
٢- شەونامەی شاعیرێکی تینوو، هۆنراوەی عەبدوڵڵا پەشێو - بەغدا ١٩٧٣.
٣- شەو نییە خەوتان پێوە نەبینم، هۆنراوەی عەبدوڵڵا پەشێو - هەولێر ١٩٨٠.
٤- فرمێسک و زام، هۆنراوەی عەبدوڵڵا پەشێو - کەرکووک ١٩٦٧.

## نووسەران و وێژەوانانی کورد

گەلی کورد لە سەرەتای سەدەی چواردەیەمی کۆچیدا بۆ بووژانەوە و پەرەسەندنی وێژە و فەرهەنگی کوردی گەلێ تێ کۆشاوە و هەر لەم چەرخەدا گەلێ ڕۆژنامە و گۆڤار لە لایەن نووسەرانی کوردەوە چاپ و بڵاوبووەتەوە بۆ یەکەمین جار ڕۆژنامەی کوردستان لە ساڵی ١٨٩٨ی زایینی لە لایەن میقداد مەدحەت بەگی بەدرخانەوە لە شاری قاهیرە بڵاوکرایەوە و پاشان لە ساڵی ١٩٠٧ی زایینی ڕۆژنامەی کورد لە ئەستەموول بڵاوبووەوە و لە پاشا گەلێ گۆڤار و ڕۆژنامە لە لایەن نووسەرانەوە کەوتنە بەردەستی خوێندەوارانەوە و بەم چەشنە وێژەی کوردی بەجارێ پەرەی سەند و بەهۆی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامەیانەوە گەلێ نووسەر و وێژەوان و هۆنەر سەریان هەڵدا کە بوونە هۆی پەرەسەندنی وێژە و فەرهەنگی کوردی.

لە ڕژێمی شاهەنشاییدا گەلێ لە هۆنەران و نووسەرانی کورد کۆچیان کردە وڵاتەکانی دەرەوە و ئەمانە لە هەر کوێدا بوون دەستیان کردە پەرەدانی وێژە و زمانی کوردی و گەلێ شوێنەواریان بڵاوکردەوە و گەلێ ڕۆژنامە و گۆڤاریان دەرخست و ئەم ڕۆژنامە و گۆڤارانە لە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی لاواندا گەلێ بەکەڵک بوون، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی لە هەموو چینێک وریا دەکردەوە و زمانی سادەی ئەو ڕۆژنامانە هێڵێکی پەیوەندی بوون لە نێوان زمانی خوێندەواران و نەخوێندەوارانداـ بەڵام هەندێ لەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە لەبەرئەوەی پەیوەندییان بەدەوڵەتەوە بوو مەبەستەکانیان بەسوودی خۆیان دەنووسی بۆ ئەوەی خەڵک لە ڕێ دەرکەن.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمی زایینیدا نووسەران و وێژەوانانی کورد کەوتنە هەوڵ و تێکۆشین و لەم بارەوە گەلێ پەرتووک و نامیلکەیان سەبارەت بەلێکۆڵینەوەی وێژە و زمانی کوردی نووسین و بڵاویان کردنەوە، هەروەها گەلێ پەڕاویان لە زمانە بێگانەکانەوە وەرگێڕانە سەر زمانی کوردی و گەلێ چیرۆکیشیان نووسین کە هەندێ لەوان بریتین لە: ئەحمەد موختار جاف، ئەحمەد هەردی، ئەمین میرزا کەریم، ئیبراهیم ئەحمەد، پیرەمێرد، جەماڵ بابان، جەماڵ نەبەز، جەمیل سائب، جگەرخوێن، حەسەنی قزڵجی، حوسێن حوزنی موکریانی، خالد دلێر، ڕەحیمی قازی، ڕەشید هەورامی، سەعید ناکام، شاکر فەتاح، شوکور مستەفا، شێرکۆ بێکەس، عەرەبی شەمۆ، عەلائەدین سەجادی، عیزەدین مستەفا،

کامەران موکری، کەماڵ مەزهەر، گیوی موکریانی، مارف خەزنەدار، محەمەد تۆفیق وردی، محەمەد عەلی کوردی، مستەفا نەریمان، نووری شێخ ساڵح، هۆگر گۆران، یونس مستەفا عومەر، وە دەیان چیرۆکنووسی تر.

گەلی کورد هەر لەمێژەوە بەدەستی زۆرکاران و ستەمکارانەوە دەچەوسێتەوە و لە کورد بەدەستی ڕژێمی شاهەنشاییەوە، لە ئەوپەڕی نائومێدی و نوشووستدا دەژیا و پلەی ژیانی لە ئاستێکی نزمدا بوو، بەڵام بەهۆی ڕەوتی تیژ پەڕی مرۆڤایەتییەوە، پاشان باری ژیانی گۆڕا و گەرچی گەلێ ڕۆڵەی نەبەزی لە دەست دا، بەڵام سەرئەنجام توانیی مافی خۆیان بستێنێ و وێژە و کولتوورەکەی ببووژێننەوە و بیگەیێنێتە پایە و گەشکەی پێ بکەن.

وێژەی کوردی هەر لەمێژەوە بەهۆی نووسەران و هۆنەران و زانایانی کوردەوە پەرەی سەندووە و چیرۆک و ئەفسانەش شانبەشانی زەمان لەناو کوردەواریدا هاتوونەتە خوارەوە، بەڵام تا ئێستا کەسێک نەبووە کە ئەو چیرۆک و ئەفسانانە کۆکاتەوە و لە چاپیان بدا و بڵاویان کاتەوە و لە ڕاستەقینەدا کورد خاوەنی فۆلکلۆرێکی دەوڵەمەندە و فۆلکلۆر لەناو کوردەواریدا لەسەر ئازایی و جوامێری و دەروون پاکیی دانراوە و ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆنی کوردی ئەو سەردەمەمان بۆ دەردەخا، وە وێژەی کوردی لە پلەی یەکەمدا بریتییە لە فۆلکلۆری کوردی کە سەرچاوەیێکی گرنگن بۆ وێژە، بەڵام چیرۆکنووسی بەچەشنی نوێ لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە دەستی پێکردووە واتە: کاتێک ڕۆژنامە و گۆڤارگەلی کوردی بڵاوبوونەوە، چیرۆکی کوردیش کەوتە ڕوو، چونکە گەلی کورد لەم لایەنەوە مێژوویەکی دووروودرێژی نییە و یەکەمین چیرۆکی کوردی بەناوی «لە خەوما» هی جەمیل سائبە کە لە ساڵی ١٩٢٨ی زاینیدا لە چاپ دراوە و پاشان گەلێ چیرۆکنووس سەریان هەڵدا و چیرۆکی کوردی بەرەبەرە پەرەی سەند و زۆربەی ئەو چیرۆکانەی کە بڵاوبوونەتەوە ناکۆکی و دژوارییەکانی کۆمەڵ دەردەخەن و لەمەوە لە خوێندنەوەی ئەو چیرۆکانە دەتوانین کۆمەڵ بناسین و ڕێ و ڕەوشت و هەڵسوکەوت و ویستەکانی کۆمەڵیشمان بۆ دەردەکەوێ.

پەخشان لەم دەورەدا گەلێ پێشرەوتی کردووە و لە ڕاستەقینەدا پێشرەوتی پەخشان لە هۆنراو زۆرترە، چونکە نووسەران و وێژەوانان زیاتر لە هۆنەران کەوتنە هەوڵ و تەقەلا، وە پەخشان بەکوردییەکی پەتی نووسرا و کەمتر وشەی بێگانەیان تیا بەکار بردو لەم دەمەدا گەلێ پەڕاوی بەکەڵک لە زمانە بێگانەکانەوە وەرگێڕرانە سەر زمانی کوردی کە لەناو ئەوانەدا دەتوانین لە کەلیلە و دەمنە وەرگێڕاوی عومەر تۆفیق و گوڵستانی سەعدی وەرگێڕاوی مەلا مستەفای سەفوەت ناوببەین.

ئەو نووسەرانەی کە بۆ بووژانەوە و پەرەسەندنی وێژە و زمانی کوردی کەوتنە هەوڵ و

تێکۆشان و پەخشانی کوردییان بەجوانترین شێوە ڕازاندەوە و گەلێ نووسراوی بەکەڵکیان دانا هەتا هەتایە وەکو ئەستێرەیەکی گەش لەناو وێژەی کوردیدا دەدرەوشێنەوە، ئەوا لەم بەرگەدا سەرگوروشتە و بەسەرهاتی هەندێکیان لێرەدا دەنووسین کە بریتین لە: سەید حوسێن حوزنی موکریانی، تۆفیق وەهبی، جەلادەت بەدرخان، ڕەفیق حیلمی، شێخ محەمەدی خاڵ، گیوی موکریانی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، مستەفا سەفوەت، عەلی سەیدۆ گۆرانی، دوکتۆر قەناتی کوردۆ، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، ئەنوەر مایی، حەسەنی قزڵجی، شاکر فەتاح، عەلائەدینی سەجادی، محەمەد تۆفیق وردی، کەریم شارەزا، عوبەیدوڵڵای ئەیووبیان، کەماڵ جەلال غەریب، د. مارف خەزنەدار، د. جەماڵ نەبەز، دوکتۆر عزەدین مستەفا ڕەسووڵ، قادر فەتاحی قازی، ئیبراهیم ئەحمەد، عوسمان شارباژێڕی.

## سەید حوسێن حوزنی موکریانی

١٣١١ - ١٣٦٧

سەید حوسێن کوڕی سەید عەبدوللەتیف کە نازناوی داماو و خدۆک و بێژەنە، بەحوزنی موکریانی ناسراوە لەساڵی ١٣١١ی کۆچی لە گەڕەکی حاجی حەسەنیان لە مەهابادا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و هەر لە منداڵییەوە لەلای باوکی و خاڵەکانی خەریکی خوێندن بووە و لە دوانزە ساڵیدا کەسوکاری خۆی بەجێ هێشتووە و بەرەو مەراغە و تەورێز و ئێرەوان و مۆسکۆ و پترسبورغ کەوتووەتە ڕێ و چەند ساڵێک لەو شارانەدا ماوەتەوە و پاشان چووەتە ئەفغانستان و هیندوستان و دوو ساڵیش لە ئەستەموولدا ماوەتەوە و لەوێدا خەریکی مۆر هەڵکەندن و خۆشنووسی بووە و ئەوسا ڕۆیشتووەتە حەڵەب و لەوێشدا چەند ساڵێک ماوەتەوە و لە پاشا چووەتە عێراق و لە ڕەواندزدا نیشتەجێ بووە و لەوێدا چاپخانەیەکی بەناوی (زاری کرمانجی) دامەزراندووە و ئەوسا گۆڤارێکی بەناوی زاری کرمانجی دەرکردووە و لەم کاتەدا ئینگلیزەکان بوختانیان بۆی دروست کردووە و خستوویانەتە بەندیخانەوە و ئەوسا ناردوویانەتە بەغدا لەوێدا لە ساڵی ١٣٦٧ی کۆچی دەرمانخواردیان کردووە و پاشان تەرمەکەیان بردووەتە هەولێر و لەوێدا بەخاکیان سپاردووە.

سەید حوسێن حوزنی، بەیەکێ لە مێژوونووسان و وێژەوانانی هەرەبەرزی کورد دێتە ژمار، ئەو جگە لە زمانی کوردی بەزمانەکانی فارسی و عەرەبی و تورکی و ئینگلیزی ئاشنایەتیی هەبووە و لە ماوەی تەمەنیدا گەلێ پەڕتووک و نووسراوی بایبداری نووسیون کە هەندێکیان بریتین لە: خونچەی بەهارستان، مێرگەی دڵان، ئاورێکی پاشەوە، شاهەنشای کوردی زەند، میرانی سۆران، بەکورتی هەڵکەوتی دیریکی مێژوو؛ کورد و نادر

شا، ناودارانی کورد، پێشکەوتن، کوردستانی موکریان، چەند لاپەڕەیەک لە دیریکی کوردستانی موکری، پێشەوای ئاین، وێنەگەری و کوڵین، بەخێوکردنی کرمی ئاورێشم و هەندێ نووسراوی تر.

ئەمەش پارچە پەخشانێک لە مامۆستا سەی حوسێنی حوزنی کە لە پەڕتووکی کوردستانی موکریان هەڵمان بژاردووە، وەکو دەڵێ:

زەوی و خاکی ئەمڕۆ کە ناوی موکریانە، خاکێکی زۆر بەپیت و بەرەکەت و حاسڵ خێرە و کەوتووەتە جەنووب و جەنووبی شەرقی و شەرق و جەنووبی غەربیی گۆلی ورمێوە، بەڵام لە پێشدا بەخاکێکیان گوتووە کە خاکی مادی بچووک بووە و ئەمڕۆ کە ئەیالەتی ئازەربایجانی پێ دەڵێن هەروەکو لە داهاتوودا دێتە گوتن.

کێوەکانی موکریان ئەو کێوانەن کە لە شیمالی غەربی بۆ جەنووبی شەرقی ڕاکشاون و ریزە کێوێکن بەچاکی بەرامبەر بەکێوە بەرزەکانی زاگرۆس ڕاوەستاون و لێک گرێ دراون و پێکەوە نووساون و لە پێکەوەبوونی ڕشتەی زاگرۆسدا پێکەوە، لە نێوانی یەکدا ڕاکێشراون، بەهۆی شیو و دۆڵ و گەرووەکان و چۆمەکانەوە لێک پچڕاونەوە و بوونەتە دوو کەرت و بەدوو کێو.

کێوەکانی ڕۆژئاوا کە گەلێک توند و سەخت و دژوارن و لە ڕۆژهەڵاتەوە بەبەرزیی نێونجی کێوەکان ۲۲۰۰ متر دەبن، سەر قۆچکە و تەپڵەسەری ئەو ڕشتە کە لەنێوی مەزرای شنۆ و ئالان دان و یەکەیەکی پێکەوە لێک نەپچڕاوە و هەڵکەوتووە، ئەمانەن: چیای ڕەش، کێوی سپی، باررزین، کانی خولا، قەندیل، باقر، حاجی ئیبراهیم و جگە لەوانە چەند شاخی قۆپی دیکەش هەن کە سالّی دوازدە مانگ پترین مانگانی سالّ ئەو کێوانە بەبەفر داپۆشراون و کوێستانێکی زۆر ڕەنگین و جوانن.

لە نێوانی گەردنی کێلە شین و ئالاندا ڕشتە کێوەکانی موکریان خاوەند ڕێکوپێکی وێچوونێکی زۆر جوان و خاوێنن، ڕاکێشرانیان لە شەمالی غەربییەوە بۆ جەنووبی شەرقی وە خوار بووەتەوە و ڕیز ڕاوەستاون و لێک پچڕاوەیان لە ئاراراتەوە لەگەڵ کێوەکانی زەهاو و لوڕستان و لە ڕۆژهەڵاتی موکریاندا دوو ڕیزە کێو هەڵکەوتوون، یەکێکیان ناوی بەردەسیر و هی دووەمیان ڕشتەی موکریانە و لە بەرامبەرەوە وەکو یەکدی هەڵکەوتوون، گەرووی چۆمی چەغەتوو لێکی بڕیون، ڕشتەی کێوی بەردەسێر، چۆمی تەتەهوو دڕیویەتی و کردوویەتە دوو لەت، کلکەی ئەو ڕیزە شاخە بەناوی کێوی کورتەک دەناسرێ، هەتا شاری سابلاخ و جەنووبی گۆلی ورمێ ڕاکشاوە و درێژی کێوی بەردەسێر لە شیمالی غەربییەوە بۆ جەنووبی شەرقی بەکەمێک خواربوونەوە ڕوو بەڕۆژهەڵات درێژ بووە و ڕاکشاوە.

سەرچاوەکان

١- کوردستانی موکریان ،نووسراوی حوسێن حوزنی موکریانی - ڕەواندز ١٩٣٨.

٢- پێشکەوتن، کردەوەی حوسێن حوزنی موکریانی - هەولێر ١٩٦٢.

## تۆفیق وەهبی

١٣١١ - ١٤٠٤

تۆفیق، کوڕی مارف کە بەتۆفیق وەهبی ناسراوە لە ساڵی ١٣١١ی کۆچی لە سلێمانی لە دایک بووە و دەوری سەرەتایی و ناوەندیی هەر لەوێدا تەواو کردووە و پاشان چووەتە بەغدا و زانکۆی ئەفسەریی تەواوکردووە و بووەتە ئەفسەر و لە پاش چەند ساڵێک بەپلەی سەرهەنگی گەیشتووە و ئەوسا بووەتە مامۆستای زانکۆی ئەفسەری و لە دوای ماوەیەک کراوەتە فەرمانداری سلێمانی و پاشان بووەتە وەزیری پەروەردە و ماوەیەکیش بووەتە سناتۆر و لە پاش شۆڕشی ١٩٥٨ ڕۆیشتووەتە تورکیە و لەوێوە بەرەو ئینگلستان کەوتووەتە ڕێ و ئیتر لەوێدا ماوەتەوە تا لە ساڵی ١٤٠٤ی کۆچی گیانی بەگیان ئافەرین ئەسپاردووە و لەسەر ئەسپاردەی خۆی تەرمەکەیان بردووەتە کوردستان و لەسەر کێوی پیرەمەگروون ناشتوویانە.

تۆفیق وەهبی بەیەکێ لە وێژەوانان و زانایانی هەرەبەرزی کورد دێتە ژمار، ئەو لە زانستی زماننناسی و وێژە و فەلسەفە و مێژوودا مامۆستا بووە و یەکەمین زانای کوردە کە لەسەر زمانەکانی هیندوئەورووپایی و پەیوەندیی زمانی کوردی بەوانەوە کۆڵیوەتەوە و گەلێ لە زانایانی ئەورووپایی بۆ نووسینی نووسراوەکانیان کەڵکیان لە زانستی ئەو وەرگرتووە و ئەویان یادکردووە. گەلێ لە بەرهەمەکانی ئەم مامۆستایە هێشتا چاپ نەکراون و هەروا بەدەستنووس ماونەتەوە و ئەوانەی کە چاپ کراون بریتین لە: فەرهەنگی کوردی ئینگلیزی، دەستووری زمانی کوردی، خوێندەواریی باو، قسنێک لە کوردستاندا، بەیان حەقیقەت، بنەچەکەی کوردان و بنچینەی زمانی کوردی، ئێزیدییەکان ئەهریمەن پەرست نین، کورد و ماد، بنج و بناوانی زمانی کوردی لە توێکڵە گوێزێکدا، ئاڵتوون کۆپری، مێژووی ناوی کەرکووک، واتای قەڵاچوالان، وە گەلێ نامیلکە و وتاری تر.

ئەمەش بەشێک لە یەکێ لە وتارەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبی لە سەردێڕی بنجی زمانی کوردی کە وەرمانگێرایە سەر زمانی کوردی کە دەڵێ: مێژوونووسانی موسڵمان کە لەسەر بنج وبناوانی زمانی کوردی ڕۆیشتوون و لێی دواون، تووشی گەلێ هەڵە بوون، بەڵام لەم دواییەدا زانا ئەورووپاییەکان گەلێک جوان لەسەر ئەو مەبەستە کۆڵینەتەوە، لەناو

هەموویاندا دەتوانین لە مینۆرسکی بدوێین کە بەڕاستی لە بارەی کورد و کوردستانەوە گەلێ مەبەستی نووسیوە و خۆی ماندوو کردووە. ئەو لای وایە هەر لێکۆڵینەوەیەک کە لەسەر کورد و زمانی کوردی بکرێ دەبێ لەسەر بنەڕەتی ماد و زمانی مادیدا پێک بێ. منیش لەسەر ئەو بڕوایەم کە کورد و ماد هەر یەکن و کورد و زمانی کوردی لەسەر بنچی ماد و زمانی مادی ڕواوە. بەڵام یەکێک لە خۆرهەڵاتناسەکان بەناوی مەکەنزی ئەمەی پێ دروست نییە و لەم بارەشەوە بەڵگەیەکی نەهێناوە، ئەو زمانی کوردی هەر لەگەڵ زمانە ئێرانییەکان پێک دەگرێ و بەراوردی دەکا ئەمەش دروستە و ئێمەش زمانی کوردی بەیەکێ لە زمانە ئێرانییەکان دادەنێین، بەڵام بنجوبناوانی زمانی کوردی دەچێتەوە سەر زمانی مادی، هەندێک سەرچاوە و بەڵگەی مێژوویی لە دەستدان کە لە پاش ساسانییەکان ناوی ماد گۆڕاوە بووە مادمای و ماه، وە ئێستاش ئەو وشانە لە زمانی کوردیدا بەکار دەبرێن، وە لام وایە ئەو کوردانەی کە ئێستا کۆچەر نین و لە شوێنێکدا نیشتەجێن دەچنەوە سەر ماد و لە ڕەچەڵەک و ڕەگەزی ئەوانن.

ئەو تیرە هیند و ئێرانییانەی کە پاشان لەگەڵ گەلە دراوسێکانی گەرۆک تێکەڵاویدان پەیدا کردبوو، هەر لەمێژەوە مەڵبەندە مادییەکانیان لە مەترسی خستبوون.

لە سەردەمی پارتەکاندا یاسا و ڕێ و شوێنی خۆماڵییەکان زۆر باشتر لە هێزی ناوەندیی پارتی توانیویانە مادە کێوییەکان بەڕێوەبەرن و پێداویستییەکانیان پێک بێنن. هەر لەبەرئەوەش بوو کە ئەردەشێری پاپەکان ٢٤١ - ٢٢٥ی زاینی بەسەر کوردەکانی مادیدا زاڵبوو، وە ئەم زاڵبوونەش لە پەڕاوەکەی خۆیدا کە ناوی کارنامەی ئەردەشێری پاپەکانە نووسیوە.

ئەردەشێری پاپەکان پاشان وڵاتی پارتییەکانیشی داگیر کرد. هەر ئەم پاشایە لەناو نووسراوەکەی خۆی ماد و کوردی بەیەک نەتەوە داناوە، چونکە خۆیشی کورد بووە. هەروەها لە ڕاپۆرتی شەڕەکانی شاپووری ساسانی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەم پادشایە لە هەولێر لەگەڵ مادە کێوییەکاندا بەشەڕ هاتووە کە دیارە کوردەکانن و لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ماد و کورد هەر یەکێکن.

سەرچاوەکان

١- دەستووری زمانی کوردی، نووسینی تۆفیق وەهبی - بەغدا ١٩٢٩.

٢- خوێندەواریی باو، نووسراوی تۆفیق وەهبی - بەغدا ١٩٣٣.

٣- قسنێک لە کوردستاندا، نووسینی تۆفیق وەهبی - بەغدا ١٩٤٧.

٤- بەیان حەقیقەت، نووسینی تۆفیق وەهبی - بەغدا ١٩٤١.

## جەلادەت بەدرخان

١٣٧١ - ١٣١٧

جەلادەت، کوڕی ئەمین عالی بەدرخان لە ساڵی ١٣١٧ی کۆچیدا لە شاری ئەستەمووڵ لە دایک بووە و هەر لەوێدا خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی تەواو کردووە و پاشان چووەتە میسر و لەوێوە ڕۆیشتووەتە ئەڵمان و خوێندنی یاسای تەواوکردووە و لیسانسی وەرگرتووە و لەپاشا چووەتە شام و لەوێدا نیشتەجێ بووە و زۆربەی کاتی خۆی لەسەر لێکۆڵینەوەی زمان و وێژەی کوردی بردووەتە سەر و زۆربەی وتارەکانی لە گۆڤاری هاوار و ڕووناهیدا بڵاوکردوونەتەوە و ژمارەی وتارەکانی لە هەزار تێ پەڕیوە. پەڕاوی کێشەی کورد یەکێکە لە بەرهەمە بایەدارەکانی کە بەناوی دوکتۆر بلەچ شێرکۆ بڵاوبووەتەوە کە لەو نووسراوەدا جەلادەت بەدرخان بەجۆرێکی ڕێکوپێک باسی مێژووی کورد و کوردستانی کردووە و لە زمان و وێژەی کوردی دواوە. ئەم زانایەمان لە ساڵی ١٣٧١ی کۆچیدا گیانی بەگیان ئافەرین سپاردووە و بەپێی ئەسپاردەی خۆی لە گۆڕستانی مزگەوتی مەولانا خالید بەخاک سپێراوە.

جەلادەت بەدرخان یەکێکە لە نووسەر و زانا هەرە بەرزەکانی کورد کە گەلێ ڕاژەی بەزمان و وێژەی کوردی کردووە و ئەو جگە لە زمانەکەی خۆی بەزمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسی و ئەڵمانی و ئینگلیزی و فەرەنسی ئاشنایەتیی هەبووە و، بەو زمانەش گەلێ وتاری لەبارەی کوردەوە بڵاوکردوونەتەوە. ئەمەش نموونەیەک لە پەڕاوی کێشەی کورد کە دەڵێ:

زمانی کوردی وەک زمانە ئارياییيەکانی خۆرهەڵات، لە پەهلەوی و سانسکریتی جیابووەتەوە و ئەم زمانەش لەسەرەوە بەرەو ڕاست و ڕێنووسێکی سەربەخۆ دەنووسرا، نزیکاتیی زۆری لەگەڵ ڕێنووسی ئاشووری و ئەرمەنیدا هەبووە، ئەم ڕێنووسە وازی لێ هێنراو بەڕێنووسی عەرەبی کۆتایی پێ هێنرا کە زمانی قورئانی پیرۆزە، زمانی ئێستای کوردی دەبێ بەچوار شێوە زمانی جیاجیاوە کە ئەمانەن: کرمانج، گۆران، لوڕ، کەلهوڕ. لەناو ئەمانەشدا شێوەزمانی لوڕی لە هەموویان زیاتر لە پەهلەوییەوە نزیکە، لەبەرئەوەی لوڕەکان لە مەڵبەندی پەهلەوییەوە نزیکن و کلدانی و ئاشوورییەکان زۆر کاریان تێ نەکردوون. دوای ئەم، کەلهوڕی لێی نزیکە و ئینجا گۆران و پاشان کرمانج، بەڵام ئەم دوانەی دواییان زمانەکانی کلدانی و ئاشووری کاریان تێ کردوون، چونکە دراوسێتیان نزیکە. کۆنترین زمانی ئاريایيیەکان زمانی زەند و پەهلەوییە و زمانی زەند کاتی خۆی زمانی کتێبی ئایینیی ئێرانی کۆن بووە کە پێیان وتووە زەند ئاڤێستا، چونکە ئەم زمانە لە

سەرتاپای ناوچەکانی باکووردا لە بانی ئێراندا هەر لە خۆرئاوای بوخاراوە تا ئەرزنجان باو بووە و ئەم زمانە تا ئەم دواییەش لەلایەن زەردەشتییەکان پیرۆز بووە.

سەرچاوەکان

١- رووپەلێن ئەلفابێ نووسین، جەلادەت عالی بەدرخان، شام ١٩٣٢.

٢- القضية الكردية. تاليف د. بلج شيركوه – قاهرة ١٩٤٥.

٣- مێژوو، نووسینی د. کەمال مەزهەر – بەغدا ١٩٨٣.

## ڕەفیق حیلمی

١٣١٨ – ١٣٨٠

ڕەفیق حیلمی کوڕی ساڵح ئەفەندی لە ساڵی ١٣١٨ی کۆچی لە شاری کەرکووک پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و لە پاشا قوتابخانەی عەسکەریی لە سلێمانی تەواو کردووە و ئەوسا چووەتە ئەستەموول و لە کۆلیجی ئەندازیاریدا بڕوانامەی بەرزی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە زێد و مەڵبەندەکەی خۆی و ئەوسا ماوەیەک خەریکی وانەوتنەوە بووە و پاشان کۆمەڵێکی بەناوی کوردستان پێک هێناوە و شێخ مەحموودی نەمریش ئەوی زۆر خۆش ویستووە و گەلێ کاری نهێنیی پێ سپاردووە و لە دەوری ئەوا گەلێ وتاری ڕامیاریی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا نووسیون و لاوەکانی بۆ بووژاندنەوەی فەرهەنگ و هونەری کوردی هان داوە و لە پاشا کۆمەڵێکی تری بەناوی هیوا پێک هێناوە و سەرئەنجام لە ساڵی ١٣٨٠ی کۆچیدا گیانی سپاردووەتە گیان ئافەرین.

مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەیەکێ لە زانایان و وێژەوانانی کورد دێتە ژمار و ئەو گەلێ پەڕاوی سەبارەت بەوێژە و مێژووی کورد نووسیون کە هەندێکیان بریتین لە: شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، یادداشت، پاش تەمموز، خولاسەی مەسئەلەی کورد، نامیلکەی کۆمەڵایەتی، سەرەتای عیلمی ژمارە.

ئەمەش پارچە پەخشانێک لە مامۆستا ڕەفیق حیلمی کە لە پەڕتووکی بەنرخی یادداشت هەڵمان بژاردووە کە دەڵێ:

کە دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕی گەورەی یەکەمی ١٩١٤دا لەگەڵ (ئەڵمان) یەکی گرتەوە و بەهۆی سەرکردەکانی کۆمەڵەی (یەکیەتی و سەرکەوتن)ەوە، بەرامبەر بەدەوڵەتە سوێندخۆرەکان واتە بەرامبەر بەئینگلیز و هاوپەیمانەکانی کەوتە شەڕەوە؛ گەورەکانی سیاسیی عەرەب بۆ گەیشتن بەئامانجی خۆیان و سەربەخۆیی وڵاتەکانیان ویستیان لایەنی

دوژمنەکانی (تورک) بگرن و تێیان گەیاندن کە بەو مەرجە دوای بڕانەوەی شەڕ دەوڵەتێکی عەرەبییان بۆ دابمەزرێنن، ئامادەن بەیارمەتیدانی ئینگلیز و هاوپەیمانەکانی.

کوردەکانی تورکیاش هەرچەن لە ماوەی ئەم شەڕەدا لە (١٩١٤ تا ١٩١٨) لەگەڵ لەشکرەکانی تورکا پێکەوە و شان بەشان شەڕیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی کرد و بەگژ سوێندخۆرەکاندا چوون، بەڵام "ژەنەراڵ شەریف پاشا"ی کورد لە (١٩١٤)دا لەگەڵ بەریتانیا کەوتە گفتوگۆ و بەو مەرجە سەربەخۆیی بدرێ بەکوردستان پەیمانی دا بەیارمەتیی لەشکرەکانی سوێندخۆرەکان لەلایەن کوردەوە. جگە لەمە لە حوزەیرانی (١٩١٨) لەکاتی ڕابوردنی (سێر پەرسی کۆکس) بەفەرەنسەدا (شەریف پاشا) چووە مارسیلیا. لەوێ لەگەڵ کۆکس ئەم باسەی دووبارە کردەوە. بەڵام ئەم تەقەلایانەی عەرەبەکان و کوردەکان لەو ساڵەدا (١٩١٤) بێ سوود بوو و بێ وەڵام مایەوە. سوێندخۆرەکان لەو ڕۆژانەدا پێویستییان بەیارمەتیی کورد یا عەرەب نەبوو. لەبەرئەمە نەیان دەویست کە بەخۆڕایی بچنە ژێر باری (پەیمان)ەوە. کوردەکان کە دەسییان لە ئینگلیزەکان و هاوسوێندەکانیان شوشت ئینجا ڕوویان کردە (ڕووس)ەکان. (کۆمەڵەی نیشتمانیی کورد)ی ئەو ڕۆژە بەرامبەر بە(پەیمان)ێ کە لە بابەت سەربەخۆیی کوردستانەوە لێیان وەرگرتن یارمەتیی ئەو لەشکرانەیان دا کە لە (ئەرزنجان) و (بتلیس)ەوە هاتنە خوارەوە و بەم جۆرە بەشێکی زۆری کوردستانی تورکیا داگیر کرا. بەڵام بەئەنجام ئەم لەشکرانەی (ڕووس) گەڕانە دواوە و کوردەکانیان بۆ تورک بەجێ هێشت. لەبەرئەوە (ولایەت)ە کوردەکانی تورکیا تووشی تەنگوچەڵەمەیەکی گەورە بوون و گەلێ سزا و دەربەدەری و پەت پەتییان بەسەرهات. لەگەڵ ئەمەشا لە (١٩١٨) و لە دوای بڕانەوەی شەڕ کۆمەڵەکانی نیشمانیی کورد لە (ئەستەمووڵ) جارێکی تر لەگەڵ نمایندەکانی دەوڵەتە سوێندخۆرەکانا کەوتنەوە گفتوگۆ و بڕیار لەسەر ئەوە درا کە (شەریف پاشا) بەناوی نمایندەی کوردەوە لە (مەجلیسی ئاشتی)یا داوای حەقی کورد بکا. لە ولای تریشەوە ئەمیر جەلادەت و دکتۆر کامەرانی برای و (ئەکرەم بەگ)ی کوڕەزای (جەمیل پاشای دیاربەکر) لە (ئەستەمووڵ)ەوە هاتنە کوردستان و لەگەڵ (میجەر نوئێل) و (ئەحمەد فایەق) یەکیان گرتەوە.

ئەمانە لە خۆرهەڵاتی (ئەنادۆڵ) لە ولایەتەکانی کورددا گەشتێکیان کرد، چاویان بەکوردە ناودارەکان کەوت. باسی دواڕۆژی کوردیان کرد. بۆ ئەوە هەوڵ دەدرا کە پشتی (شەریف پاشا) بگیرێ. بەناوی کوردەوە تەلگرافی بۆ بنووسرێ. مەزبەتەی بۆ بنێرێ. لە (مەجلسی ئاشتی)یا داواکردنی حەقی میللەتی کورد و سەربەخۆیی کوردستان پێ بسپێرێ. ئەوەش

لەبیر نەچووەوە کە بێتو تەقەلای کۆمەڵەکانی سیاسیی کورد لەگەڵ حکوومەتی ئەستەمووڵ و تێکۆشانەکەی (شەریف پاشا) لە مەجلسی ئاشتییا بەئەنجام نەگەیشت، کوردەکانی ئەم ولایەتانە (شەش ولایەتەکانی خۆرهەلاتی تورکیا) بەچەکەوە ڕاست بنەوە و لە ڕێی شۆڕشەوە بگەن بەئامانج. بەڵام ئەمانە سەری نەگرت. وەکو لەمەوبەر (بەرگی یەکەم) وتبوومان هێزەکانی (مستەفا کەمال) شوێن ئەم (هەیئەتە) کەوت و لەو ناوەیان دەرپەڕان. ئەوەندە نەمابوو بیانگرن و لەناویان بدەن. بەیارمەتی هەندێ کوردی بەغیرەت و خاوەن دەسەلات ڕزگاریان بوو و خۆیان گەیاندەوە ئەستەمووڵ. (شەریف پاشا) لەلایەن کوردەکانی تورکیاوە پشتیوانیی نەکرا. سەرەڕای ئەمە بەهاندان و چاوترساندن و بەفێڵ و دەم شیرین کردن، لەلایەن (مستەفا کەمال) و سەرکردەکانیەوە بەتەلگرافێکی زۆری ڕاست و یا درۆ بەناوی ئەو کوردانەوە بەدرۆش خرایەوە. بەڵام ئەمانە هیچی (شەریف پاشا)ی سارد نەکردەوە و لە تێکۆشان و تەقەلای نەخست. توانیی وەکو (سیاسی)ێکی زرنگ حەقی کورد بخاتە بەرچاوی مەجلیسی ئاشتی و ئەو سێ بەندە کە هەموو کوردێک بیستوویە و دەیزانێ بئاخنێتە (پەیمانی سیڤەر)ەوە. لەوەدا گومان نابرێ ئەگەر ئەو نیشتمانپەروەرانە (جەلادەت و کامەران و هاوڕێیەکانی) کە چوونە کوردستانی تورکیا مەبەسی خۆیان بەجێ بهێنایە واتە هێزەکانی (مستەفا کەمال) بەرەنگاریان نەبوونایە و کوردەکانیان بۆ یەک بخرایە لەکاتی پێویستا لەوانەبوو بەری ئەو (تۆ)وە بچنرێتەوە کە (شەریف پاشا) چاندبووی... بەڵام (بەند)ەکانی دەربارەی سەربەخۆیی کورد و کوردستان کە خرابووە (پەیمانی سیڤەر)ەوە، بەهۆی سەرکەوتنی (مستەفا کەمال) -بەرامبەر بەلەشکرەکانی یۆنان - کە ئەویش بەیارمەتیی کوردەکان خۆیانەوە پێکهاتبوو لەبیر چووەوە و لە دوای ئەم سەرکەوتنە لە کاتێکدا نمایندەکانی دەوڵەتە سوێندخۆرەکان لەگەڵ نمایندەی مستەفا کەمال (سەرکەوتوو) بۆ بەستنی گرێی پەیمانێکی تازە لە (لۆزان) کۆبوونەوە (پەیمانی سیڤەر) و سێ (بەند)ەکەی دەربارەی کورد خرایە ژێر دۆشەک و باسی نەکراوە...

سەرچاوەکان:

١- شیعر و ئەدەبیاتی کوردی نووسینی ڕەفیق حیلمی - بەغدا ١٩٤١.

٢- یادداشت نووسراوی ڕەفیق حیلمی - بەغدا ١٩٥٨.

# شێخ محەمەدی خاڵ

١٣٢٢ - ١٤٠٩

محەمەد، کوڕی حاجی شێخ ئەمین کە بەخاڵ ناسراوە، لە ساڵی ١٣٢٢ی کۆچی لە سلێمانیدا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێند بووە و پاشان لەلای زانایانی گەورەی ئەو سەردەمە ڕێزمانی عەرەبی و ڕەوانبێژی و پیتۆڵیی خوێندووە و ئەوسا ماوەیەک خەریکی خوێندنی شەرعی ئیسلام و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری گەورەی ئیسلام بووە تا ودمی مەلایەتیی وەرگرتووە و لەپاشا خەریکی وانەوتنەوە بووە و لە دواییدا لە کاری دەوڵەتی دامەزراوە و بووەتە قازی و گوێزراوەتە بەغدا و ئەوسا بووەتە ئەندامی کارای کۆڕی زانیاریی کورد و گەلێ کاروباری تری پێ سپێراوە و سەرئەنجام لە ساڵی ١٤٠٩ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بەخاک سپێراوە.

مامۆستا خاڵ بەیەکێ لە زانایان و وێژەوانانی هەرەبەرزی کورد دێتە ژمار و ئەو لە فەرهەنگنووسیی کوردی و لێکدانەوەی قورئاندا بێ وێنە بووە و لەم بارەوە گەلێ تێ کۆشاوە و هەروەها سەبارەت بەزمان و وێژە و مێژووی کورد، چەندین بەرگ پەڕتووکی نووسیوە کە بریتین لە: تەفسیری خاڵ، ناڵەی دەروون، فەلسەفەی ئاینی ئیسلام، ئاگاداریی ئەمانەت، مەولوودنامەی نەوئەسەر، فەرهەنگی خاڵ، مفتی زەهاوی، پەندی پێشینان، ئاین و ڕەوشت و جوان کردنی، ڕێزمانی کوردی، پەروەردەی ئاینی، هەروەها هەندێ پەڕاویشی بەزمانی عەرەبی لە بارەی شێخ مارفی نۆدێ و مەلا عەبدوڵلای بێتووشی نووسیون و گەلێ وتاریشی لە گۆڤارەکان و ڕۆژنامەکاندا بڵاو بوونەتەوە.

ئەمەش پارچە پەخشانێکی ئەم زانا هەرە بەرزەمان کە لە پەڕاوی جزمی یەکەمی ناڵەی دەروون هەڵمان بژاردووە و کورتمان کردووەتەوە پێشکەشتانی دەکەین:

بەچاوە پووچە کوێرەکانیا بەمادەرزادی کوێر بووبوو، دەتوت هەرچی لە جیهانا نایزانێ و، هەر لە بڕ ناکاتەوە. بەخوێندەواری و بێ ئاگادارییەکەی لە هەموو ڕوویێکەوە دەتوت هەرچی بەهرەیە نییەتی.

کوێرێکی مادەرزادی، ڕەشتاڵەی، کونجی، بالابەرزی، ڕەقەڵە لە سلێمانی لە ماڵێکی هەژاری، بێ نەوا لەدایک بووبێ، هەموو خوێندن و خوێندەوارییەکەی، سی جزمەی قورئان بووبێ کە بەڕەش خوێنی لەبەری کردبێ و، دەستمایەی ژیانی بووبێ، دەنگی ئەوەندە خۆش نەبووبێ، کە مەردوم خەتمی قورئانی پێ بکەن، یا لە پرسەدا پێی بخوێنن. خۆیشی لەبەر هەژاری و هاتوچۆی ئێران و بەردەڵبەردی کوردستان و سواڵکردن لە دێهاتانا، زۆر

دەرفەتی دەورکردنەوەی قورئانی نەبووبێ، کەچی لەگەڵ ئەمانەشدا ئەمەندە زیرەک و بەزەین بووبێ، توانیبێتی بەپێچەوانە دەوری قورئان بکاتەوە تا سەر و، پاشەوپاش لە ژێڵدا ئایەت بەئایەت پیا بڕوا تا لەسەرەوە دەردەچێ کە ئەمە لەناو قورئانا بەچاوساغی قورئان ڕەوان ناکرێ چ جای کوێری مادەرزاد.

ئەم کوێرە بێ ناوونیشانە پیاوێکی بەهرەمەندی هەڵکەوتووی خوداداو بووە، دەروونی سیخناخ بووە لە زانین و زانیاری و، کاکڵباز بووە نەک توێکڵ پەرست، هەموو ساڵێک هاوینان لەگەڵ چەند کوێرێکی تردا چووە بۆ کوردستانی ئێران، لە ڕێی ژیان و نان پەیدا کردنا، پایزێکی درەنگ هاتۆتەوە، ئینجا بەبۆنەی ئەم هاتوچوونەوە، ناوبانگی زیرەکی و وریایی و بلیمەتیی وا بڵاو بووبۆوە، هەموو جارێ لە بانە و سەقز و سنە و سەردەشت و سابڵاخەوە مەتەڵ و هۆنراوی فارسیی زۆر قورس و گران و پێچراوەیان دەنارده لای بۆ لێکۆڵینەوە و مەبەس لێدانەوەی، ئەمیش بەڕاستی شەنوکەوی تیا دەکرد و، کاکڵ و توێکڵ و کاودانی بۆ جیا دەکردنەوە و، بەپوختەکراوی وەک هێلکەی پاککراو، بۆی دەناردنەوە.

ئەم کوێرە چاوپووچە ئەمەندە پڕ هۆش و گۆش بووە و، چاوی دڵ و دەروونی ڕوون و تیژ و بەهێز بووە، ئەوی ئەو کردوویەتی بەهەزار چاوساغ نەکراوە، جارێ پێشەکی هەرچەند سەعاتەکەی چڵکن بووبێ خۆی لەسەر دەسەسرەکەی ڕووتی کردووە و هەڵی وەشاندووە و پاکی کردووەتەوە و تێکی خستووەتەوە، تەنانەت جارێکیان دەقیقە ژمێرەکەی ون دەبێت، خۆی لە توێکڵی ڕەقی قامیش، بۆی دروست دەکاتەوە و، ماوەیێکی زۆر بەو ڕەنگە ئیشی پێ دەکات. بارەها بێچووی زیوی نیشانەکراویان بۆ تێکەڵی کیسەیەک بێچووی تر کردووە، دۆزیویەتەوە.

لەمانە سەیرتر ئەمەیە هەرچەند کتێبێکیان دابێتە دەست، ڕووەکەی دۆزیوەتەوە، واتە ڕووی کێتبەکەی کردووەتە خۆی وەک یەکێک کە بیەوێ بیخوێنێتەوە. زۆر جار ئەم کوێرە وشیارە، چووەتە کۆڕی زۆر گەورە و لەگەڵیان دانیشتووە و لێیان پرسیوە مامۆستا چەند کەسین؟ ئەمیش وتوویەتی وس بن، کەمێک گوێی گرتووە، لە پاشا وتوویەتی ئەوەندە کەسن، کە تەماشایان کردووە دەق دەرچووە. یا لێیان پرسیوە، ئەم ژوورە چەند داری دارەڕای تیایە، لە پاش چەند هەناسەیەک وتوویەتی ئەمەندە، کە تەماشایان کردووە تەواو دەرچووە!

سەیر لەمەدایە تا بڵێیت دەست ڕاست و نیشان شکێن بووە، تەنانەت دەگێڕنەوە، کە جارێک لەلادێی بزنێکی دەست دەکەوێت ئەوماڵەی کە ئەم تیا دەبێت، حەوشی نابێ. شەوێ خۆی و خانەخوێکەی لەسەر کەپر دەنون، بزنەکە لە خوارەوە دەبەستێتەوە بەگوریسێکەوە، سەری گورێسەکەی لە سەربان دەبەستێ بەدەستی خۆیەوە، نیوەشەو گورگێک دێتە سەر

بزنەکە، کوێر خەبەری دەبێتەوە بەجووڵانەوەی گوریسەکەدا عاستی گورگەکە دەدۆزێتەوە تفەنگێکی تێ دەگرێ دەیکوژێ.

ئەم کوێرە خوادادە، گەلێ کردەوەی دەچێتەوە سەر زیرەکی و وریایی، بەڵام گەلێکیشی ژیری و بیر لێی کوڵە، وەک دەگێڕنەوە دەڵێن: لە ژووری خۆی دانیشتووە لەگەڵ خێزانیدا، چرکەی سەر بانەکە هاتووە، لەپاش نیو سەعات دووبارە چرکەی سەربانەکە هاتووەتەوە، ئەم کوێرە بە ژنەکەی خۆی وتووە: ئەم دوو چرکەیە یەک کچ بوو لەو سەرەوە کە هات کچ بوو، لەم سەرەوە کە گەڕایەوە بووە بەژن کە دەچنە بنج و بناوانی و باش پۆست کەندەی دەکەن، لە پاش ماوەیەک دەردەکەوێ، قسەکە ڕاست بووە. ئەم کوێرە کە باسمان لێوە کرد مەلا حەمدوونی کوێر بووە کە تا بڵێیت هۆنەر بووە.


سەرچاوەکان:

١- تەفسیری خاڵ، لێکدانەوەی شێخ محەمەدی خاڵ، سلێمانی ١٩٣٤.

٢- ناڵەی دەروون، نووسینی شێخ محەمەدی خاڵ، بەغدا ١٩٨٤.

٣- فەرهەنگی خاڵ، دانراوی شێخ محەمەدی خاڵ، سلێمانی ١٩٦٠.

٤- پەندی پێشینان، کۆکردنەوەی شێخ محەمەدی خاڵ، بەغدا ١٩٥٧.


## گیوی موکریانی

١٣٢٣ - ١٣٩٩

عەبدوڕەحمان کە بەگیوی موکریانی ناسراوە لە ساڵی ١٣٢٣ی کۆچی لە شاری مەهاباد لەدایک بووە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و لە دە ساڵاندا لەگەڵ کاکی سەید حوسەین حوزنی موکریانی ڕۆیشتووەتە حەڵەب و لەوێدا ماوەیەک خەریکی خوێندن بووە و پاشان چووەتە بەیروت و لەوێدا فێری زمانی فەرەنسە بووە و ئەوسا گەڕاوەتەوە حەلەب و لەپاش ماوەیەک بەرەو عێراق کەوتووەتە ڕێ و لە شاری ڕەواندزدا نیشتەجێ بووە و ئەوسا لەگەڵ براکەیا گۆڤارێکیان بەناوی (زاری کرمانجی) دامەزراندووە و دەستی کردووەتە نووسینی وتار و لە پاشا باری کردووەتە شاری هەولێر و لەوێدا گۆڤارێکی بەناوی (هەتاو) دەرکردووە و پاشان چاپخانەی (زاری کرمانجی) کە لە ڕەواندز دامەزرێنرابوو، هێناویەتە شاری هەولێر و خستوویەتە کار و ژمارەیەکی زۆر پەڕتووک و نامیلکە و گۆڤاری پێ چاپ کردووە و سەرئەنجام لە ساڵی ١٣٩٩ی کۆچی لە حەفتا و چوار ساڵیدا لە هەولێر گیانی بەگیان ئافەرین سپاردووە و لەوێدا نێژراوە.

گیوی موکریانی یەکێ لە وێژەوانان و نووسەرانی هەرەبەرزی کوردە و لە ماوەی تەمەنیدا

گەلێ پەڕتووک و نامیلکەی نووسیوە و چەند فەرهەنگێکی کوردی بەعەرەبی لە چاپ داوە و لە راستەقینەدا ئەو دەورێکی گەورەی لە مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردیدا بینیوە و دەیان ساڵ لە ژیانی جوانی و پیریی خۆی بۆ نووسینی فەرهەنگی کوردی تەرخان کردووە و لە ماوەی تەمەنیا زۆربەی شارەکان و شارۆڵکەکان و دێیەکانی کوردستان گەڕاوە بۆ ئەوەی وشەی کوردی لە زاری خەڵکەوە کۆ بکاتەوە و تەقەللا و کۆششی ئەو لە لە فەرهەنگنووسیی کوردیدا لاپەڕەیەکی گرنگە لە مێژووی پێشکەوتنی زمانی کوردیدا و کارەکانی هەموو نموونەن.

ئەو نووسراوانەی کە لەسەریان کۆڵیوەتەوە لە چاپیان داون، بریتین لە: دیوانی مەلای جزیری، دیوانی نالی، دیوانی سالم، دیوانی حاجی قادری کۆیی، دیوانی ئەدەب، دیوانی ئەدیب، دیوانی تایەر بەگی جاف. هەروەها چەندین فەرهەنگی بەعەرەبی و کوردی و فارسی و زمانەکانی تر نووسیوە و لە چاپی داوە کە بریتین لە: رابەر، فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردییە، کۆڵکەزێڕینە، فەرهەنگێکی کوردی بەفارسی و عەرەبی و فەرەنسی و ئینگلیزییە،، فەرهەنگی مەهاباد، فەرهەنگێکی کوردی و عەرەبییە، فەرهەنگی کوردستان فەرهەنگێکی کوردی بەکوردییە، گیونامە و هەندێ نامیلکە و وتاری تر.

مامۆستا گیو لە نووسینی پەخشانی کوردیدا شێوەیەکی سادەی بەکارهێناوە و زۆربەی نووسراوەکانی سادە و ڕەوانن و وتارەکانی بەوشەی جوانی کوردی نووسیون و ئەمەش پارچە پەخشانێکی ئەو کە لە نامیلکەی گیونامە هەڵمان بژاردووە کە دەڵێ:

ئەدەبیات و شوێنەواری وێژەیی بۆ هەموو گەلێک گەورەترین پشتیوانە و لە هەموو تەنگانە و لێقەومانێکیدا بەفریای دەکەوێ. گەلێکی خاوەندی زمان و وێژەبێ ئەگەر دەسەڵاتیشی لێ بڕووخێ کە تەکان بداتە خۆی سەرای سەردارێتیی خۆی لە جاران باشتر و خۆشتری بۆ دادەمەزرێنێتەوە.

یۆنانییەکان کە چەند سەدەیەک کەوتبوونە ژێر دەستی عوسمانییەکانەوە زمان و ئەدەبی یۆنان لە ئەورووپادا دەستە و لایەنگری بۆ پەیداکردن تا ئازادکران. ئێرانییەکانیش کە چەند سەدەیەکی کەوتبوونە ژێر دەستیانەوە وێژەی فارسی رزگاری کردن. عەرەبەکانیش کە چەندین سەدەبوو کەوتبوونە ژێر دەستی تورکەکانەوە، زیندوویێتی زمانی عەرەبی ئەوانی گەڕاندە ژێر سێبەری داری ئازادی و ئەوەیان بەسەر تورکان هێنا، هەروەکو بەچاوی خۆم دیتوومە با بەدەواری شڕی نەکردووە.

هەموو گەلێک بەهۆی زمان و هەستی نەتەوایەتی و چەشنەکانی ژیانیەوە لە هی تر جوێ دەکرێتەوە، کەواتە ژیان و ئابڕووی هەموو نەتەوەیەک بەندیواری بەزمانەکەیەوەیە، نەتەوەی

خاوەند زمان نامرێ و مەرگی راستەقینە ڕوو لە نەتەوەیەکی دەکات کە لە بەهرەی زمانەکەی خۆی بەشبراوبێ.

هەر هۆزێک بکەوێتە ژێر دەستی بێگانانەوە سەربەخۆیەتی و ئازادیتیی لەدەست دەردەچێ بەڵان دەستی لە ژیان بەرنابێ و ژیانی ئابڕوومەندانە بۆ نەتەوەی دیل تەنیا پارێزگاری زمانەکەیەتی، چونکو زمانی نەتەوەی دیل کلیلی گرتووخانەیە و رزگاربوونی زۆر ئاسانە، بەڵام کە هات و خوای نەخواستە دەستی لە پارێزگاری زمانەکەی خۆی شل بێ، هەروەکو ئازادێتی لە دەست چووە و پەردەی نامووسی نەتەوایەتیشی پارچە پارچە دەبێ، هەر نەتەوەیەکی زمانەکەی ڕوو لە بووژاندنەوە بکات، ئەستێرەی بەخت و هیواشی سەر لە ئاسۆی دەردەهێنێ و گەلێکی بەزمانەکەی خۆی ڕێگای زانست و هونەر بگرێتە پێش، بەهەموو ئاوات و ئامانجێکی بەرز و پیرۆزی خۆی دەگات، ئەو نەتەوەیە بەختیار و کامەرانە و ئەو وڵاتە ڕوو لە هات و شارستانێتی و ئاوەدانییە کە شارێگای بووژانەوە و پێشکەوتنیان بەچرای زانست و هونەرێک ڕەوشەن بکرێتەوە کە بەزمانەکەی خۆی هەڵسووڕێ و ئەو هۆزە بەبەختیار دەژمێردرێت کە ڕابەر و پێشەوایەکانی خوێندەوار و زانستپەروەر و هونەرپەرست بن، بەو مەرجە کە زمانی وێژەییان بەزمانەکەی خۆیان بێت.

تا ئێستا لە کوردستاندا هەزاران پیاوی ناودار و پسپۆڕ و بوێژی پایەبەرز و زانا و وێژەوانمان لێ هەڵکەوتوون کە هاوتایان نەبووە و لە ڕووی ئەوەوە کە ڕەنج و ئەرکەکەیان بۆ نەتەوەکەی خۆیان و کتێبەکانیشیان بەزمانی کوردی نەبوون و ون بوون و یا کڵاوی بێگانەیان لەسەر نراوە و ناناسرێنەوە.

نەتەوەی کورد وەنەبێ هەمیشە هەروا دواکەوتوو و سەرشۆڕ ژیابێ، چونکو ئەگەر هەروابایە نەک خۆی بەڵکو ناوی کورد و کوردستانیش لەسەر لاپەڕەی مێژوو نەدەمایەوە.

خودای مێهرەبان لە قورئانی پیرۆزدا بەو ئایەتە: «ستدعون الیٰ قوم اولیٰ بأس شدید» سام و هەیبەت و زەبروزەنگ و نەبەزێتیی کوردان بەگێتی نیشان دەدات و پێیان هەڵدەڵێ گەورەترین بەڵگەش بۆ ئەوە زۆرترینی موفەسرەکانن کە لەسەر ئەوەن ئەو قەومە کوردە، سا نەتەوەیەکی وا ئازا و نەبەز و بەسام و پڕ زەبروزەنگ، دیارە خاوەندی ماڵ و سامان و خوێندن و نووسین بووە.

کوردستان لەپێش میلاددا نەک تەنها خاوەندی دەسەڵات و نووسین و خوێندن بووە، بەزمانی کوردی و بەس بەڵکو لانکی شارستانیەتی و سەرچاوەی زانیاری و پێشکەوتن و هونەر و کانگای پۆشاک و پیشەسازی و بازرگانی بووە و سەرمەشقی ئازادێتی و پێشکەوتن و هونەری بۆ گشت نەتەوەکانی سەر ڕووی زەوی دا داوە.

سەرچاوەکان:

١- فەرهەنگی مەهاباد، دانراوی: گیوی موکریانی، هەولێر، ٢٥٧٣ی کوردی.

٢- گیونامە، نووسینی: گیوی موکریانی، هەولێر ١٩٦٠.

## مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

١٣٢٣ - ١٤٢٥

عەبدولکەریم، کوڕی فەتاح کە نازناوی نامییە، لە ساڵی ١٣٢٣ی کۆچی لە دێی تەکیەی سەر بەشارۆلکەی خورماڵ لەدایک بووە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و سەرەتا قورئانی پیرۆز و پەڕتووکە وردەڵەکانی تەواو کردووە و پاشان چووەتە سلێمانی و لە مزگەوتی مەڵکەندی لەلای مەلا حەمەومینی بالیکەدەری خەریکی خوێندنی ڕێزمانی عەرەبی و ڕەوانبێژی بووە و لەوێوە چووەتە هەورامان و لە دووڕوودا خوێندنەکەی پەرەپێ داوە و ماوەیەک لەلای شێخ عەلائەدین ماوەتەوە و کە شێخ ڕۆیشتووەتە بیارە، ئەویش لەگەڵیدا ڕۆییوە و ئەوسا گەڕاوەتەوە سلێمانی و لەلای شێخ عومەری قەرەداغی لە خانەقای مەولانا خالید، خەریکی خوێندنی ڕێبازی شافعی و لێکدانەوەی قورئان بووە تا ودمی مەلایەتیی لێ وەرگرتووە و لە ساڵی ١٣٤٧ی کۆچی لەسەر داخوازی شێخ عەلائەدین چووەتە بیارە و بووەتە مامۆستای قوتابخانەی بیارە و لە پاش چەندین ساڵ وانەوتنەوە، کۆچی کردووەتە سلێمانی و لەوێشدا لە مزگەوتی حاجی خان خەریکی دەرزوتنەوە بووە و پاشان چووەتە کەرکووک و لەوێوە بەماڵەوە ڕۆیشتووەتە بەغدا و لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی دامەزراوە و خەریکی وانەوتنەوە و ڕێنوێنی خەڵک بووە.

مامۆستا مەلا کەریم بەیەکێ لە زانا هەرەبەرزەکانی کورد دێتە ژمار، ئەو لە ماوەی تەمەنیدا گەلێ خزمەتی بەئاینی پیرۆزی ئیسلام و کولتووری کوردی کردووە و نزیکەی پەنجا مامۆستای ئاینی لە ژێردەستی ئەو ودمی مەلایەتییان وەرگرتووە و گەلێ پەڕاو و ناملیکەشی سەبارەت بەئاینی ئیسلام و کولتووری کوردی بەزمانەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی نووسیون کە لەناو ئەوانەدا دەتوانین ناوی ئەم پەڕتووکانە بەرین کە هەرکامیان گەوهەرێکی تاقانەن لە زانست و وێژەدا:

شەریعەتی ئیسلام، بارانی ڕەحمەت، ئاوی حەیات، تەفسیری نامی، دیوانی مەولەوی، دیوانی مەحوی، دیوانی نالی، دیوانی فەقێ قادری هەمەوەند، دیوانی بێسارانی، وتاری ئاینی، دوو ڕشتە، بەهار و گوڵزار، شەمامەی بێندار، بنەماڵەی کوردستان، جواهر الفتاویٚ، المفتاح، الورقات، العزيزه، الوجيهە، علماؤنا في خدمە العلم والدين،

شمشێرکاری.

مامۆستا مەلا کەریم لە هۆنینەوەی هۆنراویشدا دەستێکی باڵای هەیە و هۆنراوەکانی زۆربەیان ئاینی و کۆمەڵایەتین و گەلێ شیرین و دڵنشین و پاراون و پتر لەسەر شێوەی هیجای هۆنیونەیتیەوە. ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی ئەم زانا هەرە بەرزەمان کە دەڵێ:

بەجۆشی سینەی دایە و بابە لاو
بۆ کوڕی لاوی لە گەل بەجێماو
بەتاوی جگەر بۆ رۆڵەی منداڵ
کە دێت و دەڕوا کاتی گڕ و گاڵ
بەکزەی سینەی کچ و خوشکی چاک
بۆ مەرگی باوک و برای دڵ ڕووناک
بەپۆلی یاران لە مەدرەسەی دین
کە لەیەک ئەبڕێن لە ڕووی سەرزەمین
بەدووریی ئوستاد بەمەرگی ناکام
بەچۆلیی حوجرە و مەدرەسە و مەقام
بەقبووڵیی تۆ بۆ دوعای داماو
بەدوعای مەزلووم بەحەق لێ قەوماو
بەنەشەی شیفا لە بۆ نەخۆشان
بە یومنی وەفای بۆ حەق تێکۆشان
بەسرووەی ڕەحمەت کاتی بەربەیان
بەئەهلی ئەوراد لە زومرەی ئەعیان
بەسۆزی غەریب مەهجووری وەتەن
دوور لە سەیرانگا و سەراوی دڵبەن
نە یار، نە دڵدار، نە ئاشنای نەو
نە چرای ڕووناک بۆ تاریکەشەو
نە مەحرەمی راز، نە حاڵزانی حاڵ
نە ناز و نیاز ئەربابی کەماڵ
بەکزەی دەروون، بەئیخلاسی تام
لە دەرگای خودای حەیی لایەنام

بڕوانە بۆمـــان بەنیگای ئیـحـــســـان
ببـــووره لێـمـــان لە عــەیب و نوقـــســـان
دەرگـــای ڕەحـــمـــەتت بکەوە لێــمـــان
خـەڵاتی نـەسـرەت ببـەخـشـە پێـمـان
تـا بـژی (نـامـی) بـەڕووی دنـیــــــاوە
ئەنجـــامی خـــێــربێ دەم بەدوعـــاوە

سەرچاوەکان:


١- تەفسیری نامی بۆ قورئانی پیرۆز، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بەغدا، ١٩٨٤.

٢- نووری قورئان، نووسینی: مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس، بەغدا، ١٩٨٥.

٣- ئاوی حەیات، نووسینی: مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس، بەغدا ١٩٤٩.

٤- بنەماڵەی زانیاران – نووسینی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بەغدا، ١٩٨٤.


## مستەفا سەفوەت

١٣٢٤ - ١٣٨٣

مستەفا کوڕی حاجی مەلا ڕەسووڵ کە نازناوی سەفوەتە لە ساڵی ١٣٢٤ی کۆچی لە سلێمانیدا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و بۆ خوێندن گەلێ شوێن گەڕاوە و ماوەیەک لە لای شێخ عومەری قەرەداغی خەریکی خوێندنی ڕەوانبێژی و ڕێزمانی عەرەبیی بووە و ئەوسا چووەتە لای شێخ بابا عەلی و شەرعی ئیسلام و لێکدانەوەی قورئانی لە لای خوێندووە و لە پاشا ماوەیەک لە لای شێخ حەمەومین ماوتەوە و پیتۆڵی و شەرعی ئیسلامی لە لای خوێندووە و ودمی مەلایەتیی لێی وەرگرتووە و ئەوسا خەریکی وانە وتنەوە و ڕێنوێنیی خەڵک بووە تا سەرئەنجام لە ساڵی ١٣٨٣ی کۆچی لە تەمەنی پەنجا و نۆ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیواندا نێژراوە.

سەفوەت یەکێ لە هۆنەران و وێژەوانانی هەرەبەرزی کوردە و هۆنراوەکانی گەلێ تەڕ و پاراو و شیرین و هەندێ پەڕاویشی نووسیون کە گەلێ بایبدارن. یەکێ لە کارە گرنگەکانی ئەو وەرگێڕانی گوڵستانی سەعدییە بۆ سەر زمانی کوردی کەَ بەڕاستی گەلێ باییدارە و هونەری تێدا نواندووە و گرنگیی کارەکەی ئەوەیە کە هۆنراوەکانی هەر بەهۆنراو وەرگێڕاوە و دەقی وتەکانی سەعدیی کردوونەتە کوردی کە کەمتر کەسێک دەتوانێ ئەو کارە بکا، جگە لە دیوانەکەی چەند پەڕتووکی تری بەناوانی: ڕابەری حەج، ڕابەری نوێژ، هۆنراوەی کوردی

له دوڕی بوردی، شانۆی ناوماڵ له چاپ داوه که هەر کامێکی گەوهەرێکی بەنرخن له وێژەی کوردیدا.

مامۆستا سەفوەت له سەرەتای گوڵستانەکەی سەعدیدا سەبارەت بەخۆی دەڵێ: زۆرم هەوڵ دا هەتا دوو بەرگ فوتووحاتی یارانی پێغەمبەر «سەلامی خوای لێ بێ»م هۆنییەوه له نزیکەی چل و پێنج هەزار شێعردا، وه قەسیدەی بوردییەم شیعر بەشیعر وەرگێڕایه سەر شیعری کوردی و، چیرۆکی میعراجم هۆنییەوه و نامەیەکم هۆنییەوه له ڕەوشت و ژیانی پێغەمبەر و جێ نشینانیا، وه نامەیەک له ئەدەب و ئامۆژگارییدا بەناوی هەشت بەهەشت که شتێکی زۆر جوان و بەکەڵکه. هەندێ شتی تریشم پێکەوه نا هەر بەو هیوایه بۆم نەچووه سەر، نەشمئەتوانی بەجارێ وازیان لێ بێنم، ناچار دەستم ئاڵاندە داوێنی دوو پیاوی گەوره: یەکەم عەبدولقادری گەیلانی خوا له پیرۆزی ئەو بوزورگەواره بێ بەشمان نەفەرمووێت دیوانه فارسییەکەی له زووەوه له ناو پیاوه گەورەکانی ئاینا پایەیەکی بەرز و پیرۆزی هەیه و هەر غەزەلێکی بۆ گەیشتن بەئامانجی دەخوێنرێتەوه، هاتم کردم بەکوردی، شیعر بەشیعر وەرم گێڕا. دوای ئەوه ویستم بەهۆی گوڵستانی سەعدییەوه له باغی ئەنجومەنی ئەدیبان چەپکه گوڵێ بچنم، یا هیچ نەبێ بۆنی ئەو گوڵستانه بچێ بەلووتما، گیانی پێ تازه ببێتەوه، ئەو گوڵستانەی که هەر خۆی توانیویه ستایشی بکا که گوتوویەتی:

ڕۆژی گوڵ چەنده، پێنجه یاخۆ شەش
ئەم گوڵستانه هەر ئەمێنێ گەش

ئەمەش یەکێ له چیرۆکەکانی گوڵستان که وەری گێڕاوەته سەر کوردی و دەڵێ: مێوانی پیرێ بووم له دیاربەکر که ماڵێکی فراوانی هەبوو لەگەڵ کوڕێکی ڕەنگ و ڕوو جوان. شەوێک باسی بۆ کردم که له ژیانمدا هەر ئەم کوڕەم هەیه، درەختێ وا لەم دۆڵه دایه زیارەتگایه، خەڵکی دەچن بۆ زیارەتی، شەوانی درێژ له بنی ئەو درەختەدا ناڵاندوومه تا خوا ئەم کوڕەی پێ بەخشیم. گوێم لێ بوو ئەم کوڕه بەئەسپایی بەهاوڕێیەکانی وت ئەگەر ئەو درەختەم بزانیایه کامەیه دەچووم له بنیدا دەپاڕامەوه، خوا باوکم بکوژێ!. مامۆستا شادمانه که کوڕی عاقڵه، کوڕیش تانووت لێ دەدا کەوا باوکی پەرپووته.

ساڵەها ئەڕوات بۆت ڕێ ناکەوێ
گۆڕی باوکی خۆت بکەی زیارەت
تۆ بۆ باوکی خۆت چیت کردووه بەخێر
تا چاو ببڕیته خێری کوڕەکەت

سەرچاوەکان


١- گوڵستانی سەعدی - وەرگێڕاوی مستەفا سەفوەت - بەغدا، ١٩٦٩.

٢- رابەری حەج - نووسینی مستەفا سەفوەت - بەغدا، ١٩٧٣.

٣- رابەری نوێژ - نووسراوی مستەفا سەفوەت - بەغدا، ١٩٦١.


## عەلی سەیدۆ گۆرانی

١٣٩٢ - ١٣٢٧

عەلی سیدۆ گۆرانی کە باپیری لە گۆرانەکانی دیاربەکرە و باوکی لە ساڵی ١٣٩٨ی کۆچی لەگەڵ سەربازەکانی عوسمانیدا چووە عەممان، لە ساڵی ١٣٢٧ی کۆچی لە شاری عەمانی پێتەختی ئوردەندا لە دایک بووە و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی هەر لەو شارەدا تەواو کردووە و پاشان چووتە زانکۆی ئەمریکاییی بەیرووت و بڕوانامەی زانستی لە زمانی ئینگلیزیدا وەرگرتووە و، ئەوسا بووە مامۆستای زمانی ئینگلیزی لە قوتابخانەی ناوەندی و پاشان بووە کارگێڕی قوتابخانەیی ناوەندیی شارانی کەرەک و عەممان و سەلت و ئەربد و ئینجا کرایە سکرتێری کاروباری ناوخۆ و ئەوسا بووە کاربەدەستی شالیاری هەندەران و چەندین ساڵ لە باڵیۆزخانەکانی عەرەبستان و یەمەن و سووریە و تورکیەدا بووە باڵیۆز و لە پاشا بووە وەزیری موختار و لە دواییدا خانەنشین کرا و سەرئەنجام لە ساڵی ١٣٩٢ی کۆچیدا لە عەممان کۆچی دوایی کرد.

عەلی سەیدۆ یەکێ لە مێژوونووسان و نووسەرانی هەرەبەرزی کوردە و لە تەمەنی بیست و حەوت ساڵیدا دەستی کردووەتە فێربوونی زمانی کوردی و بۆ ئەوەش پەنای بردووەتە بەر داپیری و لەوەوە فێری کوردی بووە و پاشان دەستی کردووەتە خوێندنەوەی گۆڤاری هاوار و رووناهی و ئەوسا گەلێ پەڕاوی سەبارەت بەمێژوو و، وێژەی کوردی نووسیون کە بریتین لە: لوڕ و لوڕستان، زەردەشت و زەردەشتایەتی، فەرهەنگی عەرەبی بەکوردی، زمان و ئەدەبی کوردی، لە خەلیجەوە بۆ ئارارات، لە عەممانەوە تا عەممادییە کە زۆربەیان لە چاپ دراون. ئەمەش پارچە پەخشانێکی ئەم نووسەرە بەناوی زەردەشت و زەردەشتایەتی کە لە عەرەبییەوە وەرمانگێڕایە سەر زمانی کوردی، وەکو دەڵێ:

«زەردەشت پێغەمبەرێکی کوردە و ئاینەکەی لە وڵاتی ماد و پارسدا پەرەی سەندووە و پێڕەوانی ئەو لە قورئاندا بەناوی مەجووس ناسراون. وشەی مەجووس لە مەگووسیان پەهلەوی و مگاڤی ئاڤێستاییەوەیە کە بەر لە زەردەشت بەپیاوە ئاینییەکانیان دەوت. گەلێ لە بیروبڕوای مەجووسەکان وەکو پیرۆزیی ئاور و ئاو و با و خاک کەوتە ناو ئاینی

زەردەشتەوە و مەجووسەکان خەریکی جادووگەری بوون و ئەم وشە کەوتە ناو زمانی وێنانەوە و پاشان لە زمانە ئەوروپاییەکاندا باو بوو. زەردەشت لە شاری شیز کە کەوتووەتە ئاوربایگانەوە لە دایک بووە و مێژووی لەدایکبوونی ئەو ڕوون نییە و وەکو دەڵێن لە ساڵی ٥٨٩ی بەر لە زایندا سەری هەڵداوە و لە سی ساڵیدا چووە سەر کێوێک لە خوا پاڕایەوە و پاشان کە بووە پێغەمبەر گەلێ کەس بڕوایان پێ هێنا و ئەوسا ئاینەکەی لە سەرتاسەری ئێران پەرەی سەند و ناوی کتێبەکەی ئاڤێستایە و کۆنترین بەشی ئاڤێستا، گاتاکانە کە بەهۆنراو هۆنراوەتەوە و دەڵێن هی زەردەشتە».

عەلی سەیدۆ لە ئاخروئۆخری تەمەنیدا بەکوردستاندا گەڕاوە، بۆ ئەوەی کوردستان لە نزیکەوە ببینێ و لە بارەیەوە بکۆڵێتەوە، وە خۆی باسی مەبەستی گەشتەکەی دەکات و دەڵێ: گەلێک هۆ پاڵیان پێوە نام ئەم گەشتە بکەم و بینووسمەوە: دڵنیا بوو لەو ڕاستییانەی لە ناو نووسراوەکانی ئینگلیز و ئەمەریکاییە خۆرئاواییەکاندا دەربارەی کورد و وڵاتیان خوێندبوومنەوە و پڕکردنەوەی کەلێنێک لە مێژووی ئیسلام و جوغرافیای خۆرهەڵاتی نزیک و کێشانی وێنەیەکی دروستی کوردان بۆ ئەو هاوسێیانەیان کە تا وەکو ئێستەش بێ ئاگان لە زۆر شتیان.

سەرچاوەکان
١- مێژوو، نووسینی - د. کەمال مەزهەر - بەغدا، ١٩٨٣.
٢- من عمان الي العمادية - تاليف علي سيدو كوراني - قاهرة، ١٩٣٥.
٣- اللر ولرستان - بقلم علي سيدو كوراني - مجلة مجمع العلمي الكردي المجلد الثالث، ١٩٧٤.
٤- زرادشت والزرادشتية - تاليف علي سيدو كوراني - مجلة مجمع العلمي الكردي المجلد الثالث، ١٩٧٥.

## دوکتۆر قەناتی کوردۆ

١٣٢٩ - ١٤٠٦

قەناتی کوردۆ لە ساڵی ١٣٢٩ی کۆچیدا لە تفلیس لە دایک بووە و دەوری سەرەتایی و ناوەندیی هەر لەوێدا تەواو کردووە و پاشان چووەتە زانکۆی لینگراد و لە ڕشتەی وێژە و زمانی کوردیدا دوکتۆرای وەرگرتووە و ئەوسا هەر لەوێدا خەریکی وانە وتنەوە بووە و سەرئەنجام لە ساڵی ١٤٠٦ی کۆچی لە تەمەنی حەفتا و حەوت ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

پرۆفیسۆر کوردۆ یەکێ لە وێژەوانان و نووسەرانی هەرە بەرزی کوردە و لە ماوەی

تەمەنیدا گەلێ نووسراو و پەڕتووکی نووسیون کە هەندێکیان بریتین لە: نێر و مێ لە زمانی کوردیدا، یاسای نووسین لە زمانی کوردیدا، ڕەخنە لە ڕێزمانی زمانی کوردی، لە بارەی پێشکەوتنی زمانی کوردییەوە، چەند بەرهەمێکی فۆلکلۆری کوردی، ڕەخنە لە بیروباوەڕی هەڵە بەرامبەر زمانی کوردی، ڕێنووسی زمانی کوردی، وشە ژمارەییەکان لە زمانی کوردیدا، ڕێزمانی کوردی، زمانی کورد، دروستبوونی وشە لە زمانی کوردیدا، مانا و فەرمانی پاشگر، فەرهەنگی کوردی بەڕووسی، ئەحمەدی خانی و بەرهەمی وێژەیی، مێژووی نووسین و لە چاپدانی فەرهەنگە کوردییەکان، پەندی پێشینانی کوردی، قەڵای دمدم، مەمی ئایشی، پێشگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا، کوردناسی، شوێنی وشەی پێوەندی لە زمانی کوردیدا، نووسراوە ئاینییەکانی کوردە ئێزیدییەکان، دەربارەی مێژووی لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی، گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی، مێژووی زازا.

کوردۆ لە مەیدانی مێژوونووسیی کوردیشدا هەنگاوی بەرزی هەڵگرتووە و ئەو کەسانەی کە لە بارەی کوردەوە بەهەڵەدا چوون وتارەکانیانی بەرپەرچ داوەتەوە، بەتایبەت لە وتاری شێواندنی مێژووی کورد لە مێژوونووسیدا زۆر بەتوندی وەڵامی ڕەشید یاسەمیی داوەتەوە کە ویستوویەتی کورد بکاتە فارس، هەروەها کوردۆ بەرپەرچی ڕای ژمارەیەک لە کوردناسانی سۆڤیەتی سەبارەت نەژادی کورد داوەتەوە. ئەمەش پارچە پەخشانێکی کوردۆ کە دەربارەی کاردۆخەکانەوە نووسیویە، وەکو دەڵێ:

لە نووسراوەکەی ئەنابازیسی گەزنەفۆندا دەربارەی کاردۆخەکان کە وڵاتەکەیان لە باشوورەوە هەر لە دەریاچەی وان و ناوچە شاخاوییەکانی هەکارییەوە تا باکووری ڕووباری دیجلە لە خۆرئاوادا کشا بوو گەلێک بەڵگەی بەکەڵک هەیە.

لەسەر ئەو باوەڕەی کە خاکی کوردستانی ئێستا هەر ئەو خاکەیە کە لە کاتی خۆیدا کاردۆخەکانی تێدا ژیاون، لە ڕێگای لێکچوونی خوو و ڕەوشت و شێوەی ژیانی کورد و کاردۆخ، بەهۆی یەک مانایی وشەی (کاردۆخ، کوردیک، کۆرد، کورد) و پەیوەندیی ئەتنۆگرافی لە نێوانیاندا، زۆر لە زانایان هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی، کەوا کاردۆخەکان یەکێک بوون لە نەتەوەکانی خێزانی زمانە ئێرانییەکان و هەروەها ئەم نەتەوەی کوردەی کە ئێستا بەیەکێک لە پەلی خۆرئاوای زمانە ئێرانییەکان دەدوێ، نەوەی ڕاستەوخۆی کاردۆخەکانن، ئەم ڕاستییەش بەئاشکرا ڕوون کراوەتەوە و لە لایەن زانا کوردەکان و فارس و ئەورووپاییەکانەوە چەسپێنراوە، هەندێک لە زانایان لەو بڕوایەدان کە گوایە کاردۆخەکان لە ڕووی زمانەوە نەتەوەیەکی ئێرانی نەبوون، بەڵکو زمانیان زمانێکی ناوچەییە و پەیوەندیی بەزمانە ئێرانییەکانەوە نییە. ئەم باوەڕە بۆ یەکەم جار ن، ی، مار

بڵاوی کردەوە. ن. ی، مار لە نووسراوەکەی دیسان دەربارەی وشەی چەلەبیدا هەوڵی داوە، بیچەسپێنێ کە نەژادی کورد یافیتییە و بەو بۆنەیەوە باسی دەورەکانی پێشکەوتنی زمانی کوردیی کردووە.

بەم جۆرە لە ڕێگای بەڵگەکانی گەزنەفۆنەوە دەربارەی گفتوگۆی یۆنانەکان لەگەڵ کاردۆخەکاندا، هەروەها لە ڕێگای لێکدانەوەی مانا و دروستبوونی وشەی کاردۆک و کاردۆخدا، دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامە کە بڵێین کاردۆخەکان لە خێزانی زمانە ئێرانییەکانن.

بەڵگەی گرنگی باوەڕپێکراو و چەسپێنەری مێژوویی و زمانی دەربارەی پەیوەندیی کاردۆخەکانی کۆن و کوردەکانی ئێستا، ئەو پێشکەوتن و ئەنجامەیە کە کوردناسەکانمان و زماننناسەکانمان گەیشتووینەتێ، لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی و دیالێکتەکانیدا، گەلێک بەڵگەی ڕێزمانی «گراماتیکی»ی وشەکانی زمانیان دۆزیوەتەوە، کە لەو ڕێگایەوە توانیویانە ئەو ڕاستییە بچەسپێنن و بەتەواوی نیشانی بدەن، ئەو بەڵگانە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی زمانی کوردیی ئێستا لەگەڵ زمانی ئێرانییەکانی کۆن نیشان دەدەن.

سەرچاوەکان

١- هەندێک بیر و هەڵە لە بارەی زمان و مێژووی کوردەوە - نووسینی قەناتی کوردۆ - بەغدا، ١٩٧٣.

٢- فەرهەنگی کوردی- ڕووسی - نووسراوی د. قەناتی کوردۆ - لینینگراد، ١٩٧٠.

## مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی

### ١٣٣١ - ١٤٢٢ی کۆچی

مەلا جەمیل کوڕی مەلا ئەحمەدی ڕۆژبەیانی لە ساڵی ١٣٣١ی کۆچی لە دێی فورقانی سەر بەکەرکووکدا لە دایک بووە. هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و ئەوسا لە لای مەلا سەی عەبدولوەهابدا ڕێزمانی عەرەبی و وێژەی فارسیی خوێندووە و پاشان لە لای باوکی شەرعی ئیسلام و ڕەوانبێژیی خوێندووە و لە پاشا چووەتە هەولێر و لە لای مەلا عەبدوڵلا پیتۆڵی خوێندووە و لەوێوە گەڕاوەتەوە کەرکووک و ماوەیەک لە لای مەلا ڕەزای واعیز، فیقهی خوێندووە و هەر لە ئەو ودمی مەلایەتیی وەرگرتووە و لەوێدا ماوەتەوە و خەریکی وانە وتنەوە بووە و پاشان لەسەر کوردایەتی گیراوە و چەند ساڵێک لە بەندا بووە و لە پاش بەربوونی چووەتە گوندی قەتارە و لەوێدا خەریکی وانە وتنەوە و ڕێنوێنیی خەڵک بووە و ئەوسا چەند وتارێکی دژی دەوڵەتی پاشایی لە گۆڤارەکان بەچاپ گەیاندووە و

لەبەرئەوە گیراوە و لە پاش ئازادبوونی ڕای کردووەتە ئێران و چووەتە تاران و لە ئێزگەی کوردیدا دەستبەکار بووە و لە پاش چەند ساڵێک گەڕاوەتەوە بەغدا و لە کاری دەوڵەتیدا دامەزراوە و لە پاش چەند ساڵێک خانەنشین کراوە و لە پاشان لە ساڵی ١٤٢٢ی کۆچی لە لایەن دەزگای هەواڵگری حکوومەتی بەعس لە ناو ماڵەکەی خۆی لە بەغدا شەهید کرا.

مەلا جەمیل بەیەکێ لە مێژووزانان و زانایانی هەرەبەرزی کورد دێتە ژمار و لە ماوەی تەمەنیدا گەلێ پەڕاو و نامیلکەی نووسیون و گەلێ وتاری لە ڕادیۆدا بەناوی کورد و وڵاتەکەت بناسە بڵاو کردوونەوە و شەرەفنامەی میر شەرەفخانی بتلیسی و مێژووی سلێمانیی ئەمین زەکی بەگ و یادداشتەکانی ڕەفیق حیلمیی وەرگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی و هەندێ پەڕاویشی بەکوردی و عەرەبی و فارسی نووسیون کە لە ناو ئەوانەدا دەتوانین لە: مێژووی فەرمانڕەوایانی موکریان و مەلای مەزبوورە و مەندەلی و شوانکارە و حەلوان دونبولی ناو ببەین و گەلێ نووسراوی تریشی هەن کە هێشتا چاپ نەکراون.

مەلا جەمیل لە نووسینی پەخشان و وشە دارشتندا بێ هاوتابوو و ئەو شارەزایی لە زمانەکانی فارسی و تورکی و عەرەبی هەبوو و مێژووزانێک و نووسەرێکی خاوەن بەهرەبوو بەتایبەت لە مێژووی کورد و کوردستاندا زۆر شارەزابوو. ئەمەش پارچە پەخشانێک لەم زانا هەرە بەرزە کە لە پەڕاوی فەرمانڕەوایانی موکریان هەڵمان بژارد وەکو دەڵێ:

«ئەو هەرێمەی کە ئەمڕۆ گەلی کورد پێی دەڵێن: موکریان لە هەزاران ساڵ بەر لە هاتنە دنیای عیساوە تا ئەمڕۆ هەر ئاوەدان بووە لەم ساڵانەی دواییەدا دێرینە و شوێنەوارناسان کە بەدوای دێرینە و شوێنەواری کۆندا وێڵن: لە هەرێمی سەڵماسدا کۆنە شارێکی چەند نهۆم و چین لەسەر چینان لە ژێر خاکا دەرهێناوە، ئەم شارە بەهۆی بوومەلەرزە و کارەساتی ترەوە چەند جارێ ڕووخاوە و دووبارە دامەزرێنراوەتەوە و چینی تازە لەسەر شوێنەواری کۆن دروست کراوەتەوە، بەم جۆرە بووەتە چەند نهۆم. هەندێ لەو چین و نهۆمانە بەهی دەورانی ئاسن و مس دراونەتە قەڵەم، جگە لەوانەش، شوێنەواری شاری زێویەی لای سەقزیش بەڵگە و گەواهە لەسەر ئەوەی کە لە موکریاندا هەزاران ساڵ بەر لە هاتنە دنیای عیسا فەرهەنگ و شارستانیەتی هەبووە و بەڵگەیێ کە لەم بارەوە بەدەست مێژوونووسانەوە هەبێ کە بیکەن بەپاڵپشت بۆ باوەڕی خۆیان، ساڵنامەکانی ئاشوورییە و کتێبی تەوراتی پیرۆزیش زۆر شتی تیایە.

نووسەری سۆڤێتی دیاکۆنۆف لە مێژووی مادا نووسیویە: ئەوەی ڕاست بێ، تا ئێستە بەتەواوی نەزانراوە کەی مرۆڤ پێی خستووەتە سەر خاکی ماد؟ کە موکریان پارچەیەکە لەو خاکە و لە کەیەوە تیا نیشتەجێ بوون؟ بەڵام زانستی مرۆڤ تا ئەو جێیە بڕی کردووە

که بزانێ ئادەمیزاد لە دەورانی کۆنی بەردەوە کە پێی دەوترێ پالیئولیت لەم هەرێمەدا هەن و ژیاون و لە سەردەمی ئێمەشدا، دێرینەناسەکان لە سایەی هەڵکۆڵین و هەڵدڕینی شوێنەوارەکانەوە زۆر دێرینەیان بەدەست هێناوە کە بەهی سەردەمەکانی ئاشیل و مۆستی و ئورینیاک ناسراون. بەڵام ئەو زانستانەی کە دەربارەی دانیشتووانی خاکی مادی سەردەمی کۆنی بەرد، بەدەس هێنراون تا ئێستە زۆر کەمن، مێژوونووس ناتوانێ سوودی تەواویان لێ وەرگرێ».

سەرچاوەکان

١- فەرمانڕەوایانی موکریان - نووسینی جەمیل ڕۆژبەیانی - بەغدا، ١٩٩٢.

٢- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەمەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی.

## ئەنوەر مایی

١٣٣٣ - ١٣٨٢

ئەنوەر، کوڕی شێخ محەمەدی ئاڵەکی لە ساڵی ١٣٣٣ی کۆچی لە دێی مایی سەر بەئامێدیدا لە دایک بووە. هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و پاشان چووەتە بامەڕنی و دهۆک و زاخۆ و ئامێدی و هەولێر و لەو مەڵبەندانەدا لە لای زانایان خەریکی خوێندنی شەرعی ئیسلام و وێژە و ڕەوانبێژی بووە و ئەوسا ودمی مەلایەتیی وەرگرتووە و پاشان بووەتە مامۆستا و نزیکەی سێ ساڵ وانەی وتووە و ئەوسا دەستی لێ هەڵگرتووە و لە پاشا خەریکی ڕێنوێنیی خەڵک بووە و سەرئەنجام لە ساڵی ١٣٨٢ی کۆچیدا گیانی بەگیان ئافەرین ئەسپاردووە.

ئەنوەر مایی یەکێ لە وێژەوانان و نووسەرانی هەرە بەرزی کوردە و لە هۆنینەوەی هۆنراویشدا دەستێکی باڵای هەبووە و نازناوی لاوی چیای بۆ خۆی هەڵبژاردووە و گەلێ لە هۆنراوەکانی لە گۆڤاری گەلاوێژ و هاوار و ڕووناهی و (دەنگی گێتی تازە)دا بڵاو بوونەتەوە، وە گەلێ پەڕاویشی وەرگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی وەکو: مەسحەفارەش و جلوە کە هێشتا چاپ نەکراون. گرنگترین نووسراوی ئەو لە مێژوودا کوردی بادینانە کە بەزمانی عەرەبی نووسیویەتی و هەندێ نووسراویشی بەکوردی نووسیوە کە هێشتا چاپ نەکراون و ئەوەش ئەمانەن: لەیلا کاسپی، گەرامێرا کوردی، جوگرافی و دیرۆکا برواری، دیاریدا لاوا، ئێزدی و ئەولی وان، مەتەلۆکێت کوردی.

ئەنوەر مایی گەلێ بایەخی داوەتە مێژووی کورد و کوردستان و گەورەترین بەرهەمی مێژوویی ئەو پەڕاوی کوردی بادینانە، هەروەها نووسراوێ تریشی هەیە بەناوی کوردەکانی

چین کە لە گەشتەکەیدا بۆ چین ئەو نووسراوەی نووسی بوو، وە لەو نووسراوانەیدا بەکورتی باسی مێژووی کۆن و نوێی کوردی کردووە و کەڵکێکی زۆری لە نووسراوەکانی بتلیسی و ئەمین زەکی و حوسێن حوزنی وەرگرتووە و هەروەها لەو نووسراوەی باسی هۆنەرێکی کورد دەکا بەناوی بۆرابۆز کە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر ژیاوە و بەزاراوەی کرمانجی هۆنراوی هۆنیوەتەوە و گوایە ئەو باسەی لە یادداشتەکانی دوکتۆر بلەچ شێرکۆ وەرگرتووە کەچی دوکتۆر بلەچ جگە لە پەڕاوی کێشەی کورد، یادداشتێکی نییە و ئەگەریش یادداشتێکی بووبێ تا ئێستا لە چاپ نەدراوە تا ئەوەمان بۆ ڕوون بێتەوە.

سەرچاوەکان
١- مێژوو - نووسینی دوکتۆر کەمال مەزهەر - بەغدا، ١٩٨٣.
٢- الاكراد فی بهدینان - تالیف انور المائی - بغداد، ١٩٦٩.

## حەسەنی قزڵجی

١٣٣٣ - ١٤٠٤

حەسەنی قزڵجی لە ساڵی ١٣٣٣ی کۆچی لە شاری بۆکان هاتووەتە جیهانەوە و هەر لە منداڵییەوە لە لای زانایانی ئاینی، خەریکی خوێندن بووە و لە تافی جوانیدا ماوەیەک لە لای مامۆستا مەلا ئەحمەدی فەوزی و سەیفی قازی و شێخ ئەحمەد سرێلاّئاوا، خەریکی خوێندنی زمان و وێژەی کوردی بووە و هەر لەو دەمەوە خەریکی بووژانەوەی وێژەی کوردی بووە و لە سەردەمی پێشەوا قازی محەمەد (١٣١٠-١٣٥٦ی کۆچی)دا دەستی کردە نووسینی وتار و ئەوسا بووە بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی کوردستان و گۆڤاری هەلاّڵە و گەلێ چیرۆک و وتاری بەچاپ گەیاندن و پاشان ئاوارە و دەربەدەر بوو و، ماوەیەک لە کوردستانی عێراقدا مایەوە و ئەوسا بەرەو ئەورووپا کەوتە ڕێ و لە پاش سەرکەوتنی گەلی ئێران بەسەر ڕژێمی کۆنەپەرستی شادا گەڕایەوە ولاّت و سەرئەنجام لە ساڵی ١٤٠٤ی کۆچی لە حەفتا و یەک ساڵیدا لە تاران کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی برایەوە بۆکان و لەوێدا نێژرا.

حەسەنی قزڵجی لە ئاسمانی وێژەی کوردیدا هەتا هەتایە دەدرەوشێتەوە و پاڵەوانی چیرۆکەکانی ئەو هەمووی لە چینی کۆمەڵی چەوساوەی کوردەواری هەڵبژێرراون و بەسەرهاتی ئەوانی بەکوردییەکی پەتی نووسیوە تا هەموو لێی تێ بگەن، چونکە ئەو کۆمەڵەکەی لە هەموو کەس چاکتر دەناسی، وە لە چیرۆکەکانیدا ژیانی وەرزێر و جووتیار و دەرەبەگی بەتەواوی بۆمان دەرخستووە و پیشانی داوە کە چۆن دەرەبەگەکان و

کاربەدەستانی ڕژێمی شاهەنشایی وەرزێر و جووتیاریان چەوساندووەتەوە و لە هەموو شتێ ئەوانیان بێ بەش و بێ بەری کردوون بۆ ئەوەی خۆیان لە تێروتەسەلیدا ژیان بەرنە سەر و پێمانی پیشان داوە کە چۆن پاسگاکانی کوردستان بەکرێ دراوەتە ئەمنییەکان بۆ ئەستاندنی بەرتیل و سازکردنی پەلپ و بیانوو لە جووتیاران و وەرزێرانی هەژار.

زۆربەی چیرۆکەکانی حەسەنی قزڵجی سەبارەت بەچەوسانەوەی جووتیاران و وەرزێرانن بەهۆی دەرەبەگەکان کە ئەوان بەئارەقی نێوچاوان شەو و ڕۆژ خەریکی چاندن و کێڵانی زەویوزارن کەچی ڕژێمی کۆنەپەرستی شاهەنشایی ئەوانی ڕۆژ بەڕۆژ پتر دەچەوساندەوە و ستەمی لێیان دەکرد و لەولاشەوە دەرەبەگ جووتیارانی دەخستە ژێر بێگاری و کاریانی پێ دەکرد، بەبێ ئەوەی ڕێزێکیان بۆ دانێ و زۆربەی چیرۆکەکانی ئەو هەر لەسەر ژیانی پڕ لە ژانی جووتیاران و وەرزێرانە و هەندێکیشی لەسەر چیرۆکی فۆلکلۆری داڕێژراوە و تا ئێستا دوو کتێبی ئەو بەناوی ئاشتیخوازی لادێ و پێکەنینی گەدا لە چاپ دراون و گەلێ چیرۆکیشی لە گۆڤارەکاندا بڵاو بووەتەوە.

ئەم نووسەرەمان لە چیرۆکی (شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی ناوێ) کە لە گۆڤاری هیوا چاپی کردووە لە قاتوقڕی و نەداری و ئاوارەیی و دەربەدەری ئەو جووتیارانە دەدوێ کە باڵی شوومی کێشابووە سەر ناوچەی هەورامانی ژاوەرۆدا، بەجۆرێ کە وەرزێران و جووتیاران لە دەستهاتی خۆیان بەهرەیان نەدەبرد و لە ژێر زەبروزەنگی دەرەبەگدا دەچەوسانەوە، بەجۆرێ کە هەیاسی وەرزێر لەبەر برسییەتی و هەژاری خێزانەکەی بەجێ دێڵێ و ڕوو دەکاتە مەڵبەندێکی تری نیشتمانەکەی بۆ ئەوەی بتوانێ پاروویەک نان بۆ خۆی و منداڵەکانی بەدەست بێنێ، بەڵام لەوێشدا نەهاتی ڕووی تێ دەکات و خەڵک ئەو بەنامۆ دەدەنە قەڵەم و ناچار لەوێش سەر بۆ شوێنێکی تر هەڵدەگرێ تا لەو شوێنەدا بەنائومێدی بۆ هەمیشە سەر دەنێتەوە و مجێوری مزگەوتێک کە چاوی دەکەوێتە کەلاکەکەی بۆ ناشتنی دەکەوێتە ناو کۆڵان و بازاڕ تا برێ پووڵ و پارەی بۆ کۆکاتەوە کەچی دەوڵەمەندەکان پووڵی پێ نادەن و ئەویش ناچار بڕیار دەدا کە جلوبەرگەکەی خۆی بۆ بکاتە کفن و بینێژێ و بڵێ: (شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی بۆ ناوێ). ئەمەش دەقی چیرۆکەکە کە دەڵێ:

«ساڵێک لە ساڵان دێوی قاتوقڕی و گرانی، باڵی ڕەشی بەسەر ناوچەی (ژاوەرۆ)دا کێشا، ڕەهێڵەی پەرێشانی و پەشێوی و شپرزەیی دای کرد. وەرزێر لە کشتوکاڵی بەهاری و لە ڕەپستە و ئاوەنیای پایزە، مافنگی و ڕەنجەڕۆ مایەوە، هەژار و نەدار و کز و کەنەفت کەوت و ژیانی تاڵ و ئاڵۆز بوو. سەرەڕای ئەمانەش ئەوەندەیان بردبووە گەل و هەرەوەز وەک قسەقوتان دەڵێن «لە چوارپەلا گوێچکەی ساغ بوو». زگی برسی و پشتی بریندار و شان و

شەپیلکی تێکشکابوو. کۆڵ کێشانی زۆر و زەوەند هێز و توانای پێ نەهێشتبوو، برسییایەتی و بێ بژێوی ڕست و دەرەتانی لێ بڕیبوو.

وەرزێر ئەوەندەی سەرنجی دا و بیری کردەوە و سەری هێنا و برد، نەیتوانی ڕێگای ڕزگاری و چاری چارەڕەشیی خۆی بەدی بکا. لە لایەکەوە بێگار مەودای نەدەدا بەرژەوەندێک لە حاڵی خۆی بگات و، لە لایەکی تریشەوە ناشارەزایی و نەزانی ڕۆژی ڕووناکی لێ کردبووە شەوەزەنگ.

بێ بارانی و وشکە ساڵ و خەلە گران بوو. بێ کاری بوو. ئیش لە حاند ڕەنجبەر و ئیشکەران چووبووە پشتی شێران. ئەوەی لەو ناوەدا فرە و فراوان و کەم نرخ و هەرزان بوو، تەنیا تەرم و جەندەکی هەژاران و فڕین و پەڕەوازە و ئاوەکی بوونی گیانی وەرزێران بوو. ئاژاوە و پەشێوی بوو لە ناو لەشاندا. گیانی سەر بەهەش توانای مانەوەی ناو جەندەکانیان نەما بوو، ناچار هەڵوەدا دەبوون و ڕایان دەکرد بەئاسمانا.

هەباسی وەرزێر پێش گیان لێ تۆران چشی کرد لە خاووخێزان و سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت. بەدارە دارە و لارە لارەوە ڕێگای گرتەبەر، بەڵکو لە جێگایەک چارەسەری خۆی بکا. بەچنگە کڕکە و پەلەکوتە و لنگەلەرزە بەچەند کەژ و کێو و چیا و هەوراز هەڵگەڕا و لە چەند شیو و دۆڵ و نشێوەوە داگەڕا و، لە چەند چەم و ڕووبار پەڕییەوە تا ئاخری بەهەر مەینەتێک بوو خۆی گەیاندە شارێک لە شارە نزیکەکانی گەرمێن.

کە لە شار نزیک بووە شنەی هیوایەک دای لە دڵی زاماری، بەخەیاڵی خۆی لای وابوو، ئیتر ئاوەدانییە و جێگای ئینسانەتی و پیاوەتی و شارستانیەتە. زگی تێر و لەشی تیمار دەکات و کە تۆزێ بووژایەوە دەس دەداتە کاروبارێک، خۆشی دەژیێنێ و، پارەش بۆ خاووخێزانی دەنێرێ و لە چنگ برسییایەتی و مردن دەریان دەهێنێ. جا بەشێنەیی ئەوانیش دێنێ و لێی دادەنیشێ. هەریەکە خەریکی ئیشوکارێک دەبن و لە شارستانی پڕ خێروبێر و لە وڵاتی تێروتەسەلدا ئاسوودە و دڵنیا دەحەسێنەوە و جارێکی تر بەبیریش ناگەڕێتەوە. وەرزێری ساویلکە و دڵپاک هەروا زوو ژینی خۆی و خێزانی لەو شارەدا سووک و ئاسان بەخەیاڵ پێکهێنا و بزەی هومێد و هیوا دەیگرت و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: نەمدەزانی کوردستان ئاوایە، جێگای بەپیت و بەرەکەتی وەک ئێرەی تێدایە، نامەخوا ئەم خەڵک و مەردمە چەن تێروپڕن، چەن پۆشتە و پەرداخ و بەهێز و گوڕن، چەن کۆک و بۆشناخن، چەن ڕەنگ و ڕوو سوور و خەریک و دەس بەکارن. ئەگەر کوردستان وا ئاوەدانە، ئەی بۆ لای ئێمە ئەوەندە کووڕ و کڕێن و خاپوور و وێرانە؟ ئەبوو کە قاتوقڕی و نەهاتی ڕووی کردە لایەک، لایەکەی تر درێغیی لێ نەکات و یارمەتی بدات! دیسان هەر

باشە دێین لێرە دەژین تا لە سیاساڵ و نەهاتی ڕزگار دەبین. خوا دەروویەکی باشی لێ کردمەوە. بەهۆی مەینەت و دەردەوە گەیاندمیە ئێرە. پیر و پێشینان گوتوویانە: خوا کە بەلێزانی دەرگایەک داخات، بەمیهرەبانی کەلێنێکی تر دەکاتەوە. ئیتر شان و قۆڵم لە بێگار ئاسوودە دەبێت و، مردووی گۆڕ و گۆڕستانیشم لە خۆسەند و جمێن و جنێو دەحەسێنەوە.

وەرزێر گەشایەوە و زۆری پێ خۆش بوو کە ڕزگاری بووە و، جەندرمە و خان و بەگ و بێگاری لە کۆڵ کەوتووە. بەدڵێکی پڕ لە ئاوات و هیواوە ڕووی کردە ناو شار و هێندێ گەڕا بەجادە و بازاڕا شەرمی کرد داوای هیچ لە هیچ کەس بکات و لە ڕووی نەهات لە کووچە و کۆڵانان هەوڵی دوو سێ نان بدات.

بەزگی برسی و لەشی ماندوو و شەکەتەوە، ڕۆیشت و ڕووی کردە مزگەوت، بەڵکو لەوێ دڵ نەرمێ، دینداری، خاوەن ئیمانێ، بەچەن فلسێ یا بەیەک دوو نانێ دەسگرۆیی بکات، تا شەو بحەسێتەوە و بەیانی خۆی گورج کا بۆ ئیشوکارێک. تەنیا ڕۆژێکی دژوارە، کە یەک دوو ژەم تێر بوو ئیتر وردە وردە ئیش دەکات و پارەی دەس دەکەوێت و دەبووژێتەوە و دێتەوە دۆخی جاران (چ بکا؟ بڵێ چی؟ کار بۆ ڕەنجبەران حەسانەوەیە. پیشەی کرێکار ڕەنج و چەوسانەوەیە. کار کالایەکە بەبەژن و بالای کرێکار و وەرزێران براوە. ئەو ڕۆژەی بێ کار ئەبن خۆشی و جەژنیانە).

چوو لە هەیوانی مزگەوت دانیشت و بەچاوەنواڕیی ڕێکەوت کزکەی کرد. زۆری نەخایاند کابرایەکی چڵکنەی چاو مزمۆر لە دەرگای مزگەوتەکە هاتە دەرەوە، ئەم نەگبەت و چارەڕەشە هاتە بەرەوە. چڵکن بەتێخوڕینەوە گوتی: کابرا خەڵکی کوێی؟

وەرزێر بەخاووخلیچک و بێ هێزییەوە وەلامی دایەوە: ژا... وە... ڕۆ.

چڵکن گوتی: خێراکە هەستە بڕۆ.

وەرزێر گوتی: هیچ ئەرکێکم لەسەر تۆ نییە، بۆچی دەرم دەکەی؟ ئێرە مزگەوتە، خانەی خوایە، جێگەی ئاوارە و هەژار و داماوانە. لە خوا ناترسی وا تێم دەخوڕی و ئەگوڕێنی بەسەرما و لەم خانەی خوایە وا بەسووکییەوە دەرم دەنێی؟ تۆش هەر وەکو من مافت پێوەیەتی. ئیتر بۆچی وازم لێ نایەنی تۆزێ بحەسێمەوە؟

چڵکن گوتی: با مجێوریش بم، پێم ناخۆش نییە و لێم لە چاو نایە کابرایەکی چارەڕەشی وەکو تۆ لێرە بێت. بەلام لەبەر خوا ئەمەت پێ دەڵێم، کەچی دیارە ناشارەزای و نازانی. قوڕ بەسەر، بتبینن دەڵێن بێگانەی و دەتگرن. جا ئیتر ئارەزووی خۆتە.

وەرزێر گوتی: بۆچی من و تۆ هەردووکمان کورد نین؟ هەردووکمان وەک یەک هاوڕەگەز و خوێن نین؟ ئێرەش هەر کوردستان نییە؟ من و ئەم خەڵکەی لە ئەم شارەدان گشتمان کورد

نین و لە کوردستان نین؟ ئیتر بۆچی دەمگرن؟ ئەم من و تۆیی و دووبەرەکییە چییە و، ئەم جیاوازی و قینەبەرییە شوورەیی نییە؟ خۆ من نەهاتووم بەشی کەس بخۆم و ببمە بار بەسەر کەسەوە. دەمەوێ لێرە بحاوێمەوە و بەرەنجی شان و کرێی دەستی خۆم بژیم. ئیتر سووچ و تاوانم چییە. لەسەر چی دەمگرن؟

چڵکن گوتی: تێ دەگەم و ئەمانەم وەک ڕۆژ بەلاوە ڕۆشن و ڕوونە. بەڵام کێ ئەم چەندوچوونەت لێ دەبیسێ؟ بێ سوودە، ڕاکە، دەتگرن و ماوەیەک دەتخەنە زیندان و لە پاشان بەڕێت دەکەنەوە بۆ وڵاتی خۆتان.

وەرزێر کە ئەمەی بیست جەرگ و هەناوی داکەوت و حەوش و حەساری مزگەوتی لێ بوو بەکونە مشک. جنێو و لێدان و برسیەتی و بێگاریی بیر کەوتەوە و زامی جێگە کوڵ و داری زۆرداری کولایەوە. ئاخێکی هەڵکێشا و چاوێکی بەئاسمانا خشاند، چ ڕوانین و چاو پیا خشاندنێک! بەقەدرایی سەد کتێب پڕ بوو لە گلەیی و بناشت. بەدوو سێ تەکان هەستا و لەشی لە قاچی بار کرد. لاقی لەرزی و دەتگوت دەڵێ: ئیتر بەسە، هێزم تێدا نەماوە، سواوم، دار و بەرد و ئاسن و پۆڵا نیم، گۆشت و ئێسقانم، پەکم کەوتووە، ڕاستییەکەی ئەوەیە ئیتر بەمن دەرناچێ.

وەرزێر گوێی نەدایە، بەکۆمەکی گاڵۆکەکەی وەک پەت کێشی کرد و بەدارە دارە خۆی پێ گەیاندە قەراخ شار. ئیتر لەوێ مەینەت کۆتایی هات. لاق لەرزی. لەش کەوتە زەوی. گیانی شەکەت و وەرزیش بۆ ئاسمان فڕی.

***

مجێور کە قسەی پتەو و بیچمی مەینەتباری کابرای وەرزێر کاریان کردبووە دڵی و ئازاریان دەدا. هەستی هاومەینەتیی بێدار بوو و گوتی: ئێمەی هەژار بەزەییمان بەیەکترا نەیەتەوە، کێ بەزەیی پێماندا دێتەوە؟ هەستا دوای کەوت کە بیهێنێتەوە بەڵکو خێرۆمەندان لە مزگەوت خێری پێ بکەن تا تۆزێ دەبووژێتەوە، جا ئەوسا ملی کارێ بگرێ یان بڕواتەوە. بازاڕ و جادە و کۆڵانی بەدوادا گەڕا و کەلێن و قوژبنی شاری پشکنی، تووشی نەهات. تا ئاخری لە قەراخ شار دۆزییەوە، بەڵام چی؟ لاشەیەکی بێ گیان و زامار! زانیی تاوانێکی گەورەی کردووە و سووچی ئەوە ئەم چارەڕەشە مردووە. تەریق بووەوە و پاڕایەوە لە تەرمی زامار و، دوعا و فاتیحای خوێند بۆ گیانی پەڕەوازەی هەژار، بەڵکو لێی ببوورێ و لەو تاوانەی کردوویەتی ببەخشێ. لەبەر خۆیەوە دەیگوت: من بەگیانی ناخێرم دڵسۆزیم کرد، بەو قسانە ویستم خێرخوایی بکەم، خۆ بۆیەکم نەبوو بەم ڕۆژە بگات.

بەشەرمەزاری دای بەکۆڵی خۆیدا و پەیتا پەیتا لە ژێر لچەوە دەیگوت: بریا، سەد بریا

من بوومایه لەجیاتی تۆ! هەڵی گرت و هێنای لە حەوزی مزگەوت ڕایکێشا و بۆ کفن کەوتە ناو بازاڕ. ڕۆیشت تا گەیشتە دوکانی مام حاجی بازرگان و گوتی: کابرایەکی هەژار و ئاوارە و بێ کەسوکار لە برسا مردووە و هاتووم بۆ کفن. تۆ کفنی بۆ بکە و شۆردن و گۆڕیشی لەسەر من. حاجی پیشی خواردەوە و مژێکی لە جگەرەکەی دا. وەک مار پێوەی دا، پڕ بەپێست ئاوسا. لە پاشان کۆکەیەکی کرد و هاتە قسە و گوتی: بەم بێ بازاڕییە خێر و بەرەکەتت هێناوە! بەمن چی ڕەشوڕووتێک مردووە؟ دیسان هێندێکی کە پیشی خواردەوە و گوتی: باشە، پەلە مەکە، با بازاڕمان ببێ ئەوسا وەرەوە کفنی بۆ دەکەم. مجێور بەتووڕەیی و بەسەر ڕاوەشاندن گەڕایەوە. لە ژێر لێوەوە بەدەم ڕێگەوە بەجنێوەوە دەیگوت: بەڵێ، مام حاجی! تەرمەکە خوێ بکەم بۆگەن نەکات تا بازاڕت دەبێت. ئەوسا بێمەوە خزمەتت! تف لە خۆت و پارەشت. بۆچی مردووش کاڵا و کووتاڵە پەسا و ئیحتیکار بکرێ!... بردی بەجلوبەرگەکەی بەریەوە ناشتی و گوتی: (شەهیدی زوڵمە. کفن و شۆردنی ناوێ).

وەکو بیستوومە مامۆستا حەسەنی قزڵجی لەسەر ئایەتەکانی قورئان کۆڵیوەتەوە و لەم بارەوە تەفسیرێکی لەسەر قورئانی پیرۆز نووسیوە و داویەتە یەکێ لە ئاشناکانی تا بۆی چاپ و بڵاو کاتەوە کە بەداخەوە ئەو تەفسیرەی سەر و شوێنێکی نییە.

سەرچاوەکان

١- ئاشتیخوازی لادێ - نووسینی حەسەنی قزڵجی - بەغدا، ١٩٥٩.

٢- پێکەنینی گەدا - نووسراوی حەسەنی قزڵجی - بەغدا، ١٩٧٢.

## شاکر فەتاح

١٣٣٤ - ١٤٠٦

شاکر فەتاح لە ساڵی ١٣٣٤ی کۆچی لە شاری سلێمانیدا لە دایک بووە و خوێندنی سەرەتایی لە سلێمانی و خوێندنی ناوەندیی لە بەغدادا تەواو کردووە و پاشان چووەتە زانکۆ و لە ڕشتەی یاسادا لیسانسی وەرگرتووە و ئەوسا بووەتە فەرمانبەر و لە پاشان بووەتە جێنشینی سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستان و سەرئەنجام لە ساڵی ١٤٠٦ی کۆچیدا بەهۆی ڕژێمی سەدامەوە لە دار دراوە.

شاکر فەتاح بەیەکێ لە نووسەران و وێژەوانانی هەرە بەرزی کورد دێتە ژمار و وەکو دەڵێن سەد و نۆزدە نووسراوی لە زمانی بێگانەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و گەلێ وتاریشی لە بارەی وێژەوە نووسیون و گەلێ گەشتنامەشی هەیە و ئێستا ژمارەی نووسراوەکانی لە دوو سەد پترن و لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ چیرۆکی نووسیوە و بەیەکێ لە

چیرۆکنووسانی کورد دێته ژمار و له ناو چیرۆکەکانیدا دەتوانین لەم چیرۆکانه ناو ببەین: «مام شێخ، دەسپاکی، مامۆستا و شاگرد، بووک و خەسوو، مامۆستا و بێژەن، مدیر بەگ، سەرێکی هەیه و هەزار سەودا، چەقاوەسوو، هاوڕێی منداڵ، ژینی نوێ» و گەلێ چیرۆکی تری کۆمەلایەتی. ئەمەش پارچه پەخشانێک له مامۆستا شاکر فەتاح کە له پەڕتووکی گەشتی هەڵەبجه و هەورامان هەڵمانبژاردووه دەڵێ:

ئەوی له دوورەوه بێته (هەڵەبجه)وه، ڕیزه خانوویەکی بەرچاو دەکەوێ، شارێک له شاره ڕازاوەکانی ڕۆژئاوای دێتەوه بیر، ئەم خانووانه هی (وەسمان پاشا)، (تاهیر بەگ)، (حامد بەگ) و دەوڵەمەندەکانی تری جاف و هەڵەبجەیین. ئێمه چووینه ماڵی (وەسمان پاشا)، لای (ئەحمەد موختار بەگ)ی کوڕی. بەڕاستی کۆشکێکی ناوازه بوو. دوو نهۆم، بەرز بوو. له خوارەوه تارمه و دالانی گەوره گەوره و پان، له سەرەوه بەر هەیوانی فراوان، هەر چوار لای کۆشکەکەی ڕازاندبووەوه. ژوورەکان یەک لەسەریەک بوون. دەرەوەیان بەئاوێنه بەندی و میناکاری پڕ نەخش و نیگار، بەڕەنگی ئاڵووالا، ناوەوەیان بەئاڵەت و ئاوێنەکاری، پەنجەره و بنمێچەکان و دیوارەکانیان جوان کرابوون. دەرگاکانیش کارێکی یەجگار جوانیان تیا کرابوو. له هەر گۆشەیەکی کۆشکەکەوه له ناوەندی دوو هەیواندا، ژوورێک هەبوو. پەنجەرەکانی بەهەر چوار لایدا دەیڕوانی. یەکێک لەمانه (قوله)ی پێ دەڵێن. چونکه جێگای شەڕه تفەنگ بووه بۆ بەرامبەری دوژمن. له هەر لایه هەیوانێک هەبوو، بەدرێژایی لای خانووەکه. لەبەرئەوه بۆ تەماشاگاه هەموو حەلێ ئەم کۆشکه شاهانایه بەسەر ماڵەکانی هەڵەبجه و دێهاتەکانی بنار شاخەکانی هەورامان و باخەکانی چوار لای هەڵەبجه و دەشتی فراوانی شارەزووردا دەیڕوانی. تێکڕا، هەموو ژوورەکانی سەرەوه بەبەڕەو قاڵیچه، بەکورسی و مێز و ئاوێنەی گەوره گەوره پڕ کرابوونەوه. میوانەکانی (بەگ) له نهۆمی سەرەوه دادەنیشن. سەیر ئەوەیه، بەپێچەوانەی (سلێمانی) ئەوی تۆزه ئاشنایەتییەکی هەبێ لەگەڵ (ماڵی پاشا)دا، بێ پرس دەتوانێ بەهەموو لایەکی خانووەکەدا بسووڕێتەوه، تا خۆی، یاخود ژنەکەی، یان یەکێ له دەس و پێوەندان دەدۆزێتەوه. ئەم کۆشکه گەورەیه بەلای کەمەوه چل ژوورێکی گەورەی تیا بوو. هەموویان پەنجەرەی گەوره گەورەی باکێشیان تیا بوو. لەبەرئەوه (ماڵی پاشا) تا بڵێی فێنک بوو. چونکه با هەموو لایەکی دەگرتەوه. لەو سووچەوه کە ئێمه لێی دانیشتبووین -بەری ڕۆژهەلات- چاومان له باخچەیەکی فراوان بوو، ئەستێرکێکی گەورەی له ناوەڕاستا بوو. لایەکانی کەیشی بەدار و درەختی بەردار و سێبەردار تەنرا بوون. له لای دەرگانەکەیەوه سەرشۆرک (حەمام)ێکی خنجیلانەی جوان کرابوو. حەلی خۆی بۆ پاشا و خێزانی بووه. بەڵام ئێستا بۆ هەموو کەسه.

***

که چووینه سەرێ بردیانینه ژوورێکەوە. ژووری ژنان بەرامبەری بوو. (حەبە خانی) ژنی (ئەحمەد بەگ) لەگەڵ دەس و پێوەندەکانیا بەسەربەستییەکەوە، لەولامانەوە قسە و گەپی دەکرد. چای دەخواردەوە. ئێمەی نەدەناسی ئەگین دەهاتە لامان، گەلێک لە لامان دادەنیشت.

پیاوێکی باریکەڵانەی چاوشینی دەموچاو سووری وریا دەستی هەردووکمانی گوشی. ئەم پیاوە کە (عەلی ئەفەندی)ی ناو بوو، خۆی لە بنچینەدا ئەڵمانی بووە. برایەکی پسپۆڕی لە منداڵیدا دەیفڕێنێتە هەڵەبجە. ئێستا ئیسلامە. کوردی زۆر چاک دەزانێ. لە ژنێکی کورد کوڕێکی کورتەبنەی یەک چاوەی زیرەک و وریای بووبوو. جا ئەم پیاوە بوو کە کار و فرمانی (بەگ)ی بەباشی هەڵدەسووڕاند. ئەگین ئەوانی کەی گێژوویژ بوون، فریان بەسەر هیچەوە نەبوو.

ئەم و (حەمە فەرەج)ی کوڕی زۆر میوان نەوازییان کردین. سەردەمێک لەمەوپێش (حەمە فەرەج) لە (خوێندنگای ئەمریکان)ی بەغداد بووبوو. ئینگلیزییەکی باشی قسە دەکرد. (تاهیر بەگی برای ئەحمەد بەگ) دەڵێ: «قوربانی پەلت بم کە پەلی هامپەلت پەل گرد»: گوایا براکەی (عەلی ئەفەندی) کە ناوی (هامپەل) بووە، (داود بەگی جاف)ی دەرمان خوارد کردووە. ئەوانیش ڕایان سپاردووە، یەکێکیان کوشتوێتییەوە. ئنجا (تاهیر بەگ)، خۆی دەکات بەکوڕی (قوربانی) بۆ ئەو کەسەی کە (هامپەل)ی برای (عەلی ئەفەندی)ی کوشتووە!...

ژوورەکەمان بنمیچێکی ئاوێنە بەند، دیوارێکی ڕەنگ کراوە، چەند پەنجەرەیەکی میناکاری لەسەر شێوەی کۆن تیا بوو. تاقەکان بەچینی و شتی ناوازەی بلوورین ڕازابوونەوە. قاڵی و دۆشەک ئەمبەر و ئەوبەر ڕاخرا بوون. ئێمە لێرە دانیشتین، چایان بۆ هێناین. لەپڕ کوڕێکی ١٦ ساڵەی قەد و باڵا جوانی پەری ڕوو هاتە ژوورێ. دەستی گوشین. ئێمەیش جگەرەمان دایە. پرسیم کێیە؟ خۆی وتی: «من مەسعودی کوڕی تاهیر بەگ)م. بەڕاستی دڵم ڕۆشن بووەوە. گەلێ قسەی خۆش خۆشی بۆ کردین. تەرحە پێکەنینێکی هەبوو، کاری لە دڵی پیاو دەکرد. سەرگوروشتەی خۆی بۆ گێڕامەوە، کە بۆچی لە خوێندنگا وازی هێناوە. بەڵام لە دواییدا تێگەیشتم کە سەرە ڕاوێکی لە سکا نییە. هەر لەملا و لەولا دەسووڕێتەوە. منیش ئاخێکم هەڵکێشا و لە دڵی خۆمدا گوتم: «داخەکەم تاهیر بەگی ناودار کەسی نەبوو جێگای بگرێتەوە!». ئەگەر ئەم کوڕە باوک و دایکی بمایە وازیان لێ نەدەهێنا تا پیاوێکی ناوازەی وەک باوکی خۆی لێ دەهاتە دەرەوە. بەڵام وا دیارە (ئەحمەد بەگ)ی مامی هیچ ئەوەی لێک نەداوەتەوە!؟... یاخود لێکی داوەتەوە بەڵام بۆی نەچۆتە

سەر!... لەگەڵ ئەوەیشا (مەسعود بەگ) هاودەمێکی زۆر باشی نواند. لەگەڵ (حەمە فەرەج)دا هەموو جارێ لەگەڵماندا دەهاتە دەرەوە، ئەیگێڕاین بەناو شاردا. لە دەرەوە (ئەحمەد بەگ)یشمان پێ گەیشت. ماندوو نەبوونی لێ کردین. پیاوێکی کەڵەگەت بوو. بەخۆوە بوو. موو زەرد و دەموچاو سوور بوو. جوانترین زەردەخەنەی هەبوو کە لە هەڵەبجەدا دیبووم. لە ئێمە تێپەڕ بوو... جارێ بام بڕۆین...

***

باخەکانی هەڵەبجە لای خوارووی کەوتبوون. (باخی میر)یان هی (ئەحمەد بەگ) بوو. لە هەموویان گەورەتر بوو. باخچەیەکی کەیشی هەبوو، سوڕک و ئەستێرەیەکی تیا بوو، لەگەڵ چایخانەیەکدا کە لەبن سێبەری چەند دارێکی گەورەدا بوو. باخەکانی هەڵەبجە گەورە بوون. هەنار و هەنجیر و کەمێک ترێ و میوەی تریشیان تیا بوو. جگە لەمانە ماڵە گەورەکانیش باخ و باخچەیان هەبوو. میوەی شاری هەڵەبجە ئەو باخانە پێکیان دەهێنا. خانووەکانی هەڵەبجە چەشنی هی سلێمانین. ڕاستە شەقامێکی خنجیلانەی پاکی تیا بوو. بەلام کۆڵانەکانی تەسک و تورووسک، پیس و پۆخڵ، نارێک و ناقۆلا بوون. دوو قەیسەری، دوو سەرشۆرک، چایخانەیەکی سەر نهۆمی سەرەوەی جوان، چەند ڕیزە دوکانێکی زۆر ڕێکوپێکی لێ کرابوو. تازە خەریکی دروستکردنی ئۆتێلێک و ئۆتۆمۆبیل خانەیەک بوون... بەلام چەند دوکانێکی ناشیرین بازاڕەکەی ناخۆش کردبوو. هەڵەبجە پێنج سەد ماڵێک دەبوو. لە شوێنێکی تەختا هەڵکەوتبوو. گەلێ کانیاوی جوانی هەبوو. توتنێکی زۆریشی لێ کرابوو. باخەکان لە شیو و دۆڵەکانی خواروویدا هەڵکەوتبوون. هەر چوار لای دەشت و نەرمان بوو. لە دوورەوە شاخەکانی (هەورامان) دیار بوون. دێهاتی (عەبابەیلێ، جەلیل، عەنەب، گردی بەکراوا)ی لێوە دیار بوون.

***

سێ ڕۆژ لە هەڵەبجە ماینەوە. جوولەکەکانی هەڵەبجە، لە هی سلێمانی، ئافرەتیشی دیسانەوە لە هی گەلێ جێگای تر سەربەستترن. (کانی ژنان) کە لە ماڵی پاشاوە دیار بوو، زۆر ژنی جوانی دەهاتە سەر. ژن لە هەڵەبجەدا زۆر خۆیان دەڕازێننەوە، لە کاتی کار و فرمانیشدا هەر بەرگی جوان دەپۆشن. سەری ژنی هەڵەبجەیی، جوانترینی سەری ژنانی کوردە کە دیبێتم. جوانیان زۆرە. پیاوانیش لەبەرئەوە سەربەستن.

(ئەحمەد بەگ) هەمیشە بەدیار توتنەکەیەوە بوو. دەیگوت: ئەم توتنە هەزار دیناری پێ دەگرمەوە!... گەلێ کرێکاری بۆ ڕاگرتبوو. سەرکارەکانیان دووانیان (ئەرمەنی) بوون. لەسەر شێوەی تازە توتنە (سامسۆن)ەکەیان دەشکاندەوە. بێ گومان (ئەحمەد بەگ) بۆیە

ئەمــەندە بەدیاریانەوە دەبوو، زۆر لە کــرێکارەکــانی ژنــی جــوانی هەڵەبجــەیی بــوون. هەر لەبەرئەمەیش بوو کە کار و فرمانەکەی وا زوو هەڵدەسوورا...

(ئەحمەد بەگ) زۆر دڵتەڕ بوو. لە بەرگ و هەستان و دانیشتنا، لە ڕابواردنا، ڕەوشتێکی بوێژانەی هەبوو. وابزانم لەبەرئەوەیشە کەوا بوو، هەڵەبجە، خۆی، دڵتەڕانە هەڵکەوتووە. ئاو و بای ســازگــاری، چاوئەندازی ڕەنگینی، کچ و ژنی شــیــرین و نازەنینی، تێکڕا کــاری لە ژیانی هەموو هەڵەبجەییەک کردووە. لەم هاوینەدا دەبینی لە هەموو باخێکا کەپرە و هەوار، نیشتەنییەکانی هەڵەبجە تیایاندا ڕادەبوێرن. (ئەحمەد بەگ) کە ئێوارە دەهات، بەخۆی و چەند هاودەمــێکیــەوە لەگەڵ گــۆرانیــبێــژێکدا بەمــەی و جامی مــەیەوە دەچۆوە باخــێک لەو باخــانەوە. تــا کاتی چوارەمی شــەو دەیخــواردەوە و بەبەزم و ڕەزمــەوە ڕایدەبوارد. جگە لەو زۆر کــەســانی تریش بۆ خــواردنەوە و ڕابواردن لە دەمــەوئێــوارێــوە، لە ناو ئەو باخــانەدا ڕایاندەبوارد تا خەوتنان.

ئێوارێ نانێکی خۆشمان خوارد. هەڵەبجەیی لە چێشتا وەستان. گەلێک چێشتی خۆش خــۆش و نــاوازە دروست دەکــەن. لە پاک و خــاوێنیــشــدا تەواون. پاش نان، چووینە (خوێندنگای زانستی). خوێندنگاکە قەراخ شار کەوتبوو. زۆر جوان و ڕێکوپێک بوو. لەوێدا شاگردە هەڵەبجەییەکان بەشەو بەدوکاندارەکانیان دەخوێند. نزیکەی سی شاگردێک لەوێدا دەیانخوێند.

***

بەیانی لە مزگەوت دەموچاومان شت. مزگەوتی ئێرە ئەستێرکەکەی گەورە بوو. بەردە نوێژەکانی تەختە بوون. پێشاوەکانی، بەپێچەوانەی هینەکانی سلێمانی دەرگایان هەبوو. دیوارێکیش پێشاوەکانی لە جێی نوێژ و دانیشتن جوێ دەکردەوە. بەکورتی مزگەوتەکەی هەڵەبجە ڕێکوپێک و پاک و خاوێن بوو.

کە گەڕاینەوە ماڵی پاشا، (ئەحمەد بەگ) لە دیواخانەکەیدا دانیشتبوو. زۆر گیان سووک و ڕووخۆشم هاتە پێش چاو. باسی وێژەی کوردیم لەگەڵ کردەوە. لە کۆمەڵە هۆنراوەکانی خــۆی گــەلێکی بۆ خــوێندینەوە. قــســەکــانی ئاودار و نــاسک بوون. باسی دڵداری و نیشتمانپەروەرییەکی یەجگار بەهێزی دەکرد. بەڕاستی خۆشخوانییەکانی لە چێشکەدا لە هۆنراوەکانی (تاهیر بەگ)ی برای کەمتر نەبوون. (ئەحمەد بەگ) نیازی هەبوو لە چاپیان بدات. بێجگە لەوە دەیگوت: «چیرۆکێکی کاریگەری قوڕ بەسەری کوردم نووسیوەتەوە. نارەسەنی بێگانە پیشــان دەدات. چاوی کورد دەکاتەوە». دەیگوت: «گوێ نادەمە دڵ و ئارەزووی میری قسەی سەربەستی ڕاستی خۆم هەر دەکەم. بەوانەوە نەبێ لە چاپی

نادەم». گوتی: «شتێکی تریشم بەدەستەوەیە. ڕەنگە ئەم زستانە تەواوی بکەم!».

بەرچایی، لە هەڵەبجەدا ئەمەندە بایەخی پێ نادرێ. لەگەڵ ئەوەیشا بۆ ئێمە نان و ماست و چایان دانا، کە زۆر خۆشیمان لێ چێشت، هەر لەبەرئەوەی کە لەگەڵ (ئەحمەد بەگ)دا بووین.

لەگەڵ (ئەنوەر بەگ)ی هاوڕێمدا چووینە ماڵی (حامد بەگ)ی مامۆی. ئێرەیش گەلێک ڕێکوپێک بوو. ئەستێرکێکی ئەندازەیی جوانی لە ناوەڕاستا بوو کە لە بەردەمی کۆشکەکەیاندا بوو. ئەم خانووەیش گەورە و بڵند بوو. ژوورەکانی بەکورسی و قەنەفە و مێزی ناوازەوە ڕازێنرابوونەوە. (حامد بەگ) مەکینەیەکی ئەلەکتریکی هێنا بوو، چرای ئەلەکتریکی بەناو هەموو خانووەکەیدا بڵاو کردبووەوە. بەڵام لەبەر ئەرک زۆری کەم کەم دەیانخستە کار. پارەی زۆری ئەویست. هەرچی هەڵەبجەییەکانی تر بوون، هێشتا هەر چرای نەوتیان دەسووتاند.

بەڵام خانووی (تاهیر بەگ) وێران بووبوو. جاران لەبەر دڵی (خانمی وەسمان پاشای جاف) هەیوانی ئەوێ و ماڵی پاشایان بەپردێکی تەختە دەگەیاندەوە یەک.

ئێستە ئەوەیش نەماوەتەوە. (ئەنوەر بەگ) دەیگوت: «حەلی خۆی ماڵی پاشا، لەو حەلەدا کە (خانم) سەرداری هەڵەبجە بووە، دەر و ژوور، کەسی نەگرتووە. ئێستە ئەمەندە نیشتەنیی کەمە وەکو چۆڵی لێ هاتووە». ئیتر لە پاش ناز گرتنێکی زۆر و میواندارییەکی یەجگار باش لە لایەن برا هەڵەبجەییەکانەوە، لەسەر فەرموودەی (ئەحمەد بەگ) چووینە «دەرەشیش».

شاکر فەتاح لە هۆنینەوەی هۆنراویشدا دەستێکی باڵای هەیە و هۆنراوەکانی گەلێ پاراو و شیرینن و لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بەپرش و بڵاوی چاپ بووە. ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی ئەو کە دەڵێ:

بەس خۆت هەڵکێشە بەباوانتەوە
بەس پێ بنازێ بەخزمانتەوە
وەرە بەر دیوان قەومی هەژارت
بۆیان بژمێرە کردەوە و کارت:
چەند تێ کۆشاوی؟ چیت بۆ کردوون؟
چەند جار تەنگانە لە دەستت گرتوون
ئەوسا تەرازووی تاسەی هەژاران
پیشانی ئەدا: سووکی یان گران!

ئینجــا تێ ئەگــەیت کــە خــانەدانی
بۆ تۆ وەک یەکـــە مـــانی و نەمـــانی
کــە خــۆ هیچ نـەبی، خــەڵکی بەتۆ چی
ســـکـــە نـــاڕەوا وەک ڕەوا ئـــەچـــی

سەرچاوەکان
١- پەخشان - نووسراوی شاکر فەتاح - بەغدا، ١٩٤٧.
٢- گەشتی هەڵەبجە و هەورامان - نووسینی شاکر فەتاح - بەغدا، ١٩٥٢.

## عەلائەدینی سەجادی

١٤٠٥ - ١٣٣٥

عەلائەدین کوڕی سەی نەجمەدینی سەجادی لە ساڵی ١٣٣٥ی کۆچی لە شاری سنەدا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و هەر لە منداڵییەوە، خەریکی خوێندن بووە و بۆ خوێندن بەزۆربەی شارەکانی کوردستاندا گەڕاوە و لە پاشا چووەتە سلێمانی و لەوێدا لە لای زانایانی ئاینی فقهی خوێندووە و ئیفتای وەرگرتووە و پاشان چووەتە بەغدا و لەوێدا نیشتەجێ بووە و ماوەیەک لە کۆڕی زانیاریی کوردا خەریکی بووژانەوە و زیندووکردنەوەی زمان و وێژەی کوردی بووە تا سەرئەنجام لە ساڵی ١٤٠٥ی کۆچی لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا نێژراوە.

عەلائەدینی سەجادی بەیەکێ لە زانایان و وێژەوانانی هەرە بەرزی کورد دێتە ژمار و ئەو زۆربەی تەمەنی خۆی لە ڕێی فەرهەنگ و وێژەی کوردیدا بردە سەر و لە ماوەی تەمەنیدا گەلێ پەڕتووک و نامیلکەی بەزمانی کوردی نووسی کە بریتین لە: مێژووی ئەدەبی کوردی، ئەدەبی کوردیی نوێ و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی، ڕشتەی مرواری، گەشتێک لە کوردستانا، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، هەمیشە بەهار، ناوی کوردی، دەستوور و فەرهەنگی کوردی و عەرەبی و فارسی، نرخ شناسی، کورد و شۆڕشەکانی.

مامۆستا سەجادی جگە لە تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی وێژەی کوردی، لە چیرۆک نووسینیشدا دەستێکی بەرز و باڵای هەبووە و گەلێ لە چیرۆکەکانی لە گۆڤاری گەلاوێژ و نزاردا بڵاو بوونەتەوە و زۆربەی ئەو چیرۆکانەی کە نووسیونی لە ژیانی کوردەواری هەوێنیان گرتووە و هەندێکیشی چیرۆکی فۆلکلۆرین کە لەسەر بنەڕەتی ئازایی و نەبەزی و ڕەوشت پاکی و جوامێری وتراون و زۆربەیان ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەوارین و دەگەڕێنەوە بۆ دەوری زۆر کۆن کە دەم بەدەم هاتوونەتە خوارەوە و مامۆستا سەجادی

تۆماریانی کردووە و بەڕاستی مامۆستا سەجادی لەم بارەوە گەلێ ئەرک و ڕەنجی کێشاوە و زۆربەی تەمەنی بەتۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی وێژەیی بردووەتە سەر و نووسراوەکانی گەلێ بەنرخ و بایەدارن. ئەوا یەکێ لە چیرۆکەکانی ئەو بەناوی: بۆچی نەچووین بۆ کوێستان؟ دێنین کە لەم چیرۆکەدا مامۆستا لە بارەی دەرەبەگایەتییەوە دەدوێ کە سەرۆکی هۆزێک بەیارمەتیی دەرەبەگێکی تر دەبنە هۆی تەنگوچەڵەمە و کۆسپ لە بەرابەری ژیانێکی پڕ لە شایی و خۆشی چەند جووتیارێک و تەنانەت ڕێگای گەشتی کوێستانیان لێ دەگرن و سەودا لەسەر ئەرک و ڕەنجی وەرزێران دەکەن، لە لایەکی ترەوە ستەمی ئاغا و خوڵتەی مووچەخۆر دەردەخا وەکو دەڵێ:

بیری منالّی تیژە، تازە پێم گرتبوو، نەوەڵڵا چوار پێنج ساڵان دەبووم. خۆت دەیزانی ئێمە دەوارنشین بووین. هێشتا گەلێکی مابوو بۆ ئەوە بچین بۆ کوێستان، زستانە هەوارەکەشمان ناخۆش نەبوو. ساڵانە لەناکاو «مارفی سەمین» ماڵ و پیاوی خێڵەکەی دەدایە بەرووروەوە و هەوار پێ پێوە دەنا، ژن و منالّ و ئەمانەش ئاژاڵەکەیان دەدایە پێش و بەشوێنیانا دەچوون. ئەو ساڵە هێشتا دوو سێ مانگی مابوو بۆ وادەی بارکردن، ئەوەندەم زانی کتوپڕ مارف کەوتە خێڵەکە و ماڵە و ماڵ پیانەوە گەڕرا وتی:

«وا هەر لە ئێستاوە پێتانی ئێژم دە ڕۆژی بمێنێ بۆ پێنجەی تار لێرەوە وردە وردە بار دەکەین، ئیمساڵ بەرێ «ناوخوان»ا ئەڕوێن تا دەگەینە کوێستان سێ چوار بەهار دەخۆین. ئیتر ئێوەش تروتفاقی خۆتان زوو بەزوو جێبەجێ کەن پاشە جار نەیێژن «مارە» پرس وەکەس ناکا و ئێمە وەهیچ نازانێ!. ئەوا هەر لە ئێستاوە پێتان ئێژم، با بکەونە خۆتان.».

دایکم بەڕەحمەت بێ دەیگێڕایەوە دەیوت: ڕۆڵە! فرەخاس بوو، جاران زۆر بەبێ تفاقی دەچووین ئاگامان لە هیچ نەبوو لەناکاو دەیکردە سەرمان بار کەن، لەبەر شپرزەیی گەلێ شتمان لێ بەجێ دەما.

ئەو ساڵە هەتا بڵێیت ساڵی چاک بوو، تەنانەت هەوارگە زستانەکەشمان بووبوو بەکوێستانی «شا قەڵا». ئیتر هەموو خێڵەکە لە خۆشیا لەوانە بوون باڵ بگرنەوە؛ ساڵی وا خۆش، لە پێشەوە خەبەری بارکردنیان دراوەتێ، مالات تا دەگاتە بناری بانە هیچ نەبێ سێ چوار بەهار دەخوا. خۆت دەیزانی ئەمە بۆ مەڕدار و شوانکارە چ خێروبێرێکە!!... بڕوام پێ بکە شەوچەرەی ئەو زستانە لە خێڵەکەی ئێمەدا هەر بووبوو بەم قسانە: ئیمساڵ بەشێنەیی دەچین بۆ کوێستان، هیچمان لێ بەجێ نامێنێ، جا وەرە مەڕومالات سێ چوار بەهار بخۆ و دەست مەیەنە بەخۆتا!!...

لە ژێر دەوارەکەی ئێمەدا دانیشتبووین، دەمەوڕۆژاوا بوو، نم نمەی بارانیش دەباری، لە

بەینی کاژە هەورەکانەوە گزنگی هەتاوەکە دەیدا لە بارانەکە دەدرەوشـایەوە. «مـەجـۆلی خـامـە، کـردی بەژۆرا. دایکم سـەر بەدەرەوە بوو لە ڕیزی پیـاوانا بوو لێی پرسـی: ئەرێ مەجۆل! «شەپە»ی کوڕت گەیشتۆتە کوێ؟ وتی:

خانم قسەی لێوە مەکە، لە «قولەفیسکە بۆ گەسەوە و تەنگی وەتەوەت هەڵچنێگە. وەسەر ئەو تاقـە کـوڕەت کـە چووینە کـوێسـتـان مـەلایەکی تـریشی بۆ دەگـرم خـێـرا لە مـریشکە ڕەشەشی دەرکا!. ئیمسـاڵ ساڵەکەی سـاڵ نییە! دەزانی فـەڕو و بەرەکەت چی کردگە؟. خۆ ئێجگار کـە پێـشـیـان وتگین بکەونـە خۆتان سێ چوار دەخۆن وە قـەورەکـەی مـەتحـەت لە خۆشیانا سێ شەوە خەو وەچاوم نەچووگە!».

ئەم بارکردنەی ئێمە و سێ چوار بەهار خواردنەمـان لە هەمـوو خێڵەکانی دراوسـێمـانا دەنگی داوەتەوە؛ مـا، خێڵی مـەتحـەت ئیـمسـاڵ چاکیـان بۆ هاتووە، هەر لە پێـشـەوە پیـان وتوون کوێستانی شارەزوور و شلێر و ناوخاوان و شاتەلاّ دەخۆن!.

***

زسـتـان هاتە کـزی سـەرمـا وردە وردە ڕەویـەوە کەوتینە دەمـەو بەهار زۆری نەمـا بوو بۆ نەورۆز و وادەی بـارکـردن، خـێـڵ هەمـوو وەکـو تـەلی تەمــوورە خـۆی سـاز کـردووە هەر چاوەڕوانی سبەی دووسبەیە و بارکا. مـارفیش هەر لەسـەر قسـەی خۆیەتی: هیـچـتـان لێ بەجێ نەمێنێ، ئیمساڵ بەهەوەسی خۆتان کام لا دڵتان دەیگرێ لێ دانیشن!...

بەخوا وەخت نزیک بووەوە، ها ئـیـمـڕۆ بار کـەین هـا سـبـەینێ. سـالاّن کە لە کوێسـتـان دەگـەڕاینەوە هەر مـاڵە بۆ خـۆی سـووکە تفـاقـێکی دەخست بۆ ئاژاڵەکەی سـا ئەگـەر ڕۆژێ بارانێ بەفرێ شتێک بووایـە و مـالات دەرنەچووایە، یا چەند ڕۆژێ پاش کەوتنایە ئەیاندایە. ئەو سـاڵە ئەوەش نەکرا، چونکە دەیانوت ئێـمـە کە لە پێشـەوە بار کەین و سێ چوار بەهار بخۆین ئیتر ئەم عەزیەتە بۆچ بکێشین!!...

ئەو ئێوارەی کە بۆ بەیانی بار کەین هەمـوو ماڵێ شڕ و شاتاڵی خـۆی شەتەک دا. هەر لە ئێستەوە خورماشیان کرِیبوو بۆ کوێستان، چونکە هەموو ساڵێ هەر مـاڵە هەندێ خورمای دەکڕی، لە کوێستان خورما نەختێ خۆشەویست بوو، لەوێ دەیاندا بەگۆرانەکان «خوێ»یان بۆ دەهێنان. خـورمـاکانیـان کردبووە هۆڕەوە و دارکوتیان کردبوو، سـەرەکانیان دووریبـوو، لەبەرئەوە کە لەسـەر کۆچ بوون هـەروا لەو دەشتـە دایاننا بوو کە بەیانی هات خێرا بیخـەنە سەر پشتی گاکان و تیانخورن.

کەوتە شەوێ، مارف زەلامێکی خستە ناو خێڵەکەوە، «بەیانی کەس بار نەکا!.».

ئای ئەمە چی بوو؟!...

دایکم و سێ چوار دەم سپی بەو شەوە چوونە لای مارف. کورە مارف!. ئەوە تۆ دەڵێی چی؟. وا خێڵ هەموو خۆی ساز کردووە و چاوەڕێی بەیانە بارکا.

– قەی ناکا با دوو سێ ڕۆژی تر بمێننەوە، خۆ هێشتا ساڵ زووە!.

– کورە مارف نەتکردبێ کەتنی وا بگێڕی؟!. ئەمە سێ مانگە تۆ هاوار دەکەیت و ئەم حەشاماتەت خستۆتە هەڵپەڕکێ؛ هەی ئیمساڵ سێ چوار بەهار دەخۆن، هەی ئیمساڵ خێروبێرتان وا دەبێ. ئێستە ئەمە چییە؟!...

– قەی ناکا ئێستەش وەخت زووە هەر دەیگەنێ.

هیچ، هەروا گەڕانەوە. بەیانی هەموو دەستەوئەژنۆ دانیشتن. شەوی دوایی کردیە ڕەهێڵەی بارانێک ئەوسەری دیار نەبێتەوە!. خورماکان هەر لەو دەشتە بوون هەمووی بەسەر یەکا تلیسانەوە! چار نەبوو هەر بەو جۆرە خێڵەکە دوو سێ ڕۆژی تر مانەوە. مارف هیچ دەنگی نەبوو، دایکم و پیاوەکان چوونەوە بۆ لای. کورە مارف ئێستە ئەڵێی چی؟. وا لەسەر قسەکەی تۆ دوو سێ ڕۆژە بەسەرچوو. دیسان وتی: قەیناکا با دوو سێ ڕۆژی کەش بمێننەوە!...

– کورە خوام کرد بەگژتا ئەم کەتنە چی بوو گێڕات؟!... هیچ کەڵکی نەبوو گەڕانەوە. بۆ نەگبەتی کردی بەتۆفێک ماڵە و ماڵ نەدەکرا. خۆ هیچ تفاقێکیش نییە بدرێ بەمالات، ئاژاڵ هەموو قڕی کرد!!...

***

سەرت نەیەشێنم بەدوو سێ ڕۆژ، دوو سێ ڕۆژی تری مارف کاتێ خەبەرمان بووەوە کوێستانمان لێ گیرا تازە ڕێ نەما!. هەموو مەڕومالاتمان لەبەر بێ لەوەڕی قڕی کرد و کەوتینە سەر ساجی عەلی!. هەروا لە بیرمە دایکم چاوی بەمەجۆل کەوتەوە، وتی: ها، مەجۆل «شەپە» گەیشتۆتە کوێ؟. وتی:

«خانم! قولەفیسکە و ملەفیسکەی گشت لە فکر چوکەسەوە. ساڵ بەساڵ خۆزگە بەپار، ئەمەش کەتنی مارف!».

منیش ئەو وەختە منداڵێ بووم، خۆت دەزانی کوردایەتی هەر هۆشی بەلای کەشک و سیرێژەوەیە. ڕۆژێکیان وتم: دایە کەشک دەخۆم. وتی: کەشکت لە کوێ بۆ بێنم!، مارف گیان هێشتی ئیمساڵ کەشکمان ببێت؟!. وتم مارف بۆچی؟. وتی نەیهێشت بچین بۆ کوێستان!. وتم بۆچی نەیهێشت؟. وتی: هەیهوو، تۆ زۆر لەسەر شت ئەڕۆی باوانت شێوی، چەپۆکێکی ماڵی بەسەرما دەستم کرد بەگریان ئیتر هەر نەمبڕیەوە!.

کتوپڕ «لالە، ڕەمە–م» کردی بەژوورا. وتی ئەوە ئەو کورە بۆ دەگری؟. دایکم وتی: چوزانم

سەرەخۆرە داوای کەشکم لێ دەکا. منیش وتم کەشکت لە کوێ بۆ بێنم؟ بۆچی مارف هێشتی ئیمساڵ کەشکمان ببێت!. ئێستە دەڵێ ئەو بۆچی نەیهێشت؟!. تەماشاکە، تۆ دەڵێی سەرەقلیانێکیت کارت چییە بەسەر ئەم قسانەوە!!...

لالەیشم وتی بەڕاست ئەوە فاتە ئیمساڵ مارف ئەو کەتنەی بۆ گێڕا؟!. ئەرێ فاتە! بەڕاست تۆ لێت نەپرسی؟... ئەویش وتی: بەرێ وەڵڵا، بەڵام لەبەر نووزە نووزی ئەم سەرەخۆرەیە بۆچ پیاو دەتوانێ قسە بکا؟!.

ئیتر لالەم پەلی گرتم و خستمیە کۆشی خۆیەوە و وتی مەگری گیان لالەی، ژیری کردمەوە. ئینجا دایکم دەستی کرد بەقسەکردن بۆی و منیش وا گوێم داوەتێ، وتی: مارف وتی:

ئەوی ڕاستی بێ خانم هەر گەلێ لە پێش وادەدا «حاجی قادری ڕوغزایی» ناردی بەشوێنما. لەم خێڵەدا منی لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ. کە چووم لە ژێر دەوارەکەی خۆیانا لە گوێ ئاگردانەکە دانیشتبوو «قەننە»کەی بەدەستەوە بوو هێشتا داینەگیرانبوو. منیش پەلاماری مەقاشەکەم دا و کەڵە پشکۆیەکم هەڵگرت و خستمە سەر قەننەکە بۆی. دوو سێ نەفەسی لێ دا و وتی بەخوا مارف هەر تۆ دەزانی ئەم قەننەی منە پشکۆی چۆنی دەوێ!. کە تۆ لێرە نەبی من لەزەت لە قەننە نابینم!.

نەختێکی تری پێ چوو ئینجا وتی مارف بچۆ جاڕ بدە بەخێڵەکەدا هەر لە پێشەوە خۆیان ڕێکخەن ئیمساڵ زوو دەچن بۆ کوێستان، خۆیشت دەزانی «حاجی قادر» جڵەوی هەموو خێڵەکانی بەدەستەوەیە و پووشانەی هەموویان وەردەگرێ، کەسمان ناتوانین قسە لە قسەیا بکەین!. هەتا دوا جاری ئەوە بوو «ڕۆستەمی بەکر» و «هۆمەری وەیسە» و «عوسەی خەجە» و «خلەی شەریفی» ناردە ئەوێ.

وتم جا ئەمە چی تێدایە بۆ ئەو؟. خۆ ئەم خێڵانە هەموو دەبێ پووشانەی خۆیان هەر بەو بدەن، ئیتر ڕۆستەم بێ و من بم تۆ بیت ئەو وشانەی خۆی هەر وەردەگرێ!.

پێی وتم خانم دووروێ لە تۆ نەتزانیگە!. ڕاستە هەموو ئەو پووشانەیە ئەدەین بەڵام ئەوە بوو سالان بەدەگمەن هی وا هەبوو کە بڵێ: حاجی ئیمساڵ تۆزێ ساڵەکەی بێ فەڕە نەختێ لە پووشانەکەت کەم کەوە. وەیا هی وا هەبوو بڵێت: عەرز عەرزی خوایە ئێمە ئەم پووشانەیە بۆچی بدەین!. ئیمساڵ با ئەو قسەیە نەبێ و دەستکەوتیش گەلێ لە ساڵان زیاتر بێ، ئیتر مەڕومالاتی تۆ دەفەوتێ یا نافەوتێ ئەو بایس نییە!...

وتم جا ئەوە چۆن دەبێ؟. وتی ئێژم خانم نەتزانیگە بڕوام پێ ناکەی؟. ئەوە بوو هەموو خێڵەکە سەرگەرمی بارکردن و سێ چوار بەهار خواردن بوون، گوێت لە قسەکەی مەجۆل

نەبوو لە ژێر دەوارەکەی خۆتانا چۆن مەلای تری ڕادەگرت بۆ شەپەی کوڕی؟!.

لەناکاو حاجی ناردی بەشوێن ڕۆستەم و ئەوانا پێی وتن وا چاوتان لێیە خێڵەکە هەموو لەسەر بارکردنە؟. دیارە ئێوەش هەر لەگەڵ ئەوان دەبن. بەڵام ئێستە من دەمەوێ هەر تەنها ئێوە بنێرم بۆ کوێستان. من دەتاننێرم من!. ئێوەش دەبێ پووشانەی ساڵی پار و هەر سەرەمەڕێکیش نیو هۆقە ڕۆنم بۆ بێنن - ئەمەم بۆ حەجی ئیمساڵ دەوێ، مناڵەکان زەماوەنیان کرد پارەیان بەدەستەوە نەهێشتم چەڵەمە شکێنیەکەش بکەینەوە!. کە ئێوەم نارد و گەیشتنە ئەوێ ئیتر ڕێ لەوان دەگیرێ و هەمووی بۆ خۆتان دەمێنێتەوە!...

ئەوانیش وتیان باشە، چونکە چاویان لێ بوو کە خێڵ چۆن لەسەر بارکردنە؟. بەتەواوی بۆیان ساغ بووەوە کە حاجی دەیاننێرێ لەبەر ئەوە، ئەو هەرچی بڵێ ئەمان ئامادەن. جارێ خۆیان کوێستانێکی مشەئەخۆن، پارەی کفن دەستکەوێ با مردوو گۆڕ بەگۆڕ بێ!. هیچ زیانێکی بۆ خۆیان تێدا نییە، حاجیش قرەی سالانی نابێتە ڕیشەوە و زیاتریشی دەست دەکەوێ، بەبێ هەرا چەڵەمەشکێنەکەش دەباتەوە!.

گوێم لێ بوو لالەم وتی: «بەسلامەتی حاجی باجی دایە حەمە جافر ئەوا ئێستە تێ گەیشتم!.».

ئەمە بیری منالی بوو، ئیشەکەی ئیمساڵیشیان دیارە هەر وا بووە!...

سەرچاوەکان


١- هەمیشە بەهار - نووسینی عەلائەدین سەجادی - بەغدا، ١٩٦٠.

٢- ڕشتەی مرواری - لە هەشت بەرگ - بەغدا، ١٩٨٣.

٣- مێژووی ئەدەبی کوردی - نووسینی عەلائەدین سەجادی - بەغدا، ١٩٥٢.

٤- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەعەلائەدین سەجادی.


## محەمەد تۆفیق وردی

١٣٤٤ - ١٣٩٦

محەمەد تۆفیق کە نازناوی وردییە لە ساڵی ١٣٤٤ی کۆچی لە سلێمانیدا هاتووەتە دنیاوە و دەوری سەرەتایی و ناوەندی بەهەزار ئەرک و کێشە هەر لەوێدا تەواو کردووە و لە پاشا لە کاری دەوڵەتیدا دامەزراوە و ئەوسا لەسەر کوردایەتی گیراوە و گەلێ چەرمەسەرێی دراوە و لە پاش بەربوونی ماوەیەک ئاوارەی کەژ و کێوەکان بووە و پاشان ڕووی کردووەتە هەندەران و سەرئەنجام گەڕاوەتەوە زێد و مەڵبەندەکەی و لە پاش ماوەیەک لە ساڵی ١٣٩٦ی کۆچیدا گیانی بەگیان ئافەرین سپاردووە.

وردی بەیەکێ لە بوێژان و هۆنەرانی هەرە بەرزی کورد دێتە ژمار و لە ماوەی تەمەنیدا نزیکەی بیست پەڕاو و نامیلکەی بەزمانی کوردی و عەرەبی سەبارەت بەوێژە و مێژووی کورد نووسیوە و گەلێ هۆنراویشی هۆنیوەتەوە کە گەلێ تەڕ و پاراو و شیرین و ئەو پەڕاوانەی کە نووسیویە بریتین لە: بانگی کوردستان، دەنگی جەزایر، کەربازاڕی، گوڵی ناکام، ویستم ژن بێنم، هەندێ لە بەیت و هەڵبەستەکانی عەلی بەردەشانی، ئەو کچەی مارەیی نەهاتووە، مامەیارەی قارەمان، سەرەتایەک لە مێژووی کورد، مەلا ئاوارەی قارەمان، حەسەن و مریەم، خانزاد و لەشکری، فۆلکلۆری کوردی، قەڵای دمدم، ناسر و مار مار(ماڵ ماڵ).

وردی ژیانی لە ئەوپەڕی دەرد و ئازار و چەرمەسەرێ و نەبوونیدا بردووەتە سەر، وە لەگەڵ ئەو هەموو ڕەنج و ئازارەدا هیچ کاتێ دەستی لە خزمەتی وێژە و مێژووی کورد هەڵنەگرت و لە ماوەی تەمەنیدا توانیی گەلێ پەڕتووک و نامیلکەی بایەدار بنووسێ و بەهەزار ئەرک و کێشە لە چاپیان بدا.

هەڵبەستەکانی وردی گەلێ سادە و پاراون، وەکو خۆی لە بانگی کوردستاندا دەڵێ: من لێرەدا هەندێ لە هەڵبەستەکانم خستە بەرچاو کە سادەن و بەپەناوپێچ نین، چونکە من لەسەر قوتابخانەی ڕۆمانسی نارۆم کە تەنیا وشەی بریقەدار و جوان گەرچی لە جێگەی خۆشی نەبێت، بەگرینگ دەزانن بەڵکە شێوەی هەڵبەست و نووسینی من بۆ گەلە، بۆ میلۆنەها لە کوردی سادەیە، بۆ ئەوانە کە لە بەروبوومی زانین و خوێندەواری بێ بەشن و بۆ چینی چەوساوەیە، ئەوانەش پێویستییان بەهەڵبەست و نووسینێک هەیە کە تێی بگەن. ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی ئەم بوێژە بەرزەمان لە سەردێڕی: نەورۆز دێنین کە دەڵێ:

وا نـــــەورۆزی دڵانـــــە
فـــەســـڵـی باخ و گـــوڵانە
وەک بووکی ســــوور ڕازاوە
چ دەشت چ گــوڵســـتـــانە

***

کــێـــو وەکـــو قـــەدی لەیلا
لەنجـــە ئەکـــا لە هەر لا
بڵـــبڵ بۆ گـــوڵە شـــەیدا
چـونکـە یـاری جــــــوانـە

***

کانی زێوین دێتە خوار
بۆ ناو دۆڵ و داروبار
وەکو زوڵفی گوڵ عوزار
با رێزەش لە سەرانە

***

قومری و قاز و مراوی
لەسەر جۆگە و ئاوی
پۆڕی شاپەڕ خوناوی
ئەخوێنی خنجیلانە

***

شەیدایە سونبلی سوور
ئەڕفێنێ دڵ دوور بەدوور
سووسن ئەنوێنێ سەدجوور
مایەی ژین و ژیانە

***

چ دەشت چ سەر نساران
بەگوڵاڵەی بەهاران
وەک کوڵمی سووری یاران
نەخشاوە زۆر جوانە

***

بای نەسیم دێ ناو بەناو
ئەدا لە سەرووی دەم ئاو
دێتە سەما بەندکراو
لەم ڕۆژ و لەو بەیانە

***

بۆنی هەڵاڵە و خاو
دڵ و هۆشت ئەکەن راو
ئەبەخشن بەکوێر دوو چاو
وانە و رۆزی دڵانە

***

تریسکەی خـــۆری گـــەردوون
ئەدا لـە پەڕەی بـەیبـــــوون
وەک زێو و دوڕ و ئـاڵتـــــوون
تــێـــکـــەڵاو بـــن بـــەدانـــە

***

پـەلـکـە ڕەنـگـیـنـەی ڕەنـگـین
لەســـەر ئـاســمـــان و زەمـین
خـــــۆشـی دێـنـێ چـین بـەچـین
وێـــنـــەی ڕەگـــی ژیـــانـــە

***

چـنـار و ســـــــــــپـی دارە
لەنجـــەیان گـــوڵعـــوزارە
دەنـگـی گــــــــەڵایـان تـارە
نـەورۆز جـــەژن و ســـەیرانە

***

گـــۆرانـی تـاڤگـەیـی شـــەنگ
لەگـەڵ خـۆری دوو سـەد ڕەنگ
لەسـەر جـوانـی شـەڕە و جـەنگ
دوو دڵبـــەرن مـــەســـتـــانە

سەرچاوەکان

١- بانگی کوردستان - هۆنراوەی محەمەد تۆفیق وردی - بەغدا، ١٩٧٠.
٢- سەرەتایەک لە مێژووی کورد - نووسینی محەمەد تۆفیق وردی - بەغدا، ١٩٥٩.
٣- خانزاد و لەشکری - نووسراوی محەمەد تۆفیق وردی - بەغدا، ١٩٦٨.

# کەریم شارەزا

١٣٤٨ - ...

کەریم، کوڕی مستەفای شارەزا لە ساڵی ١٣٤٨ی کۆچی لە کۆیەدا لە دایک بووە و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی هەر لەو شارەدا تەواو کردووە و پاشان چووەتە بەغدا و قوتابخانەی سەرەتایی مامۆستایانی بەئەنجام گەیاندووە و ئەوسا گەڕاوەتەوە کۆیە و بووەتە مامۆستا و لە پاشا خانەنشین کراوە.

کەریم شارەزا هەر لە تافی جوانییەوە حەزی لە وێژە کردووە و دەستی کردووەتە نووسین و گەلێ لە وتارەکانی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاو بووەتەوە و لە هەموو کۆنگرە و سمینارەکاندا بەشداریی کردووە و تا ئێستا گەلێ نووسراوی بڵاوبوونەتەوە کە بریتین لە: ئازادی و ژیان، کۆیە و شاعیرانی، ڕێگەی دوور، ئەسیری، پەندی پێشینان لە شیعری کوردیدا، لە یادی گیوی موکریانیدا، سێوەی هونەرمەندی کورد، پەندی بەراوردکاری، چەپکێک لە شیعرەکانی سامی عەوداڵ، نالی و زمانی یەکگرتووی کوردی، دیوانی حاجی قادری کۆیی.

کەریم شارەزا لە نووسینی پەخشانی کوردیدا شێوەیەکی سادەی بەدی هێناوە و زۆربەی نووسراوەکانی سادە و ڕەوانن و بەوشەی جوان و ساکاری کوردی نووسیونیبۆیە هەموو کەسێک حەز لە نووسراوەکانی دەکا. ئەمەش پارچە پەخشانێکی ئەم نووسەرە بەناوی جەژنی نەورۆز کە لەوەدا دەڵێ:

ساڵ گەڕایەوە، دەشت و چیا و دۆڵەکانی بووژانیەوە، سەرچاوەی قەدپاڵەکان بەناو دۆڵەکاندا کەوتنە کشان، بەفری سەر شاخە بەرزەکانمان چۆڕەی کەوتە بن، پیرە دار بەڕووەکان چرۆیان دەرکرد، مەل و باڵندەکان کەوتنە جموجۆڵی پڕ هیوا، لە هەر چوار لای وڵاتدا دەنگی چریکەی گۆرانیی جووتیارەکان و کیژۆڵەکان کێوەکانی کاس کردووە. ساڵ بەدوای ساڵا هاتووە، ساڵ بەدوای ساڵیشا هەر دێ هەتا هەتایی هەر نەورۆز تازە بووەتەوە، هەر نەورۆزیشە تازە دەبێتەوە. بەڵام چی ساڵانی تازە بووەوەی ڕابوردوو، وە چی ساڵانی نەورۆزی داهاتوو، ژیانەوەی سروشت بووە ئێستا. ئێستاکە نەورۆزی تازەیە، سروشت دڵ و دەروونی هەموو لایەکی کردووەتەوە، مەلی هیوامان لە ئاسمانی بێ پایانا بەستەی ئاواتی دەروونی گڕ تێ بەربووی بڵاو دەکاتەوە. هیواداریین ساڵانی داهاتوو دڵ و دەروونی مەلەکەی هیوامان سارێژ بێت و بەئاواتە دەروونییەکەی بگا، ئەوسا هەموو لایێ جەژنی نەورۆزی پڕ بەدڵان بکەن پێکەوە.

سەرچاوەکان

١- دیاریی نەورۆز لە پەخشانی کوردیدا - نووسینی عومەر ئیبراهیم عەزیز - بەغدا، ١٩٨٩.
٢- کۆیە و شاعیرانی - نووسینی کەریم شارەزا - بەغدا، ١٩٦١.
٣- سێوەی هونەرمەندی کورد - نووسراوی کەریم شارەزا - بەغدا، ١٩٨٣.

## عوبەیدوڵڵای ئەیووبیان

١٣٤٩ - ...

عوبەیدوڵڵای کوڕی سەید محەمەدی ئەیووبیان کە نازناوی (بڕەک)ە لە ساڵی ١٣٤٩ی کۆچی لە سابڵاخدا لە دایک بووە و دەوری سەرەتایی لە سابڵاخ و ناوەندیی لە تەورێزدا تەواو کردووە و پاشان چووەتە زانکۆی تەورێز و لە ڕشتەی مێژووی جوغرافیای گشتی لیسانسی وەرگرتووە و ئەوسا لە زانکۆدا ماوەتەوە و لە پاش ماوەیەک پلەی مامۆستایی پێ دراوە و پاش چەند ساڵێک خرایە ڕیزی مامۆستایانی پسپۆڕ و هەر لەو ماوەیەشدا گەلێ وتار و بەیت و چریکەی کوردیی بەچاپ گەیاند و لە گەلێ کۆبوونەوە و سمیناریشدا بەشداریی کرد و لە هەموویاندا سەبارەت بەکورد و کوردستان و مێژوو و، وێژەی کورد دوا و لە پاشا لە دەوری شاهەنشاییدا لەسەر کوردایەتی و کوردپەروەری گیرا و چەند ساڵێک لە بەندا مایەوە و پاشان ئازاد کرا و دیسان خەریکی بووژانەوە و زیندووکردنەوەی زمان و فەرهەنگی کوردی بوو تا خانەنشین کرا.

مامۆستا عوبەیدوڵڵا بەیەکێ لە نووسەران و وێژەوانانی هەرە بەرزی کورد دێتە ژمار و لە ماوەی تەمەنیا گەلێ وڵات و شار گەڕاوە و لەم گەڕانەیدا چاوی کەوتووەتە گەلێ لە زانایانی کورد و لەگەڵیانا سەبارەت بەکورد و وێژەی کوردی دواوە و لەم بارەوە گەلێ بیرەوەری هەیە. ئەم زانایەمان هەر لە منداڵییەوە حەزی لە هۆنراو و وێژەی کوردی کردووە و لە تافی لاویدا پارچە هۆنراوێکی هۆنیوەتەوە و لە گۆڤاری نیشتمانی ئەو دەمەدا لە چاپ دراوە و تا ئێستا چەندین بەرگ پەڕتووکی بەزمانی کوردی و فارسی بڵاو کردوونەتەوە کە گەلێ گرنگ و بایەدارن.

هەندێ لە نووسراوەکانی ئەو بریتین لە: ئا و بێی کوردی، فەرهەنگی مێژوویی، ڕەوەندان، پەڕۆناسی کوردیناسی، هەوای مەیلانە، یاری کوردی، بەرەو ئازادی، ئا و بێی بەربەرەکانی نەتەوەی کورد، هەیاران چریکەی هەڵۆ و کەوی، نەورۆزنامە، واژەنامەی ئەیووبیان، کوردینە پێکەوە بۆ پێشەوە مەپرینگینەوە، کوردی هونەرە، هەتەڵەی کوردی، لێکۆڵینەوەی زمان و وێژەی کوردی، بەهاری کوردی، چریکەی مەم و زین، چریکەی خەج و سیامەند، ڕێزمانی

کوردی، چریکەی لاس و کەژاڵ، سەلاحەدینی ئەیووبی، ڕەگەزی سەفەوی، ڕۆژئەژمێری کوردی، پەنادانی ئاسکەکان، میرمیرێن، هەڵۆی ئارارات، کوڵکە زێڕینە، چەپۆک، دیوانی وەفایی، کوردستان.

نووسینەکانی مامۆستا ئەیووبیان بەیەکێ لەو کارنامە گرنگ و سەرەکییانە دادەنرێت کە لە چرۆکردن و گەشەکردنی بیری نەتەوایەتی و کوردایەتیدا زۆر گرنگ بوون. ئەو لە ماوەی تەمەنیا توانیویەتی گەلێ لە لاوان پێ بگەینێ و بیانخاتە ڕێی پەراکردنی زمان و وێژەی کوردی و ئەوان هان بدا کە لە ڕێی فەرهەنگ و وێژە و زانستدا هەر لە هەوڵ و تێکۆشاندا بن و ئێستاش هەر لەسەر ئەو ڕێ و شوێنەدا دەڕوا و هەر خەریکی پەڕاو و خزمەتی وێژە و کەلەپووری نەتەوایەتییە، ئەمەش پارچە پەخشانێکی ئەم نووسەرەمان کە دەڵێ:

دەگێڕنەوە ڕێوییەکی تەژی بەدفەڕی دەشتەکی لەو نیوە نیوانەی بەری شاماتی پەیدا بوو، بەدڵ وە خۆیان نەدەگرت، بەقسەی خۆی لە بەری گەرمێنیرا هاتبوو. بەڵا وابزانم درۆی دەکرد، ئەو ڕێوییە زۆری زیانی کردبوو ماڵ نەبوو کە کەڵەبابێک، فرووجێک یا مریشکێکی لێ نەخواردبێ، هەمیشە خەریکی مڵ و مۆیە و دزی و ڕفەک و زیانکاری بوو ڕۆژانە هەچی بێچوو قاز و قاز و مراوی و قەلەموونەی دەگیر کەوتبا دەیڕفاند و دەیخوارد، شەوانە دەڵێ کوێخا و ڕدێن سپی و مەلای ئاوەدانی گوتیان ئەو ڕێوییە بەدفەڕە چۆن زۆری زیانی کردووە هەروا سادە نایکوژین.

دەڵێ هێنایان ڕێوییان دە نەوتی هەڵکێشا، ڕێوی بۆرە بەتەواوی شەتل و شلال بوو، جا ئەو جار سەلکە بزۆتێکیان دە کلکی خست و ئاوریان تێ بەردا و بەرەڵڵایان کرد و سەگ و تولەی ئاوەدانییان تێ بەردا و منداڵە وردکە وەبەر بەردانیان دا.

دەڵێ ڕێوییە جینگڵێکی لێ دا و دەرپەڕی، بۆی دەرچوو وەک تیری سەختە کەوانی دە خۆیەوە نووسا و خۆی گەیاندە نێو گەنم و جۆی و سەرخەرمانان و کێشەی گیا و وێنجەی... سیغارکێشێکی پێ نەچوو تەواوی وڵاتی بەخۆیەوە سووتاند.

دەڵێ ڕێوی بۆرەی گیان سەخت لەو بارەژدا ڕوونەکەوت، گورجێکی خۆی گەیاندە کانیاوی بەری چیایە و خۆی تێ هاوێژت، هەرچەند ئەو ئاورەی تێی بەربوو کوژاوە بەڵا هەر لەنێو کانیاوەکەیدا تۆپی.

یارە دەڵێ: ئەو کارەساتە وێستاش لەنێو کوردان بووەتە پەند و پینە و بەگولواژە دەیگێڕنەوە و لەمەڕ کەسێکی کە بەدفەڕی و زیانی دەکا پێی دەڵێن: ئەو دەود بابە لێمان بووەتە «کلکە نەوتینە».

***

هەی کاکی دەروێشی بیروەند مار پێی لە کلکی نەنێن پێوە نادا، ژووشک دوژمنی مارییە، گۆشتی ماری زۆر پێ خۆشە بەلاّ لە ڕاوکردنی ماریدا، تێبینیی هەیە، بەبێچووانی دەڵێ بێچوو ماری مەکوژن تا ئەویش هێلکەی مە نەخوا، لە ڕاویدا ماری لە ئاو مەکەن گوناحە، دەڵێن مار جوانپەرستە و بێچوولەی داعبایان و منداڵی ساوای خۆش دەوێ؟! ئەمن قەتم مار نەکوژتوە فیتۆی ماریم پێ خۆشە هێندێک ماری وەک زنجیری و سوجچە سوور و ڕەشە ماری سەر ئاوێم پێ جوانە، کە لە لکی داران دەهاڵێ و چاو چڕ دادەگری و وەک پیاوی بیروەند دە بیروە دەچێ! هیچ وە داعبایەکی زیانیدەر و بەدکار ناچێ!! بەلاّ بیستوومە هێندێک مار پێوە دەدەن.

وا سەخت پێوە دەدەن کە ئینسان و یا ڕێوێکی کە مار پێیەوە بدا دەیکوژی، زۆر کەم وایە بتوانی بژی، زۆر ماریش هەن کە پێوە نادەن!

جا دەڵێ لاو کە ڕێوی، سەری کوێستانی ڕووی دە کاکی لێڕەواری کرد و گوتی هەی کاکی ژیری بیروەند جا نازانم ئەتو چ لەو مارەی بکەی چاکە بەلاّ ئەوەندەت پێ بڵێم چاکە هەر چاکە جا ئەو جار ئەتۆ بۆ خۆت دەزانی؛ وە بگرم ئەتو زۆر بیروەند و چازانی کە لە هەموو کەسوکارت بڕیوەتەوە لەو لێڕەوارەیدا لە داعبایان کەوتوویە پرسە پرسی؟

مامۆستا ئەیووبیان لە هۆنینەوەی هۆنراویشدا دەستێکی باڵای هەیە و هۆنراوەکانی بەزمانێکی سادە هۆنیونەتەوە کە گەلێ شیرین و پاراون. ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی ئەو کە لە سەردێڕی «کەو» هۆنیوەتەوە، وەکو دەڵێ:

## کەو

کاکە کەوی لە بەندەنی
دیتم خۆش پێ دەکەنی
بەچی؟ بەکێ؟ بەمن و تۆ
بەژینی وا بێ تار و پۆ
دەیگوت ئێوە لە گەرمێن
لە کوێستانڕا بۆ دەخوێن
لام وایە من بەبیروڕام
گەرمێن و کوێستانی گەڕام
نەمدی کەس تەنیا سەرکەوێ
یا بەدڵێکی خۆش وەرکەوێ

هەر کەس بەتەنیا مایەوە
داویان لە ڕێگە نایەوە
بەدندۆک پێوە بوو وەک کەو
ڕۆژی ڕووناکی بوو بەشەو
یەکێ لێرە یەکێ لەوێ
ڕێک کەونەوە لە من و کەوێ
دەستێک تەنیا دەنگی نایا
منداڵێک بۆی ناکرێ کایە
بەدوو دەست چەپڵە لێ دەدرێ
بەدوو منداڵ گەمە دەکرێ
بەس بەش بەش و لێک پساو بن
بەس بێ بیر و بەش خوراوبن
ئەو نیشتمانە پیرۆزە
هەموو کاتێکی نەورۆزە
شەوی ڕۆژە ڕۆژی نەورۆزە
جێ شانازیی زۆرە بۆ هۆزە
وەک بەهەشت خەملیوە بەگوڵ
نەک دڵێک بەڵکو هەزار دڵ
ئاو بردەی ئاوو خاکییە
گیرۆدەی خاکی پاکییە
بەڵام بەداخەوە هەروا
لە ژێر چەنگی داگیرکەرا
وێرانەیە و لاڕووخاوە
ڕێک چاڵ و چۆڵە و کەلاوە
شەوی مەینەت ڕۆژی شەوە
بۆ گەل و هۆز و نەتەوە
هیوا و ئاوات و تاسەیە
ئاخ و داخ و هەناسەیە

دەس بەچاوی خەوا بێنن
ڕاکەن دوژمن ڕاپەڕێنن
کاتی ڕاپەڕینە هەستن
دەست و پێی بەرهەڵست بەستن
با بەس بەستن دەست و پێتان
با بەس بگرن ڕێتان لێتان
ئامۆژگاریم لە گوێ بگرن:
نەتەوی بەکڵاوی دەگرن
لێک بن ڕێک بن دەس بەدەس دەن
شایی بەخۆ حەز لە هەست کەن
گەر هەست و قەست و مەبەستتان
ڕێک بەخت کەن بۆ کوردستان
ئەو جار دەژین بەسەربەستی
سەردەکەون بەتەڕدەستی
لە سارای سەوزی ئازادی
دەکەونە خۆشی و شادی

سەرچاوەکان

١- چریکەی مەم و زین - نووسراوی عوبەیدوڵلای ئەیووبیان - تەورێز، ١٣٤٠.
٢- چریکەی خەج و سیامەند - نووسینی عوبەیدوڵلای ئەیووبیان - تەورێز، ١٣٣٥.
٣- هەڵسووڕانەوە - نووسراوی عوبەیدوڵلای ئەیووبیان - مەهاباد، ١٣٥٩.
٤- کوردی هونەرە - نووسینی عوبەیدوڵلای ئەیووبیان - تاران، ١٣٤٤.
٥- هەتەڵەی کوردی - نووسراوی عوبەیدوڵلای ئەیووبیان - مەهاباد، ١٣٤١.
٦- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەعوبەیدوڵلای ئەیووبیان.

## کەمال جەلال غەریب

١٣٤٩ - ...

کەمال کوڕی جەلال لە ساڵی ١٣٤٩ی کۆچی لە سلێمانیدا لە دایک بووە و دەورەی سەرەتایی و ناوەندیی هەر لەو شارەدا تەواو کردووە و پاشان چووەتە کۆلێجی پەروەردە لە بەغدا و بەشی زانیارییە سروشتییەکانی کیمیای تەواو کردووە و لە پاشا لە شاری مووسڵ و بەسرا و سلێمانی بووەتە مامۆستا و ماوەیەکیش بووەتە ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاریی کورد و ئێستا سەرپەرشتیاری پەروەردەییە لە زانیارییە سروشتییەکانی هەولێردا.

کەمال جەلال بەیەکێ لە وێژەوانان و نووسەرانی هەرە بەرزی کورد دێتە ژمار و تا ئێستا چەندین بەرگ پەڕتووکی بەزمانەکانی کوردی و عەرەبی نووسیون کە هەندێکیان بریتین لە: ئەتۆم لە مێژوودا، بیست پیشەسازیی کیمیاگەری، یەکەم ئادەمیزاد کە پێی نایە سەر ڕووی مانگ، فەرهەنگی زانیاری بەعەرەبی و کوردی، فەرهەنگی زانیاری بەعەرەبی و ئینگلیزی و کوردی، فەرهەنگی زانیاریی وێنەدار، کیمیا.

مامۆستا کەمال جەلال لە ماوەی تەمەنیا گەلێ ڕاژەی زمان و زاراوەکانی کوردیی کردووە و لەم بارەوە چەند فەرهەنگێکی زانیاریی نووسیون کە ئێستاش زۆربەی خوێندکاران و مامۆستایان و نووسەران و وێژەوانان کەڵکین لێ وەردەگرن، چونکە ئەو وشانەی کە لە فەرهەنگەکانیدا هێناونی پەیوەندییان بەگەلی کوردەوە هەیە و ئێستاش لە ئاخەفتن و دوواندا بەکاردەبرێن، بۆ وێنە خۆی لە پێشەکیی بەرگی یەکەمی فەرهەنگەکەیدا دەڵێ:

ماوەی بیست ساڵ دەبێت کە پیشەی مامۆستایەتیم بۆ خۆم هەڵبژاردووە، ئەو پیشەیەی کە هەمیشە هەر شانازیی پێوە دەکەم، لەو ماوەیەدا لە هەموو پۆلەکانی قوتابخانە ناوەندی و ئامادەییەکاندا وانەی زانیاریی هەمەجۆرەم وتووەتەوە، وەکو: سەرەتای زانیاری، کیمیا، زیندەوەرەکان، تەندروستی، فیزیا و... هتد. بەزۆری لە ناوچەی کوردەواریدا زۆرجار تووشی گیروگرفت هاتووم لەبەرئەوەی کە قوتابییەکانم بەباشی لە وانەکان تێ نەدەگەیشتن، چونکە وانەکان بەزمانی زگماکی خۆیان نەبوون، وە بۆ ئەوە ناچار دەبووم کە بگەڕێم بەشوێن زاراوەی زانستیدا.

لەبەرئەوەی تەماشای زۆربەی ئەو فەرهەنگانەم کرد کە پەیوەندییان هەبوو بەزمانی عەرەبی یان کوردییەوە کە لەوە پێش چاپ کرابوون، هەروەها پرسیشم بە ڕۆشنبیران و

خاوەن پیشە و پسپۆڕەکان دەکرد، لە ئەنجامدا نیمچە گەنجینەیەکم بۆ خۆم خست.

جا لەبەرئەوە بڕیارم دا کە ئەو کۆمەڵە زاراوە زانستییانە بخەمە شێوەی فەرهەنگێکەوە کەوا لە بەردەستاندایە. وشە و زاراوەی عەرەبییەکانم بەپێی جۆری زانیارییەکان جیاکردەوە و هەریەکە نیشانەی خۆیم بۆ داناوە بۆ نموونە: کیمیا، فیزیا و... هتد.

ئەگەر وشە و زاراوەی زانستیی کوردی هەبووبن بەرامبەریان دامناون، ئەگەر نەبووبن، یان وەرم گێڕاونەتە سەر کوردی بەپێی بیروڕای خۆم، یان بەچەند دێڕێک ڕوونم کردوونەتەوە، یان وشە و زاراوە لاتینییەکانم بۆ داناونەتەوە و خستوومنەتە ناو دوو کەوانەوە، من وای دانانێم کە ئەم کردارەم لە هەموو ڕوویەکەوە تەواوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، چونکە کرداری هیچ مرۆڤێک بەتەنیا، تەواو نییە، وە لە کەموکوڕی بەدەر نییە، جگە لەوەی کە دەریای زانیاری هەرگیز لە بن نایێت.

سەرچاوەکان

١- فەرهەنگی زانیاری - دانراوی کەمال جەلال غەریب - سلێمانی، ١٩٧٤.
٢- فەرهەنگی زانیاریی وێنەدار - نووسینی کەمال جەلال غەریب - بەغدا، ١٩٧٥.

## د. مارف خەزنەدار

١٣٥٠ - ...

مارف، کوڕی قادر ئاغای خەزنەدار لە ساڵی ١٣٥٠ی کۆچی لە هەولێر لە دایک بووە و دەوری سەرەتایی و ناوەندیی لە هەولێر و کەرکووک تەواو کردووە و پاشان لە دێی عەوێنەی دەشتی هەولێر بووەتە مامۆستا و ئەوسا چووەتە بەغدا و خوێندنی زمان و وێژەی عەرەبیی لە کۆلێجی ئادابی زانکۆی بەغدادا تەواو کردووە و لە پاشا ڕۆیشتووەتە سۆڤیەت و لە زانکۆی لیننگرادا دوکتۆرای وێژەی کوردیی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بەغدا و لە زانکۆی بەغدا بووەتە مامۆستا و خەریکی وانەوتنەوە بووە.

د. مارف بەیەکێ لە نووسەرانێ کورد دێتە ئەژمار و گەلێ ڕاژەی زمان و وێژەی کوردیی کردووە و تا ئێستا چەندین پەڕتووکی سەبارەت بەوێژە و زمانی کوردی نووسیون کە هەندێکیان بریتین لە: دەستووری زمانی عەرەبی بەکوردی، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، عەبدوڵلا بەگی میسباح، کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، نالی لە دەفتەری نەمریدا، بووکە شووشە. هەروەها گەلێ وتاری بەنرخیشی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بەچاپ گەیاندوون و شارەزایی زمانەکانی کوردی و فارسی و

عەرەبی و تورکی و ڕووسی و ئینگلیزییە و گەلێ نامیلکەشی بەو زمانانە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

د. مارف لە نووسینی چیرۆکیشدا دەستێکی باڵای هەیە و تا ئێستا چەند چیرۆکی بەناوی ئەڵمان کوردی و بووکە شووشە نووسیوە کە قارەمانی چیرۆکەکانی لە کۆمەڵگای کوردەوارییەوە هەڵبژاردووە و دەرد و ڕەنجی ئەوانی پیشان داوە و مەبەستی ئەوە بووە کە ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەواری دەربخا. ئەوا لێرەدا پارچە پەخشانێکی ئەم نووسەرە لە سەردێڕی مارەیی فرشتەی بەهەشت دێنین کە دەڵێ:

ئێواران لە پاش نوێژی عەسر دەستەیەک ڕیش سپی و مەلا و فەقێیانی قەرەداغ لە بناری گردێک کۆڕیان دەبەست، لە لایەکەوە مزگەوتیان لێوە دیار بوو، لە دووریشەوە ڕێگەی کانیی ژنان دەبینرا.

فەقێ خدری شارەزووری وەکو هەموو جارێک لەو کۆڕەدا بەشدار بوو، چونکە ماوەی نێوان نوێژی عەسر و بانگی شێوان یا لە کۆبوونەوەکانی مزگەوتەکەی خۆی دەبوو، یا دەچووە کۆڕەکانی لای گردەکە.

لە کۆبوونەوەیەکی دوو سێ ڕۆژ لەمەوبەردا بەڕاستی دڵی فەقێ خدریان شکاند بوو، مەسەلە باس و خواسی حەبیبە و دڵ و دڵداری بوو، یەکێک وتبووی:

– ئەوا باوکی حەبیبە ئەمری خوای کرد، بەڵام تۆ چی دەکەی بەمارەیی؟

یەکێکی تر هەڵی دابوویێ:

– باشە تۆ ئەوەندە حەبیبەت خۆش دەوێ، ئەگەر بیهێنی لەسەر لباد دەینوێنی؟

سێیەم، شەکری شکاندبوو:

– باوکم دەبێ تۆ ماڵت ببێ ئەوجا بیر لە ژنهێنان بکەیەوە.

فەقێ خدر بەڕێکوپێکی و زمانێکی پاراو نەیتوانیبوو وەڵامی ئەم هەموو پرسیارانە بداتەوە و بیروڕای خۆی بەخەڵکەکە بسەلمێنێ، چونکە پرسیارەکان بۆ سەردەمێکی وەکو ئەو کاتە ڕاست و ماقووڵ بوون، دیارە کەسیش نییە ئەو هەستە گیانییانەی فەقێ خدر بەپوولێک بکڕێ، بەتایبەتی ئەگەر بەقسە بیگێڕێتەوە نەک بەشیعر، لەبەرئەوە بوو هەموو ڕووداوێکی گرنگ ئەگەر کاری لە فەقێ خدر بکردایە مانا و وێنە و خەیاڵ لە مێشکیدا دەکولا، بەقسە نەیدەتوانی دەریبڕێ، لەبەرئەوە بوو وەڵامی دوا دەخست بۆ ئەوەی ئەم تاقیکردنەوە زیندووە ببێ بەپارچە شیعرێک و لە دوایی بڵاو بکرێتەوە. خەڵکی زۆر سەیر و نەفامن، بەفەقێ خدر دەڵێن:

کابرا تۆ بابایەکی شارەزووری لە داری دونیادا هیچت نییە لە پارچە حەسیرێک زیاتر لە

کونجێکی حوجرەی مزگەوت، باوکی حەبیبە تا مرد بەوە ڕازی نەبوو کە کچی خۆی بەتۆ بدا، لەمەدا ناهەقی نەبوو، ئێستاش ڕاستە تۆ حەبیبەت دەوێ، حەبیبەش تۆی دەوێ، بەڵام ئایا ئەم حەبیبەیە ژوورێک و دۆشەگ و سەرینێک و ئاگردان و قاپوقاچاغێک و تەنوور و دیزە و گۆزەیەک و کەوا و کراسێکی ناوێ؟!.

هەیهوو! هەیهوو! ئەم خەڵکە لە هیچ ناگەن، ژووری چی و ئاگردان و قاپوقاچاغی چی؟ ئەمە مەسەلەی دڵداری و خۆشەویستییە!

ئەو ئێوارەیە فەقێ خدر گوشاد و دڵشاد و دەم بەپێکەنین و زەردەخەنە بوو، وای دەزانی تۆڵەی خۆی لە قسەکانی ئەو خەڵکە کردووەتەوە بەو پێنج دێڕە غەزەلەی کە لە باغەڵیەتی. پرسیاری هەرە درشتی خەڵکەکە ئەوە بوو: ئەوا حەبیبە بوو بەحەلاڵت بەڵام لە کوێی دادەنێی؟

فەقێ خدر سڵاوی لە کۆڕەکە کرد و وەکو هەموو جارێک دانیشت و بەشداریی گفتوگۆ و دەمەتەقێی کرد، دیار بوو خەڵکەکە قسەی دانیشتنەکەی پێشوویان لەبیرچووبووەوە لە بابەت دڵداریی حەبیبە و فەقێ خدرەوە، نەیاندەزانی مێشک و دەروونی نالیی شاعیر هەر خەریکی وەڵامی ئەم پرسیارە بێ مانایە بوو: ئەوا حەبیبەت هێنا بەڵام لە کوێی دادەنێی؟

فەقێ خدر خودا خودای ئەوەی بوو، باس بێتەوە سەر حەبیبە، بەڵام هیوایەکی بێ سوود بوو و شەپۆلی قسە لە زەریای بێ پایانی جیهانی حەبیبەی خۆشەویست دوور دەکەوتەوە، هەرچۆنێ بێ لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ خەڵکەکە هەر بێنەوە سەر شیعرەکانی نالی، کە باس لە شیعری نالی بکرێ، دەبێ باسی حەبیبەش بکرێ، کۆڕێک نالیی تێدا بێ، چۆن دەبێ باسی حەبیبەی لێ نەکرێ!

فەقێ خدر شیعری خۆی بۆ خەڵکی نەدەخوێندەوە، دوور نییە لەسەر ئەو باوەڕە بووبێ کە کەم کەس هەیە لە شیعرەکانی بگەن، هەر لەبەرئەوەش بوو هەموو ئەو کەسانەی فەقێ خدریان دەناسی داوای شیعر خوێندنەوەیان لێ نەدەکرد، جا یا لەبەرئەوەی فەقێ خدر حەزی بەمە نەدەکرد، وە یاخود لەبەرئەوەی خەڵکەکە لە شیعرەکان نەدەگەیشتن.

ئەو ڕۆژە فەقێ خدر ئامادە بوو شیعریان بۆ بخوێنێتەوە بۆ ئەوەی وەڵامی قسەکانی ئەو ڕۆژەیان بداتەوە کە دەیانوت: ئەوا حەبیبەت هێنا بەڵام لە کوێی دادەنێی؟

بەلای خەڵکەوە ڕووداوێکی سەیر بوو کە فەقێ خدر پارچە کاغەزێک یا دەفتەری بەیازێک لە باغەڵی دەربێنێ و شیعریان بۆ بخوێنێتەوە:

جەنابی وەک جینان کردم بەمەئوا

حەبیبەی ماڵیاوا ماڵی ئاوا

جـەلالی بێ نیکاحی حـووری عـینم
بەجـووتێ نازیری شـەرع و فـەتاوا
زەفـافـەتگاهی پـەردەی ئالی چاوم
مـوبارەک حـەجلەیە بۆ بووک و زاوا
سەداق و ڕوونەما و وەسڵی شاهید
لەگـەڵ شـاییکەران بـێ دەنگ و داوا
ویسالی بێ کەم و کەیفی حوزووری
لە (نالی) گـەر دەپرسـی یەعنـی ئاوا

هەندێ لە دانیشتووان هیچی لێ تێ نەگەیشتن و تەقەی سەریان دەهات، هی واش هەبوو وای دەزانی تێی گـەیشـتـووە، هەندێکیش لەوانەیە تا ڕادەیەک لە مـەبەسـەکانی شـاعـیـر گەیشتبن.

نەخوێندەوارانی سەردەمی نالی ناهەقیان نەبوو کە لەم شیعرە نەگەن، چونکە بـەڕاستی بۆ نەخـوێندەوار نەوتراوە، بەڵام بۆچ خـوێندەواری هاوچەرخی ئێمـە لەم نـالییـە ناگـەن؟ پێم وایە ئەمانەش ناهەقیان نییە، چونکە ئەو هەوایەی کە نالی شیعری پێ وتووە هی سەردەمی خـۆیەتی و ئێسـتـا باوی نەمـاوە. دەبێ ئەوەش بزانرێ کـە بۆ سـەردەمی خـۆشـی لە چاو شـیـعـری شـاعـیـرانی تر هەر قـورس بووە، خـوێندەواری کـوردیش هەلێکی وای دەست نەکـەوتووە وەکو خـوێندەواری نەتـەوەکانی تر، فـێری هـەوای ئەو سـەردەمـە کۆنـە ببێ، بۆ ئەوەی چێژ و زەوق لەم جیهانە هونەرییە نەمرەی نالی وەربگرێ. نامەوێ مەتحی ئێمەمانان «خـۆمـان» بکەم لەم لایەنەوە کـە لە نالی دەگـەین چونکە کـەرەسـتـە لە ژێر دەسـتی ئێـمـەش نەبووە، یا ڕاسـتـتر هەر کەرەسـە نەبووە! بەڵام باوەڕ ناکـەم بەرهەمی وا هەبێ لە کلاسیکی فارس و عەرەب و تورک و نەتەوەی تری خاوەن غەزەل لە شیعردا بەداخراوی مابێتەوە.

ئەیسە! با واز لەمە بهێنین و زیاتر برینمان نەکوڵێتەوە و لە دونیای نالی نەچینە دەرەوە، چونکە خۆی وتوویەتی نابێ مـانای خراپ لە شیـعرەکانی بدەین، دەنا لە گۆڕیشدا دڵی هەر دەڕەنجێ!

نالی دەڵێ: حـەبیبـە دڵی منی هـەڵبژارد و کـردی بەمـاڵ و جـێنشین و مـەڵبـەند و هێلانەی خـۆی، دیارە کە بچێتـە ناو دڵمـەوە دەیکا بەبەهەشت، کە دڵم ببێ بەبەهەشت خـۆشی دەبێ بەحووری، ژن ئەگـەر لە بەهەشتدا بێ دەبێ بەحووری... یاخـودا مـالی حـەبیبە بۆ ئەم کارەی ئاوەدان بێ «ماڵی ئاوا» دەشێ ئەمانە بن.

١- یەکەمـیان «ماڵیاوا» بێ کـە دەڵێن ناوی ئەو گوندەیە کە لە نزیک قەرەداغەوەیە و حەبیبە

خەڵکی ئەوێیە و لەوێش لە دایک بووە، دیارە ئەویتریشیان «ماڵی ئاوەدان بێ»یە، هەندێ کەس دەڵێن ناوی گوندی حەبیبە «ماڵیاوا» نەبووە بەڵکو «ئالیاوا» بووە، هی تریش دەڵێن «سالیاوا» بووە، هەر کامەیەکیان بێ، گرنگ نییە چونکە شیعرەکەی پێ لەنگ نابێ، بەڵام «ماڵیاوا» بێ، بۆ ئێمە باشترە، چونکە جیناسێکی تەواو دروست دەکا.

٢- ماڵی حەبیبە ئاوەدان بێ بۆ تەئکید دووبارە کراوەتەوە.

٣- یەکێک لەو «ماڵی ئاوا»یانە دەبێ پێوەندیی بەئەندامی مێیینەی حەبیبەوە بێ. لە کوردیدا «ماڵ» بەم مانایە هاتووە.

واتە ئەندامی ناسک و جوانی مێیینەی حەبیبە با هەر ئاوەدان بێ، با کراوە و والا بێ بۆ لەززەت و زەوق و خۆشی. ئەمە لە نالییەوە دوور نییە، وەسفی ئەندامی مەستوورەی ئەوەندە بەرزە لە ڕووی هونەرییەوە باوەڕ ناکەم هیچ شاعیرێک دەرکی پێ کردبێ، ئەم ژنە ئەگەر جوانیش نەبووبێ نالی وای لێ کردووە پیاو خەونی پێوە ببینێ.

نالی دەڵێ کە ناو دڵی من ببێ بەبەهەشت و حەبیبە بەحووری هێن دیارە دەبێ بەحەلاڵم، واتە ژنی شەرعیی منە با بێ نیکاح بێ و مارە نەکرا بێ، چونکە حووریی بەهەشت مارە ناکرێن و حەلاڵی پیاویشن، یاخود من حەلاڵی حەبیبە بم، واتە من مێردی حەلاڵی حەبیبەم کە حووری عینە.

لە کوێ حەبیبەی بووک دەڕازێننەوە؟ بۆ کوێ بەبووکی دەبەن؟ کامە ژوور و پەردەی بۆ ئامادە کراوە؟

نالی دەڵێ: قەپێلکی چاوم ژووری ڕازاوەیە بۆ بووک و زاوا، وە ئەو تارماییە سوورە خوێناوییەی لە ناو چاومدایە پەردەی بووک و زاوایە. مارەیی و دیاری و شاباش و بەخشیش و ئاهەنگ و زەماوەندیش هەیە، بەڵام کپ و بێ دەنگە. سەرانسەری ئەم غەزەلە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە لە ناو جیهانێکی بەرزی شیعری ئەو سەردەمەدا دەرچووە، بەڵام وێنەی کوردانەی ڕەسەنی ئەوتۆی تێدایە نالی دەکا بەکوردێکی بێ گەرد.

لەم دوو دێڕە شیعرەدا، لە نیوەی دێڕی یەکەمیاندا دەڵێ:

سەداق و ڕوونەما و وەسڵی شاهید

و

ویساڵی بێ کەم و کەیفی حوزووری

ئەم وێنانە گەلێ گشتین، زۆرتریش ڕەسەنن، بەڵام شاعیر هەر لەم هونەرە گشتییەوە چووە بۆ وێنەی سادەی میللی کوردانەی وا بەرزی وەکو:

لەگەڵ شاییکەران بێ دەنگ و داوا

و

لە (نالی) گەر دەپرسی یەعنی ئاوا

پیاو نازانێ کامەیان ئەویتری بەرز کردووەتەوە، وێنە گشتییە ڕەسەنەکە، یا وێنە کوردییە سادەکە؟!

لە لای خەڵکی دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتوو، ژیان بریتییە لە پارە و ماڵ و جلوبەرگی جوان و خواردەمەنیی بەتام، ئنجا خشڵ و زێڕ و جەواهیر و بەرگی مەخمەڵ و ئاوریشم و سەرا و پەردەی مینابەند، بەڵام هێشتا بووکیش دیاری نەکراوە! بووکی نالی لەمانە نییە، پێوەندیی بەجیهانی مادد ییەوە نییە. لەبەرئەوەیە ئەم پرسیارە بێ مانایە: ئەوا حەبیبەت هێنا، بەڵام لە کوێی دادەنێی؟ دەبێ بەنالی نەوترێ، چونکە جێی حەبیبە ناخی دڵ و دەروونی نالی و قەپێلکی چاویەتی!

هەموو ئەو بووک و زاوایانە دەمرن، بەڵام ئەم قسانەی بۆ «بووک و زاوایەتیی حەبیبە و نالی» هۆنراونەتەوە نەمرن و هەتا هەتایە دەمێنن.

سەرچاوەکان


١- لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە – نووسینی د. مارف خەزنەدار – بەغدا، ١٩٨٤.

٢- نالی لە دەفتەری نەمریدا – نووسینی د. مارف خەزنەدار – بەغدا، ١٩٨١.

٣- کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا – نووسراوی د. مارف خەزنەدار – بەغدا، ١٩٦٢.


## د. جەمال نەبەز

١٣٥٤ – ...

جەمال، کوڕی تۆفیق کە نازناوی زەردەشت و نەبەزە، لە ساڵی ١٣٥٤ی کۆچی لە شاری سلێمانیدا لە دایک بووە و دەورەی سەرەتایی و ناوەندیی هەر لەو شارەدا خوێندووە و لە پاشا چووەتە بەغدا و لە ڕشتەی وێژەدا لیسانسی وەرگرتووە و ئەوسا ماوەیەک لە قوتابخانەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکووک خەریکی وانە وتنەوە بووە و پاشان ڕۆیشتووەتە ئەورووپا و لە زانکۆی بەرلیندا خەریکی خوێندن بووە تا دوکتۆرای وەرگرتووە و ئەوسا هەر لەوێدا خەریکی وانە وتنەوە بووە و ئێستاش هەر لەوێدایە.

مامۆستا نەبەز بەیەکێ لە زانایان و وێژەوانانی هەرە بەرزی کورد دێتە ژمار و لە ماوەی تەمەنیدا گەلێ پەڕاو و نامیلکەی نووسیون کە هەندێکیان بریتین لە: چیرۆکی گەرداوەکە،

چیرۆکی پاڵتۆ، سەرەتای جەبر، سەیرە لە کۆیە، خوێندەواری بەزمانی کوردی، نووسینی کوردی بەلاتینی، یاریکردن بەئاگر، بۆچی خراینە پشتگوێ، وەرگێڕان هونەرە، هەندێک زاراوەی زانستی، سەرەتای میکانیک و خۆماڵەکانی مادە، کوردایەتی، دۆزی کورد، زمانی نووسینی کوردی، پەندی پێشینیان، ئەفسانە و چیرۆکی کوردی، کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا، ئێزیدییەکان، میتۆلۆژیای کورد، چیرۆکی لالۆ کەریم، کوردستان و شۆڕشەکەی.

مامۆستا جەمال نەبەز چەند چیرۆکێکی نووسیوون کە لە ناو ئەوانەدا دەتوانین لە چیرۆکی لالۆ کەریم ناو ببەین کە زۆر بەنرخ و بایەدارە. مامۆستا نەبەز لەم چیرۆکەدا ژیانی جووتیاران و وەرزێرانی ئەو سەردەمەمان دەخاتە پێش چاو کە چۆن ئەو ڕەشوڕووتانە کەوتوونەتە ژێر باری زۆر و ستەمی دەرەبەگ و ئاغەکانەوە کە دەیانەوێ زەویوزاری خەڵک زەوت کەن و تەنانەت مووچەخۆری دەوڵەتیش یارمەتییان دەدا. لەم چیرۆکەدا پیاوێک بەناوی کاکڵ ئاغا دەیەوێ زەویوزاری جووتیارێک زەوت بکا و بۆ ئەم مەبەستەش جووتیارێکی پیر بەناوی لالۆ کەریم کە لە دێیەکی ترەوە هاتبوو، لەوێدا نیشتەجێ بووبوو، لەبەرئەوەی خەڵکی گوندەکە ئەویان بەبێگانە دادەنا، چونکە لە قەوم و قیلەی ئەوان نەبوو، دەکاتە شایەت بۆ ئەوەی دەست بەسەر زەویوزاری ئەو جووتیارە درێژ بکاتەوە، بەڵام لالۆ کەریم کە پیاوێکی دیندار و پارێزگار بوو، مل بەم کارە نادا و ئاغەش نۆکەرەکانی هان دەدا کە لالۆ کەریم ئازار بدەن و لە دێ دەریکەن کەچی جووتیارەکانی تر لە ترسی ئاغە و ملهوڕەکانی بێ دەنگ دەبن و شتێ ناڵێن، مامۆستای قوتابخانەی دێیەکەش کە گەلێ خزمەتی کردووەتە خەڵکەکە کەچی لەسەر لالۆ کەریم ناکاتەوە و داواشی لێ دەکا کە دەستی ئاغە ماچ کاتەوە تا لە دێیەکە دەری نەکا، بەڵام لالۆ کەریم لە ڕێی خوا دەرناچێ و ئەوەی کە ڕاست بێ دەیڵێ و ئاغەکە کە ئەمە دەبیسێ نۆکەرەکانی هان دەدا کە لالۆ کەریم بکوژن و ئەوانیش هەتا حەزکەی لێی دەدەن، بەجۆرێ کە تەواوی لەشی دەکەنە خوێن و ئیتر لالۆ بەکۆڵە پشتییەکەیەوە ملی ڕێی گرت و لە دێ دەرچوو خەڵکی دێیەکەش بەسەر گوێسوانەکانەوە چاویان بڕییە لالۆ هەتا وردە وردە لە چاو گوم بوو.

مامۆستا نەبەز لەم چیرۆکەدا زۆر و ستەمی چینی دەرەبەگ و بێ دەسەڵاتیی جووتیاران و وەرزێرانی وڵاتەکەمان پیشان دەدا و لە ڕاستەقینەدا ئەم چیرۆکە بریتییە لە زۆرانبازی و ململانێی نێوان بەشخوراو و بەشخۆر، وە یا ستەم لێکراو و ستەمکار کە هەمووی بەپێی ژیانی ڕاستەقینەی کوردەواری نووسیویە و ئەوا بەشێکی ئەم چیرۆکە دێنین کە دەڵێ:

«بەیانی گزنگی هەتاو کەوتن، هەرچی پیاوی ناوپیاوان و کوڕە کوڕەی ئاواییەکە هەبوو،

هەموو ڕوویان کردە مزگەوتی دێیەکە و لەسەر سەکۆ پانەکەی کۆڕێکیان بەست و زۆری پێ نەچوو کاکلاغا بەخۆی و دە دوانزە دەستوپێوەندی پڕ چەک و دوو ئەفەنییەکەی شەوێوە خۆیان کرد بەمزگەوتەکەدا، مەلا قادری ڕەشەخێڵ کە مەلای مزگەوتەکە بوو و، بەخزمایەتیش دەگەیشتە خێزانەکەی ئاغا، لەو کاتەدا لە هەیوانەکە قورئانی بەچەند سوختەیەک ڕەوان دەکرد، کە چاوی بەئاغا و ئەفەنییەکان کەوت هەر ئەوەندەی پێ کرا فەقێکانی بەجێ هێشت و پەلە پەلە فەقیانەکەی هەڵکرد و بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە ئاغا و میوانەکان و هەر لە ڕێوە یەکێ سێ چوار بەخێرهاتنی گەرمی کردن و وتی: وەڵڵا لازمە جەنابتان ئەعفای تەقسیراتم بفەرموون کە شەوی مازی نائل نەبووم بەتەرحیببکردنتان، واستەش ئەوە بوو و بەعزێ ئەشخاس لە ئاوایی کوێرەدێ وەشدی رحالیان کردبوو و قدوومیان هێنا بوو بۆ تەوجیهی چەند سوئالێکی شەرع و فەتوا، منیش موفەتەر بووم ڕەغبەتیان تەحقیق بکەم، وە ئیللا خوای موتەعال عالەمی سرولخفیاتە، مەسئەلە دیانەت نەبووایە، ئەوزاع هەر لۆنێک بووایە موشەرەف دەبووم بەدیدارتان، ئەوەی وت و ئەمجار بانگی کردە فەقێیەکانی بۆ دۆشەک و بەڕە و وتی: ئا کوڕە ئەم مەفروشاتە قەلیلن بزانن چی لەوێیە نەقلی کەن بۆ ئێرە. کە دۆشەک و پشتی هێنرانە خزمەت، میوانەکان و هەر کەسە شوێنی گرت. هەر دانیشتن و دانیشتن ئاغا بەهەر چوار لادا کەوتە چاوگێڕان و تاوێکی چاک بەدەورپشتی خۆیا هەڵڕوانی، وەک شتێکی زۆر بەنرخی لێ گوم بووبێ و بەدوایا عەوداڵ بێ. لەپڕ بانگی کردە خەڵقەکە و وتی:

ئەوە کوا لالۆ کەریم؟ عەشامەکە نەختێک بێ دەنگ بوون، دوایی یەکێک لەولاوە هەڵی دایەوە وتی: وەخوا وا دیارە هێشتا نەهاتگە... شەوێ یەژای سەرم یەشی، ڕەنگە هەڵنەستاوێ لە خەو. ئاغا هەرکە ئەوەی بیست دەمودەست یەکێک لە مسکینەکانی ڕاسپارد و پێی وت: هەر ئێستا دەچیت بۆ ماڵی لالۆ کەریم و ئەگەر نووستبوو خەبەری دەکەیتەوە و لەگەڵ خۆت دەیهێنی خۆ ئەگەر هەڵیشسابوو و، خەریکی ئیشوکار بوو، ئەوا پێی دەڵێیت فلانە کەس دەڵێ هەر کارێکی بەدەستەوەیە فڕێی دا و هەتا پێی دەکرێ خێرا خۆی بگەینێتە ئێرە، ئەمەی وت و ڕوویەکی کرد بەلای ئەفەنییە چاویلکە لە چاوەکە و پێی وت: جەناب لالۆ کەریم لە کۆنەوە هەتیوی خۆمانە و بەجاز و جگەر خزمەتمان دەکا، منیش هەر لەبەرئەوەیە وا لە ئەندازەبەدەر دڵنەوایی دەکەم و هەر کاتێ وەختی کۆکردنەوەی ئاوانە و ملکانەیی لەو زیاتر بەکەسی کەی ناسپێرم، چونکە دەستپاک و بەسفەت و دڵسۆز و سەرڕاستە. ئەویش خوا هەڵناگرێ هەتا بڵێیت ئێمەی خۆش دەوێ و سەری لە ڕێدایە بۆمان. بەخوا بگرە جاری وا بووە سێ شەو و سێ ڕۆژ خەو لە چاوی نەکەوتووە باس

خەرمان و ڕەز و مەرەزەی بۆ کردووین... لە وەتەی گرانییەکەی پێشووە و ئەم کابرایە هاتووەتە ئێرە ئەو حەلە زەمان ڕەحمەتی باوکم بووە لەو دەمەوە هەتا ئێستا نە ڕەحمەتی و نە من هێشتان هیچمان دڵمان لێی نەیەشاوە. کە هاتووە بۆ ئێرە و پەنای بردووەتە بەر خوا لێ خۆش بوو، ئەویش پیاوانە داڵدەی داوە و زۆر حورمەتی گرتووە و هەر تەگبیر و ڕایەکی ببووایە لە پێشا دەینارد بەدوای لالۆدا منیش هەر لەسەر ئەو داو و دەزمیرە ڕۆیشتووم و دەڕۆم و، هەتا لە وزەما بووبێ یارمەتیم داوە و دەستگیرۆییم کردووە لە ڕێی خوا و گۆڕەکەی باوکما...

ئاغا لەم قسانەدا بوو کابرای قاسی هاتەوە و وتی: ئاغا وەخوا لالۆ ها لە ماڵەوە لە ناو جێگادا کەفتگە، دوور لە گوێران تای لێ هاتگە و یەژێ ناتوانم لە ئەرزا ڕاستۆوم. ئاغا کە ئەمەی بیست نەختێک ڕەنگی تێک چوو وتی: های بەخێر نەیتەوە ئاوا ئەی نەتوت فلان کەس دەڵێ بێ؟ کابرای مسکین سەری داخست و بەدەنگێکی پڕ لە شپرزەییەوە وتی: بەڵێ قوروان لە فەرمایشتەکەی جەناوتم حاڵی کرد کەچی یەژای حەرزی بکە پێڵاوەکانی ئەئێمە بان سەرم، هەر لە شەوێوە قەڵەم دەست و پێم شکاگە، ناتوانم وەپاوە بوێسم، ئەگینا هەر دەهاتمە خزمەتی.

ئاغا بەجارێ ڕووی گرژ بوو و، بەتووڕەییەوە وتی: بڕۆرەوە پێی بڵێ ئاغام دەڵێ هەر دەبێ بێت کە هات مەلا قادر ئایەتولکورسییەکی بەسەرا کووف دەکات، دەستبەجێ چاک دەبێتەوە و دوعای مەلا قادر یەکاویەکە بۆ لەرز و تا، دەبڕۆ خێراکە لەگەڵ خۆت بیهێنە، ڕاکە دەی.

سەرچاوەکان


١- لالۆ کەریم - نووسینی د. جەمال نەبەز - هەولێر، ١٩٥٦.

٢- زمانی یەکگرتووی کوردی - نووسینی د. جەمال نەبەز - ئەڵمان، ١٩٥٤.

٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بە د. جەماڵ نەبەز.

## دوکتۆر عزەدین مستەفا ڕەسووڵ

١٣٥٤ - ...

عزەدین کوڕی مستەفا سەفوەت، لە ساڵی ١٣٥٤ی کۆچی لە سلێمانیدا لە دایک بووە و دەوری سەرەتایی و ناوەندی هەر لەو شارەدا تەواو کردووە و پاشان چووەتە بەغدا و لە کۆلیجی وێژەدا بکالوریوسی وەرگرتووە و لە پاش ماوەیەک چووەتە مۆسکۆ و لە زانکۆی ئەو شارەدا دوکتۆرای وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە زێد و مەڵبەندەکەی خۆی و خەریکی وانەوتنەوە بووە و پاشان چووەتە هەولێر و لە کۆلیجی ئەو شارەدا خەریکی وانەوتنەوە و لێکۆڵینەوەی وێژەیی و مێژوویییە.

د. عزەدین مستەفا یەکێ لە وێژەوانان و نووسەرانی هەرەبەرزی کوردە و تا ئێستا گەلێ نووسراوی سەبارەت بەوێژە و مێژوو و، فۆلکلۆری کورد نووسیوە کە گەلێ بایەدار و بەنرخن و هەندێ لەو نووسراوانە بریتین لە: فەرهەنگۆک بۆ قوتابیان، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شیعری کوردی، دیوانی سەفوەت، دیوانی ئەحمەد موختار جاف، دیوانی گۆران، لێکۆڵینەوەیەک لە ئەدەبی فۆلکلۆری، ڕازی دووری، عەمەری جەلالی، جەژنانە، زمان و ئەدەبی کوردی، پەروەردەی ئاینی. ئەمەش پارچە پەخشانێک لەم نووسەرەمان کە لە پەڕاوی فۆلکلۆری کوردی هەڵمان بژاردووە، وەکو دەڵێ:

هەندێ لە زانایان ناوی میتۆلۆژیایان بۆ عیلمێکی تایبەتی داناوە کە لە ئەفسانە دەدوێ، بەڵام میتۆلۆژیا ئەوەیە کە لە ڕێگەی ئەفسانەوە بەدوای باوەڕ و ئاینی کۆن و تازەی گەلاندا دەگەڕێت و بەچاویلکەی ئەدەب ناڕوانێتە ئەفسانە. بۆیە زانایان و ڕۆژهەلاتناسانی وەک مار و نیکیتین و مینۆرسکی و سمینۆف و ڤیلچیڤسکی و لاسکۆ، هەروەها نووسەری گەورەی کورد عەرەبی شەمۆ، بگرە ئەبۆڤیانیش، ئەفسانەیان کردووە بەکەرەستەیەک بۆ ساغکردنەوەی هەندێ بیروباوەڕی ئاینیی کۆن و تازەی کورد. ئەمانە زۆر لە وێنەی دێو و درنج و پەری و ڕۆژ و مانگ و بەرد و درەخت و هەندێ جانەوەر، بەتایبەتی لە وێنەی مار دواون لە ئەفسانەی کوردیدا. ئەفسانە لە فۆلکلۆری گەلاندا، بەشتێکی کۆن دەژمێررێ، چونکە بەرهەمی ئەو کاتەیە کە ئادەمیزاد دەستەوسان و بێ دەسەلات ڕوو بەڕووی سروشت دەوەستا و هیچ ڕووداوێکی سروشتیی بەڕێکی بۆ لێک نەدەدرایەوە و تێی نەدەگەیشت و دەسەلاتیشی بەسەریا نەبوو، بۆیە دەرگای بۆ بیرکردنەوە و خەیاڵ دەخستە سەر پشت و بەو جۆرەی کە ئەم ئەفسانانەی لێ هاتە بەرهەم، هەموو شتی لێک دەدایەوە. واتە: شێوەیەکی سادەی لێکدانەوەی ڕووداوەکانی سروشت دەخاتە بەردەست. هەندێ زانا

لایان وایە چونکە ئەم ئەفسانانە بەرهەمی سەرەتای ژیانی ئادەمیزادن، واتە سەردەمی منداڵیی ژیانی مرۆڤایەتی، بۆیە لە هەستی منداڵەوە نزیکن و منداڵ حەز لەم چیرۆکانە دەکەن و لە یادیان ناچێت.

گەر لە کونجی فەلسەفەوە بڕوانینە ئەفسانە، دەتوانین بەجۆرێکی هوشیاریی کۆمەڵایەتی دابنێین، هەروەک بەهەوڵدانێکی سەرەتایی مرۆڤ دەزانرێ بۆ ئەوەی لە جیهان بگات و جیهان بناسێت.

لە ئەفسانەی یۆنانییەکانی کۆندا هەر شتە خوای تایبەتی خۆی هەبوو، وەک خوای جوانی و خوای هونەر و شیعر و باران و گەلێک ڕووداوی تری سروشت. بەڵام دیمەنێکی ئەفسانەیی کۆنی یۆنان، لە ئەفسانەی گەلێک میللەتی تریشدا بەدی دەکرێ، بەتایبەتی لە ئەفسانەی کوردیدا. ئەویش ئەوەیە کە ئادەمیزاد یا بڵێین مرۆڤ یا ئینسان لە ئەنجامدا خۆی قارەمانی سەرکەوتووی ئەفسانەیە. جاروبار لە ئەفسانەی کۆنی یۆناندا کێشە دەکەوێتە نێوان قارەمانی تراگیدیا و نێوان خواکانی یۆنانی خۆیانەوە. هەروەک لە تراگیدیای پرۆمیتیۆس دایە، کەوا ئەفسانەی یۆنانی بەباپیرە گەورەی ئادەمیزادی دەزانێ و لەو تراگیدیایەدا ئەفسانەکە دەڵێ، پرۆمیتیۆس پارچەیەک لە ڕۆژی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو. خاوەن بیرەکان ئەم وێنەی ڕۆژە بەدوو جۆر لێک دەدەنەوە. هەندێکیان بەو سێوەی دادەنێن کە ئاینە ئاسمانییەکان دەڵێن «ئادەم» خواردی و بەو هۆیەوە لە بەهەشت دەرکرا. هەندێک ئەم پارچە ڕۆژە بەوێنەی زانیاری دادەنێن.

سەرچاوەکان

١- فۆلکلۆری کوردی نووسینی دوکتۆر عزەدین مستەفا ڕەسووڵ - بەغدا ١٩٧٠.
٢- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەدوکتۆر عزەدین مستەفا ڕەسووڵ.

## قادر فەتتاحی قازی

١٣٥٦ - ...

قادر فەتاح کوڕی میرزا خەلیلی قازی لە ساڵی ١٣٥٦ی کۆچی لە دێی قزڵجەی سەرێی سەر بەسابڵاخدا لە دایک بووە و دەوری سەرەتایی و ناوەندیی لە سابڵاخ تەواو کردووە و پاشان چووەتە تەورێز و لە زانکۆی وێژەدا ماستەر (فەوق لیسان)ی وەرگرتووە و لە پاشا بۆ ماوەیەک لە قوتابخانەکان وانەی گوتووە و ئەوسا گوێزراوەتەوە بۆ زانکۆی تەورێز و خەریکی وانەوتنەوە بووە و ئێستاش هەر لەوێدایە.

قادر فەتاحی قازی یەکێ لە نووسەرانی کوردە و دەستێکی بەجگار باڵای هەیە لە نووسینی وتار و پەخشان و لێکۆڵینەوەی فولکلۆریدا، ئەو نووسەرێکی خاوەن بەهرەیە و بەهەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر توانیویە زۆربەی بەیتەکان کۆ بکاتەوە و وەریان بگێڕێتە سەر زمانی فارسی تا هەموو کەڵک و سوودیان لێ وەرگرن و ئەو بەرهەمانەی کە تا ئێستا لە چاپیان داون بریتین لەم بەیتانە: مێهر و وەفا، شێخ سەنعان، بارام و گوڵەندام، شۆڕ مەحموود و مەرزینگان، شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێ، سەعید و میر سەیفەدین بەگ، لاس و خەزاڵ، کەڵ و شێر، گەلۆ، پەندی پێشینان، گۆڕستانی مەلاجامی، پەراوێز لەسەر فەرهەنگی مەهاباد، هەروەها گەلێ نووسراوی تری هەیە کە هێشتا بڵاو نەکراونەتەوە.

ئەمەش پارچە پەخشانێک و چەند هۆنراوێک کە لە پەڕاوی شۆڕ مەحموود و مەرزینگان هەڵمان بژارد کە دەڵێ: هەڵکەتی و خڕناڵ بەیتبێژی مەجیدخان بوون، ئەوان هیچیان بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بێنارێیان نەدەزانی، نەیانبیستبوو. مەجیدخان گوتی: دەبێ بچن لە هەر کویەکی هەیە بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بێناریم بۆ دەست خەن. مەجیدخان بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بێنارێی لە ڕەواندزێ بیستبوو، سەت تمەن پووڵی سپی دانێ، هەڵکەتی و خڕناڵ نیازیان وابوو بچنە شارەبان. ئەی لەبەر هەناری شارەبان!.

برایمی کامەلا خەڵکی پەسوێ بوو، هەڵکەتی و خڕناڵ هاتن میوانی وی بوون، گوتیان: بۆ وەدەستخستنی بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بێنارێ دەچین بۆ شارەبان. برایمی کامەلا گوتی: ئەنگۆ دەگەنە شارەبان خەرجی هەیە، ماندووبوونی هەیە، دوورە. وسۆ شایەر هەیە لە شنۆیە، بەیتی سوڵتان ئەحمەدی دەزانێ. وای دەزانێ ئەگەر لە شارەبانیش وای نەزانن!.

هەڵکەتی و خڕناڵ ئەگەر وایان زانی، هەستان وەڕێ کەوتن بۆ شنۆیە. لە ڕێدا پرسیاریان دەکرد لە خەڵکی، پێیان گوتن: وسۆ شایەر کچی هەیە، کوڕی نییە، جووت بەندەیە، مەزراکەی لەبن سێ بییان دایە. سێ بییان لە پشت شنۆیە، ئاوەڕۆی دێتەوە شنۆیە، ئەوە لەوێ خەریکی جووت و گایە.

هەڵکەتی و خڕناڵ هاتنە تاچیناوا، لەوێ پرسیاریان کرد. گوتیان: هاها! ئەو جووتەی لەو بەندەنەیە ئی وسۆ شایەرە. ئێکی خڕیلانەش بوو، ڕدێنیشی هەبوو هاتن لێی نزیک بوون. گوتیان:

پیاوێکی بەجەوهەری

زۆر مەرد و موزەفەری

ئاگادارت بێ خالقی بانی سەری

دیارە ڕەهبەر و تەتەری

لەبزت شیرنە، وەک گەوهەری
لە قیامەت نەبێ چاو لە بەری
قسمەتت بێ ئاوی کەوسەری
نەرمی، هەر دەڵێی فەنەری
پێم وایە تۆ وسۆ شایەری
دەڵێن بۆ میوانان پەزیرایە
کاک وسۆ ڕوو زەرد نەبی لەو دونیایە
گایەکت ڕەشە و یەکت سوورە
نێوت لە میر و بەگلەر مەنشوورە
بەیتان دەڵێی بە سەت جوورە
وسۆ شایەر گوتی:
هیچ کەس لە کوینی وی نییە
ئەو کەریمە و ئەو ڕەببییە
ئەمن دەوکەم مێهمانییە
نێویانگم بیستوون بە ئەسەحییە
ئێک خڕناڵە و ئێک هەڵکەتییە
ئەورۆ کە حاڵم بێ حاڵە
سەرم دێشێ، گەرووم تاڵە
ئەگەر دەپرسن ئەسەحییە
بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بێناری لە کنە منە بەمورەتەبییە
ئەمن مەلام ڕانامێنم
ئەو بەیتەو چاک بۆ دەخوێنم

وسۆ شایەر گوتی: شەوێ هەتا چرا نەکوژێتەوە پێو ناڵێم. جا شەوێ ئەگەر چرا کوژاوە، بەیتەکەی پێ گوتن، بەچوار شەوان بۆی تەواوکردن. ئەگەر بەیتەکە تەواو بوو لێی پرسینەوە، بیست و هەشت بەندیان لێ زیاد کردبوو و زۆریش بەڕێ و جێ لێیان زیاد کردبوو. وسۆ شایەر ئەگەر وای دی زۆری پێ خۆش بوو گوتی: هەک لە چاوی منو کەوێ!. وسۆ شایەر دوو کچی بوو نێویان زەینەب و گوڵناز بوو، پێی خۆش بوو بییان دا بەهەڵکەتی و خڕناڵ، بەڵام کچەکان قایل نەبوون.

هەڵکەتی زانیی ئەو حـــاڵە
بۆ وی نابێ ئەو قەد شمشاڵە
چاوی ڕەشـــە و لێـــوی ئاڵە
چاو ئەستێرەی بن گەواڵە
جار جار کە دێتە ساماڵە
ڕێی شـێـخـان بۆی بەتاڵە

سەرچاوەکان


١- مێهر و وەفا - کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی قادر فەتاحی قازی - تەورێز، ١٣٤٥.

٢- شێخ سەنعان - کۆکردنەوە و توێژینەوەی قادر فەتاحی قازی - تەورێز، ١٣٤٦.

٣- بارام و گوڵەندام - کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی قادر فەتاحی قازی - تەورێز، ١٣٤٧.

٤- شۆڕ مەحموود و مەرزینگان - کۆکردنەوە و قادر فەتاحی قازی - تەورێز، ١٣٤٨.

٥- شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی - کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی قادر فەتاحی قازی - تەورێز، ١٣٥١.

٦- یاداشتەکانی خۆم لەسەر قادر فەتاحی قازی.


## ئیبراهیم ئەحمەد

١٤٢١-١٣٣٥

ئیبراهیم ئەحمەد لە ساڵی ١٣٣٥ی کۆچی لە سلێمانیدا هاتووەتە جیهانەوە و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە سلێمانی تەواو کردووە و پاشان چووەتە بەغدا و لە ڕشتەی «حقووق»دا بەکالۆریۆس (لیسانس)ی وەرگرتووە و لە پاشا بووەتە فەرمانڕەوا و لە ساڵی ١٩٣٩ تا ١٩٤٩ بەدەرکردنی گۆڤاری، گەلاوێژ خۆی خەریک کردووە و لە نووسینی پەخشان و چیرۆکدا دەستێکی بەرز و باڵای هەیە و تا ئێستا دوو کۆمەڵە چیرۆکی بەناوی کوێرەوەری و ژانی گەل چاپ و بڵاو کردووەتەوە و گەلێ بەرهەم و چیرۆکی تری لە گۆڤارەکاندا بڵاو بوونەتەوە و سەرەنجام لە ساڵی ١٤٢١ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.

ئیبراهیم ئەحمەد یەکەم نووسەری کوردە کە خەباتی چەوساوەکانی کوردی لە چیرۆکەکانیدا نووسیوە و نووسراوەکانی سەرمەشقێکە بۆ نووسەرانی ئەم سەردەمە و ژانی گەلی ئەو تا ئێستا بەچەند زمان وەرگێڕاوە و بەشاکارێکی وێژەیی دێتە ژمار. یەکێ لە چیرۆکەکانی ئەو چیرۆکی خازێیە کە لە گۆڤاری گەلاوێژ بڵاوی کردووەتەوە. خازێ

ئافرەتێکی چەوساوەی کوردە، باوکی داویەتە شوو بە پیاوێکی پیری دێیەکی دراوسێیان و لە پاش ماوەیەک مێردەکەی ئازاری دەدا بە جۆرێ کە ژیانی لێ تاڵ دەکا و خازێ ناچار هەڵدێت و پەنا دەباتە دێیەک کە دەستی مێردەکەی پێی ناگا و لە ماڵی ئاغەیەک دەمێنێتەوە و ئاغەژنیش زۆری پێ خۆش دەبێ و دەیکاتە کارەکەری خۆی و هەتا ڕۆژێکیان بەگێک ڕێی دەکەوێتە ماڵی ئاغە و خازێی بەدڵدا دەچێ و گرفتاری دەبێ و ئەم ڕازە دەڵێتە ئاغەژن و ئەویش مەسەلەکە بە خازێ ڕادەگەیەنێ و خازێش دەڵێ من هێشتا مێردەکەم بەرەڵامی نەکردووە، بەڵام بەگەکە بەمە گوێ نادا و خازێ بەزۆر دەبا و دوای ساڵێک براکانی خازێ لە هەلێک دەگەڕین کە تۆڵەی خۆیان لە خازێ بسێننەوە و هەلیان بۆ هەڵدەکەوێ و خازێ دەفڕێنن و سەری دەنێنە سەر تاوێرێک و بەردێ دەدەن بەسەریا و دوو سێ خەنجەریشی لێ دەدەن و کەلاکەکەی بەجێ دێڵن و بۆ بەیانی شوانێک بەو ناوەدا تێ دەپەڕێ و چاوی دەکەوێتە کەلاکەکە و دەبینێ کە هێشتا گیانی تیا ماوە و دوای دەرمانکردنی برینەکانی ساڵێک زیندوو دەمێنێ، بەڵام شێت و لێوە دەبێ و کەس ناناسێ و بەسواڵ و ساقە خۆی دەژێنێ.

ناوەڕۆکی ئەم چیرۆکە ئاڵۆزیی کۆمەڵی کوردەواریمان بۆ دەردەخا کە چۆن زۆر و ستەم و نەزانی و نەخوێندەواری لەناو کوردا باوە و لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک بەسەر هەندێکی تردا زاڵن و هەر کارێکیان بوێ، بەبێ ترس دەیکەن و کەسیش نییە کە دەردی ئەم کۆمەڵە چارەسەر کا. ئەوا لێرەدا چیرۆکی خازێ دێنین وەکو دەڵێ:

هەروا لەوبەری ماڵەکەمانەوە، بەرامبەر بەشەقامەکە، ژوورێکی ڕووخاو هەبوو. وا دیاربوو پاشماوەی خانوویەکی گەورە بوو کە بەرجادە کەوتووە خاوەنی پێی نەکراوە دروستی کاتەوە. ڕۆژ نەبوو یەکدوو ڕێبوار لەبەر خۆیانەوە، یا بەیەکتر نەڵێن: «ئەوە بۆچی بەلەدییە ئەو کەلاوەیە تەخت ناکات دیمەنی شەقامەکەی ناشیرین کردووە.

بەیانییەک لە ماڵێ هاتمە دەرێ دیم کرێکاری بەسەرەوەیە خەریکن تێکی دەدەن لە دڵی خۆما گەلێکم پێ خۆش بوو کە ئەم کەلاوەیە لەبەر ماڵەکەمانا نەما کە دەتگوت دەموچاوی زەلامێکە پارچە بۆمبا نیوەی بردبێ.

یەک دوو ڕۆژ دوای ئەمە، نیوەڕۆیە دیم هەروا لەجێی ژوورە تەختکراوەکە لێفولکەیەکی شڕ گرمۆڵە کراوە چڵک و کونی وایان لێ کردبوو نەمزانی ڕەنگی چی بوو. هیچ بەبیرما نەدەهات لەو لێفە شڕە بچمە پێشەوە ئەگەر لە نزیکیەوە سەتڵێکی شکاو و گۆزەڵەیەکی لێو کەل و جامێکی قوپاوی ژەنگاویم نەدیبایە و دوو سێ زەلامی بەهەڵەداوان لێی نەچوونایە پێشەوە و یەکێکیان چمکی لێفەکەی ڕانەکێشایە و بڵێ «خازێ؟!» چمکی لێفەکە؟

بەدەستییەوە هات بەڵام دەنگ نەبوو، کابرا وتی: نەمرد بێ؟ بەئەسپایی لێفەکەی لادا، دەموچاوی دەرکەوت بەڵام چ دەموچاوێک! ناچاریشم بڵێم دەموچاو چونکە کەلەبەرێکی تیا کرایەوە و دەنگێکی کپی ساردی سوواوی لێ هاتە دەرێ وتی: توخوا لێم مەدەن! لێم مەدەن نەخۆشم! زیاتر لێی چوومە پێشەوە. وا دیاربوو ڕۆشنایی نەدەویست بۆیە دەستێکی وەکو قامیشی پەڕۆ تێ پێچراوی گرت بەچاوییەوە، کە لە چاو زیاتر لە دەمی دوو برینی گۆشتەوزوون هێناوە ئەچوون. لەگەڵ دوو کابراکەدا بێ ئەوەی چ ناسیاوێکمان لە میانا بێت، وەک دیمەنی گرینەر و پڕ لە کوێرەوەریی ئەم ژنە کردبینی بە دۆستێکی دێرین، لێیان چوومە پێشەوە و پرسیم ئەم ژنە چییە! کێیە؟ کابرای پێشوویان وەرامی دامەوە و بەسەرسوڕماوی وتی: خازێ! چۆن خازێ ناناسی؟ دەبێ خەڵکی ئێرە نەبی؟ منیش بەرامبەر بەم شاڵاوەی کابرا وەکو قوتابییەک، مامۆستا لە تاوانا گرتبێتی بەشەرمێکەوە وتم:

– بەڵێ تازە هاتوومە ئێرە، بۆیە نازانم خازێ کێیە؟ کابرا وەک یەکێ لە خوای ویستبێ نەزانێکی وەکو منی دەست کەوێ بەشانازی و خۆهەڵکێشانێکی دیارەوە وتی:

– ئای برا! ئەم دەعبایەی وا ئێستە پیاو بێزی لێ ئەکاتەوە و زات ناکات هەر تەماشاشی بکات، بیست ساڵ لەمەوبەر شۆڕە ژنێ بوو ناسک و نازدار، دوو چاوی ڕەشی گەشی بەباوەش پرشنگیان لێ هەڵدەقووڵا، پرشنگێکی دڵفڕێن، چاوترسێن، پیاوپسێن،... بە قاقای پێکەنینی، بەلەنجەولاری شیرینی ئەو تەلارەی ماڵی «میران بەگ»ی کردبووە بەهەشتی شادی و سەرچاوەی جوانی، گۆرانیی سەردەمی جوان و پیر، باسی ڕوومەتی ئاڵ و چاوی ڕەش و ڕەوتی پۆڕێ خازێ بوو. هەرزەکاران وەکو هەنگ بەدەوری تەلارەکەدا دەسووڕانەوە بەو هیوایەی بەتیلاییی چاو لە دوورەوە تەماشایەکی بکەن. بۆیە دەڵێم بەتیلایی چاو چونکە نەیان بوو بوێرێ لێی نزیک ببێتەوە. کابرا هەر ئەوەندە پشووی دا تاکو یادگاری کۆکردەوە ئینجا هەناسەیەکی هەڵکیشا وتی:

– «بەڵام لێم بپرسە بڵێ خازێیەکی لادێی هەژار چۆن. گەیشتە ئەم تەلارە و چی کردی بەقیبلەگای دڵی هەرزەکاران؟»

بێ ئەوەی چاوەڕوانی پرسیاری من بکات، خۆی وەرامی خۆی دایەوە وتی:

– خازێ کچۆڵەیە بوو چواردە ساڵە بەو جوانییەی باسم بۆ کردی، دایک و باوکی لەبەر دەستکورتی فرۆشتبوویان بەپیرەمێردێکی خەڵکی دێیەکی دراوسێیان بە (٣٠) لیرە شیربایی. خازێ ئەگەرچی ئەم شووکردنەی لا لە مردن ناخۆشتر دەبێ و زۆر دەگری و دەپاڕێتەوە، بەڵام دڵی ڕەقی دایک و باوکی بەزڕەی لیرەی کابرا زیاتر نەرم دەبن تا دەنگی

گریانی ئەم. دەیگوێزنەوە بەڵام بۆ کوێ؟ بۆ جەهەنەم! نە شەو لە جێدا حەسانەوەیەک، نە ڕۆژ لە ماڵا حەوانەوەیەک. بۆڵە و خوتەی دش و گرمەگرمی مێرد و لێدان و تێهەڵدانی پێنج هەنەزاش لەلایە، کە هەرە بچووکەکەیان چوار ساڵ لە خۆی گەورەتر دەبێ.

دار و گۆشت ئاشنایەتییان نییە، بەناچاری هەڵدێ بێ ئەوەی بزانێ بۆ کوێ دەچێ... بچێتەوە ماڵی باوکی؟ هەی خوانەکا گوایا کێ لە دنیای ڕوونا بەهەرزەکاری ناشتی؟ باوکی نەبوو؟ بچێتە شوێنێک دەستی مێردەکەی نەگاتێ. بەناهومێدی خۆی دەخاتە ماڵی «بایز ئاغا» کە ئەوسا دەسەڵاتیان ئەوەندە هەبوو کە مێردەکەی خازێ هەر بەخەوی شەوانیش بەبیریا نەیەت ژن لەوان بسێنێتەوە.

هەرکە ئاغاژن چاوی پێ دەکەوێت دەچێتە دڵیەوە، دەینێرێت جلی بۆ بکەن و دەیکا بەکەنیزەکی تایبەتی خۆی. چەند مانگێ وا دەژی. لەو دەمەدا «ن.» ناو، کابرایەک دەبێ بەکاربەدەستی ئێرە. زۆر دۆستی بایزئاغا دەبێ. ڕۆژێک لای ئاغاژن کەنیزە جوانەکە دەبینێ و کە لێی دەپرسێ ئەمە کێیە ئاغاژن بەبەژن و باڵای خازێدا هەڵدەدا و دەڵێ: ژنی پیاوێکی پیرەمێردە بەدیاریەوە دانەنیشتووە و هەڵهاتووە. «ن.» وا لە ئاغاژن دەگەیەنی کە خازێ چووەتە دڵیەوە.

کە ئەو ئەڕوا ئاغاژن خازێ بانگ دەکا و تێی دەگەیەنێ کەوا «ن.» بەگ زۆری پەسند کردووە ئەیەوێ بیکا بەکەیبانووی خۆی. خازێ دەست دەکا بەگریان و شین بەئاغاژن دەڵێ: «قوربان من پەنام هێناوەتە بەر ئێوە، ئەمە ڕەوای هەق نییە ئێوەش بمخەنە پاڵ زرتەبۆزێکی... بێکار. من ژنێکم مێرددار و خاوەن کەس و هەقدار.» ئاغاژن بەتووڕەییەوە پێی دەڵێ: بەگ لەوانە نییە، پیاوێکی باشە. ئەمی تەنیا بۆ خزمەتی خۆی دەوێ. خۆشی بێ و ترشی بێ دەبێ هەر بچیت و ئەگەر لەوەش زیاتر لاساری بکات دەتوانێ حەپسی بکا و یا لەوەش خراپتری لێ بکات و بینێرێتە کارخانە... کچەکە ئەمە دەبیسێ، خۆی دەدا بەسەردەست و پێی ئاغاژندا و گەلێ ماچی دەکات و لێی دەپاڕێتەوە بەڵام بێ سوود دەبێ... لە دواییدا بە ئاغاژن دەڵێ: دەسا قوربان کەواتە ئیزنم بدەن بچمەوە لای مێردەکەم، خوا ماڵتان ئاواکات. ئاغاژن لەمە زۆر تووڕە دەبێ دەڵێ: باشە هەر ئێستە دەنێرم مێردە سەگبابەکەت بهێنن لەبەرچاوی خۆت حەسیرمەیدانی کەن – چارەت نییە پیسی بەدنمەک. ئا وەرن کوڕە ئەم بەیتەشەیە دەست و پێی ببەستن و شەوێ بیبەنە ماڵی ن. بەگ، لوزەندری دەکا بەژوورا و دەست دەداتە پەلی خازێی نیوە لە هۆش چوو دەیباتە دەرێ.

لە ماڵی ن. بەگ تا سێ چوار ڕۆژ کەس خۆی تێ ناگەیەنێ لە پێرەژنێ بەولاوە، کە وەکو پەپوولە دەوروخولی دەدا و تاوی دڵخۆشیی دەداتەوە، تاوێ دەی ترسێنێ، دەمێ جلی جوان

و خشڵ و دیاریی بۆ دەهێنێ بەم جۆرە مانگێک دەمێنێتەوە. بەدرێژاییی ڕۆژ خازێ لە ماڵەکەدا ڕایەت، لەگەڵ پیرەژن دەبنە دۆست. خۆشی ناز و نیعمەت و تێری و خانمی ئەچێژێ. شەوێک لە دەنگی پێی زەلامێک ڕاست دەبێتەوە، ئەڕوانێ ن. بەگە بەزۆر بەخواهشت، بە هەڕەشە و بەتەماع، بەبزواندن و بە تەفرەدان خازێ لەو شەوەوە دەبێتە دۆستی ن. بەگ ساڵ و نیوێک وا مایەوە لە کڕنووش بۆکردنی پیاوماقووڵان، لە حورمەت گرتن و ماستاو ساردکردنەوەی گەورە ماڵان، لە ڕواڵەت و بەپیرەوە هاتنی خانمان، خازێ ئەوەندەی دی و ئەوەندەی بۆ کرا بڕوا ناکرێ فریشتەش بووایا بەبیریا بهاتایە کەوا لە سەرەنوێڵکی نزمی و بێ شەرمیدا ئەژی.

دوای ساڵ و نیوە، ڕۆژێک فەرمان بۆ «ن.بەگ» دێ کە بچێ بۆ شوێنێکی تر، ئەویش هەرچی جلوبەرگ و خشڵ بەخازێ خۆیەوە دەبێ دەیداتێ و هەندێکیش پارەی بۆ جێ دەهێڵێ و لێ دەدا دەڕوا.

ئەمەوا، بەڵام وەنەبێ کەسوکاری خازێ بەم کردەوەیەی ڕازی بووبن تەنیا هەر دەست بەستراوی ئەوەبوون کە لەبەر ن. بەگ دەستیان نەی دەگەیشتێ کە ئەو ڕۆیشت گرێی دەستیان دەکرێتەوە، شەوێک لەناکاو دوو برای دێن هەڵی دەگرن و دەیبەنە ئەو کەژە، لەوێ سەری دەخەنە سەر تاوێرێک و بەردێک دەماڵن بەکاژەڵەی سەریا دوای ئەوە دوو سێ خەنجەریشی لێ دەدەن، لاشەکەی بەجێ دێڵن بۆ قەل و داڵ. بۆ بەیانی کابرایەکی شوان لەو نزیکانە مەڕ دەلەوەڕێنێ چاوی بەلاشەیەک دەکەوێ کە لێی دەچێتە پێشێ و دەست دەدا لە دڵی تێ دەگا هێشتا گیانی تیا ماوە. ئەیباتە دێ لە پاش ساڵێک تیمارکردن و دەرمانکردن بۆ بیولەتی و لۆمەی پسان نامرێت و لەوپەرییە ئەم دەعەجانییە دەمێنێتەوە کە لە پاش چەند ساڵێک خەڵک توانییان بیناسنەوە ئەویش بەدەموچاوانە، بەوەدا کە خۆی، چونکە شێت بووە هەر لەبەرخۆیەوە وڕێنە دەکا، ناوی ئەو کەسانە دەهێنێ کە ئەوسا ناسیونی. باسی ئەو ژیانە دەکا کە ئەوسا ڕای بواردووە. لەوساوە بەڕۆژ سواڵ دەکات و بەشەویش لە پەنا پاسارێکا سەردەنێتەوە. ئەمە پێنج ساڵ دەبێ ئەم کەلاوەیەی گرتووە بەشەو لێی دەنوێ. وا ئەویشیان ڕووخاند، ئینجا بۆیە دەبینێ خۆی و هەرچی خوا پێی داوە لەو چەقی ڕێیەدا گرمۆڵە بووە. بەسەزمانە منداڵە وردکە زۆر ئازاری دەدەن.

کابراکە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی بووەوە. دڵۆپێ فرمێسک لە چاویا قەتیس مابوو. ئەوی تریان ڕووی کردە من وتی: «خوا لێی خۆش بێ لە دنیای ڕوونا سزای خۆی دی!». لێرەدا خازێ وەک دارکاری بکەن زریکانی وتی: «دەلا، دەلا، لێم مەدەن، ماڵتان کاول بێ، لێم مەدەن توخوا!».

ئیتر بڵاوەمان لێ کرد. هەموو بەزەییمان لێ دەتکا، بەڵام هەر بەزەییی ڕووت، بێ ئەوەی یەکێکمان بیریش لە ڕێیەک بکاتەوە کە نەختێ ئازاری پیری و لێقەوماوی و پەککەوتوویی ئەو کلۆڵەی پێ کەم ببێتەوە.

ئیبراهیم ئەحمەد لە هۆنینەوەی هۆنراویشدا دەستێکی باڵای هەبووە و هۆنراوەکانی گەلێ پڕ مانا و شیرینن و هەندێکی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاو بووەتەوە و ئەوەش دوو هۆنراوی ئەو کە دەڵێ:

مــــەژی بۆ مـــــردن بمرە بۆ ژیان
چۆن قازانج ئەکەی تا نەکەی زیان
لە زڕەی زنجـــیـــر دڵت نەلەرزێ
پێـوەند بـۆ لەشـە نەوەک بۆ گـیـان


سەرچاوەکان

١- ژانی گەل، نووسینی ئیبراهیم ئەحمەد - سلێمانی، ١٩٧٣.

٢- کۆیرەوەری نووسراوی ئیبراهیم ئەحمەد - بەغدا، ١٩٥٩.

٣- نووسینی کوردی بەتیپی لاتینی، نووسینی جەمال نەبەز - بەغدا، ١٩٥٧.

٤- یادگار و هیوا، یادگاری لاوان - بەغدا، ١٩٣٣.

٥- گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٥، ساڵی ٦ - بەغدا، ١٩٤٥.


## عوسمان شاربازێڕی

١٣٦٠-....

عوسمان کوڕی حاجی عەلی لە ساڵی ١٣٦٠ی کۆچی لە سلێمانیدا لە دایک بووە و دەوری سەرەتایی لە چوارتا دەورەی ناوەندی لە سلێمانی تەواو کردووە و پاشان بووەتە مامۆستا و خەریکی وانە وتنەوە بووە و ماوەیەکیش بووەتە مامۆستای مۆسیقا و لە پاشا خانەنشین کراوە.

عوسمان شاربازێڕی بەیەکێ لە نووسەران و هۆنەران و گۆرانیبێژانی کورد دێتە ژمار و لە هۆنینەوەی هۆنراودا دەستێکی باڵای هەیە و لە نووسینیشدا گەلێ چالاکە و هەروەها گۆرانیبێژێکی باشیشە و تا ئێستا چەندین گۆرانیی وتوون کە گەلێ لایەنگری هەین. ئەم نووسراوانەشی نووسیوە کە لە چاپ دراون: هەزار و یەک پەند، لێدوانێکی کورت لە مۆسیقا و مەقامی کوردی، بەستە و مەقام، گەوهەری یا گۆرانییەکانی حەسەن زیرەک،

گەنجینەی گۆرانی کوردی، سێ کۆمەڵە هۆنراویشی بەناوی دیاری و یادگار و ئەستێرەی بەیان و کاروان بڵاو کردوونەتەوە. ئەمەش پارچە پەخشانێک لەم نووسەرە هێژایەمان کە لە پەڕتووکی گەنجینەی گۆرانی کوردی هەڵمان بژاردووە، وەکو دەڵێ:

گۆرانی و مۆسیقا بەری بەهرە و بیری ئادەمیزادن، زادەی قوڕگ و پەنجەی مرۆڤن، کۆنترین هونەری دەروونی خەڵکن لەم سەرزەوییەدا، هۆنراوە کۆنترین لقی ئەدەبە - گۆرانیش کۆنترین بەشی فۆلکلۆرە.

بەهرەی دەنگخۆشی و مۆسیقایی خۆڕسکی و خواکردە. خۆکرد نییە وزەیەکی شاراوەیە لە گیان و مێشک و قوڕگ و پەنجەی ئادەمیزاد دایە، هەست و هێزێکی سروشتییە بەدەگمەن لە کەسانێکدا بەدیار دەکەون، بەخۆ خەریککردن و خوێندن نییە.

گۆرانی و مۆسیقا لەگەڵ ئادەمیزاددا جووتەزا و جمکەن، ئادەمیزاد بەرلەوەی هۆنراوە یا مۆسیقای زانیبێت پەی بەگۆرانی بردووە. منداڵ هەرکە زمانی دەپژێ و دەکەوێتە گڕوگاڵ و هۆش و گۆشی دەکرێتەوە دەتوانێت بڕە بڕە ئاوازی پچڕ پچڕ بۆ خۆی بڵێت، یا لاسایی ئەو دەنگانە بکاتەوە کە گوێی لێیان دەبێت، بەڵام ناتوانێت، ئاوازی مۆسیقایی دابنێت یا مۆسیقای لێ بدات. یاخود هۆنراوە دابنێت! بەمەدا دەردەکەوێت کە گۆرانی هاوگۆ و هاودەمی ئادەمیزاد بووە، پێش هۆنراوە، مۆسیقا و گۆرانی مرۆڤی ڕێنمایی کردووە بۆ دانانی هۆنراوە و دروستکردنی ئامرازەکانی مۆسیقا، تا بەهۆی ئەو ئامرازانەوە لەرە و لۆرەی قوڕگی کۆک بکا و ئاوازەکەی پێ بڕازێنێتەوە.

کۆرت ڕاکس دەڵێت: گۆرانی کۆنترە و لە پێشتر، لە ئامرازەکانی مۆسیقا ئەو گەلانەی لە نزمترین پایەی شارستانی دان، خاوەنی گۆرانیی خۆیانن، بێ ئەوەی شتێک دەربارەی ئالەتی مۆسیقا بزانن. تا ئەمڕۆش بەسۆزترین ئامرازی مۆسیقا گەرووی پڕ خرۆش و سازگاری ئادەمیزادە کە مۆسیقایەکی ژێداری گیانییە. فیکە مۆسیقایەکی زارییە و چەپڵەش سەرەتای دۆزینەوەیە ڕەزمی گۆرانی و مۆسیقایە کۆنترین ئامرازە لە مۆسیقادا و ئامرازێکی گیانییە بۆ ڕاگرتنی هەوای گۆرانی و تاکت و تیمپۆی مۆسیقایی.

چریکە و قاسپە و جریوە و هاڕە و هاژە و بانگ و قریوە و حیلە و حیلکە و خونگە و تریفە و هاوار و خشپە و خوڕە و قەرە و لۆرە و ئەم دەنگانە و دەیانی تر لەم کەونە کۆنەدا و لەم زەمین و زەمانەدا لە خۆیاندا مۆسیقایەکی سروشتی بن، هەرچەند بڕێکیان دەنگێکی ناساز و نەشازن، بەڵام پەلگر و ڕێنوێنی مرۆڤ بوون بۆ دۆزینەوەی ساز و ئاواز و فێربوونی سەما و هەڵپەڕکێ.

سەرچاوەکان

١- دیاری نەورۆز لە پەخشانی کوردیدا، نووسینی عومەر ئیبراهیم عەزیز - بەغدا ١٩٨٩.
٢- گەنجینەی گۆرانی کوردی نووسینی عوسمان شاربازێری- بەغدا ١٩٨٥.
٣- بەستە و مەقام نووسینی عوسمان شاربازێری - بەغدا ١٩٧٩.
٤- لێدوانێکی کورت لە مۆسیقا وَ مەقامی کوردی تۆژینەوەی عوسمان شاربازێری - بەغدا ١٩٧٢.

## مەلا قاسمی پایگەلانی

١١٩٤ - ١٢٦١

قاسم، کوڕی عەبدولحەقی پایگەلانی، لە ساڵی ١١٩٤ی کۆچیدا لە دێی پایگەلان سەر بەژاوەڕۆی هەورامان لە دایک بووە هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و لە شەریعەتی ئیسلام و لێکدانەوەی قورئان و ڕەوانبێژی سەرکەوتووە و پاشان خەریکی وانەوتنەوە بووە تا لە ساڵی ١٢٦١ی کۆچی مردووە.

مەلا قاسم گەلێ هۆنراوی هۆنیوەتەوە و دیوانێکی لێ بەجێ ماوە، ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی ئەم هۆنەرە کە دەڵێ:

بکەران چارم، بکەران چارم
هانا ئەی یاران بکەران چارم
چونکە پەرێ یار من دەردەدارم
دەردم گرانەن دیارەن بیمارم
نە ئەو ڕۆژەوە جە یارم بڕیام
بە وێنەی ئاهوو پەرێ ئەو گریام
ئینە چەن ڕۆژەن ئاوارەی دەشتم
چەنی ئاهوان ئانە نە گەشتم
نمەز چیش کەروون نە گەشت و گێڵم
پەی یار ئازیز ئاوارە و وێڵم
شەماڵ سا هانا بشۆ وە لای لەیل
واچە شێتەکەی دل نە خەما کەیل
ئیسە چون «قاسم» ئاوارەی هەردەن
نە دووریی لەیلدا هەناسە سەردەن

واتە: چارم بکەن، هانا ئەی یاران چارم بکەن، چونکە من دەردەداری یارم، دەردم گرانە و دیارە نەخۆشم، لە ئەو ڕۆژەوە کە لە یارم بڕام، وەکو ئاور بۆ ئەو گڕم تێ بەربووە، ئەمە چەند ڕۆژە کە ئاوارەی دەشت و دەرم، لەگەڵ ئاسکەکاندا ئەوا لە گەڕاندام، نازانم چی بکەم ئەز لە گەشت و گێڵدام، بۆ یارە خۆشەویستەکەم ئاوارە و دەربەدەرم، شەماڵ دەسا هانا بچۆ بۆ لای یار، بڵێ شێتەکەی دڵ پڕ لە خەم و پەژارە، ئێستا وەکو «قاسم» ئاوارەی دەشت و کێوە، لە دووریی یاردا هەناسەساردە.

## مەلا فەتحوڵڵای کەیفی

١٣٠٣-١٢٣٤

فەتحوڵڵای کوڕی حەسەن کە نازناوی کەیفییە لە ساڵی ١٢٣٤ی کۆچی لە کوێرە دێی جوانرۆدا لە دایک بووە و هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و لە تافی جوانیدا بەفەقێیەتی ڕۆیشتووەتە کۆیە و لەوێدا لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیی خەریکی خوێندنی ڕێزمانی عەرەبی و ڕەوانبێژی بووە و ئەوسا لەوێوە چووەتە قوتابخانەی حاجی مەلا ئەسعەد و لەلای زانایاندا شەریعەتی ئیسلامی خوێندووە تا ودمی مەلایەتی وەرگرتووە و لەم ماوەدا چاوی کەوتووەتە شێخ ڕەزا بەیەکەوە وانەیان خوێندووە و هەندێ جاریش بەهۆنراو پەلاماری یەکتریان داوە و سەرەنجام بووەتە شەڕیان و کەیفیش کۆیە بەجێ دێڵێ و دەڕواتە هەولێر و لەوێوە دەچێتە حەلەب و لە حەلەبەوە ئەڕواتە ئەستەمووڵ و لە ئەستەمولّدا ماوەیەک خەریکی فێربوونی زمانی فەرەنسی دەبێ و ئەوسا لە باڵیۆزخانەی فەرەنسادا دادەمەزرێ و لەگەڵ ئەمیشە خەریکی وانە وتنەوە بەفەقێیان دەبێ و ئیتر بەم چەشنە ژیانی دەباتە سەر تا لە ساڵی ١٣٠٣ی کۆچیدا کۆچی دوایی دەکا.

کەیفی یەکێ لە هۆنەرانی هەڵکەوتووی کوردە و هۆنراوەکانی گەلێ تەڕ و پاراو و شیرینن و ئەو بەزمانەکانی فارسی و عەرەبیش هۆنراوی هۆنیوەتەوە و زۆربەی هۆنراوە کوردییەکانی بە سۆرانی و گۆرانین و ئەمەش چەند پارچە هەڵبەستێکی ئەو کە دەڵێ:

ئەم دڵ ڕەشە بێ ڕەحمە فەرەنگێکی تەواوە

ڕەش قەلبی ڕەشە فیتنە بەچاو ناوی نراوە

قەوسی بەسپەر کردووە گرتوویە بەدەستی

سەد خەنجەری خوێنڕێژو دوو سەد تیری سواوە

زنجیری عەداڵەت نیە ئەم زاڵمە، زوڵفە

هەر چەندە بنی بەندە بە ڕووی عەرشی خواوە

دای ناوه لەسەر موسحەفی ڕووی داوی سیاهی
لەم وەجهە بەدەست کفرەوە ئیمانی داوە
ڕەمزی دەمە ئەم نوقتە لەسەر شانەی هەنگوین
نەقشی قەدەمی میشە کە نێویکی نەماوە
خەتی نەزەرت گرتییە ڕشتەی کەمەرت بۆچ
لەم کێوە کە وەک زێوە بە حەسرەت بەسراوە
ژێری کەمەری باسی بکەم باری گوناهە
(کەیفی) لە بن ئەم باری گوناهە ملی ناوە
کەیفی لە پارچە هەڵبەستێکی تردا دەڵێ:
کافرە مەستە چاوەکەی غارەتی دین و دڵبەرە
پەرچەم و زوڵفە خاوەکەی بۆنی لە میسک و عەنبەرە
شکەن شکەن، گرە گرە، حەڵقەیی چین و چەمبەرە
لە چینی زوڵفی تا بەتا، خوتەن خوتەن خەتا خەتا
لە پێچی پەرچەمی هەتا نەزەر دەکەی موعەتەرە
ڕوومەتی ماهی نەخشەبی خەتی غەریبی سەر لەبی
مەتلەعی چاهی غەبغەبی خدر سەر ئابی کەوسەرە
قەدی بەلا و ئافەتە، قامەتە یا قیامەتە
نازکەری نەزاکەتە، ئافەتی سەر ڕووی کیشوەرە
(کەیفی) لەبەر گرینی تۆ کوڵکنە مەنزڵی دڵی
سینە لە بەرگرینی تۆ کون کونە میسلی پەنجەرە

سەرچاوەکان


١- کۆیە و شاعیرانی - نووسینی کەریم شارەزا - بەغدا، ١٩٦١.
٢- شاعیرە ناو ونبووەکانی کورد - نووسراوی عەلی کەمال باپیر - سلێمانی ١٩٧٣.
٣- حديقة سلطاني، تاليف محمد علي سلطاني - تهران ١٣٦٩.
٤- بەیازێکی کۆن.

# مەلا محەمەد قولی کەندۆڵەیی

١١٤٩-١٠٦٥

مەلا محەمەد قولی، کوڕی ئەحمەدی کەندۆڵەیی لە ساڵی ١٠٦٥ی کۆچی لە دێی کەندۆڵەی سەر بەکرماشان لە دایک بووە و لە منداڵیدا خەریکی خوێندن بووە و پاشان چووەتە کرماشان و ماوەیەک لە لای زانایان ڕێزمانی عەرەبی و ڕەوانبێژیی خوێندووە و لەوێوە چووەتە نەجەف و خەریکی خوێندنی شەریعەتی ئیسلام بووە و پاشان گەڕاوەتەوە زێدەکەی خۆی و پاشماوەی تەمەنی بەوانە وتنەوە و ڕێنوێنیی خەڵک بردووەتە سەر تا لە ساڵی ١١٤٩ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

مەلا محەمەد یەکێ لە هۆنەرانی گەورەی کوردە و ئەو دوو چیرۆکی بەناوەکانی: بارام و گوڵەندام و لەیلێ و مەجنوون هۆنیوەتەوە کە گەلێ شیرین و تەڕ و پاراون و چیرۆکی بارام و گوڵەندامەکەی وەکو خۆی دەڵێ لە فارسییەوە وەری گێڕاوەتەوە سەر زاراوەی گۆرانی کە لەم بارەوە دەڵێ:

شەرح داستان یەکسەر تەمامی
تەرجەمە کەردم وێنەی نیزامی
ڕیازەت کێشام بە دڵەی پڕ دەرد
وە نەزم کوردی ئاوەردم بە فەرد

واتە: ڕاڤەی ئەم چیرۆکەم بە تەواوی، وەکو نیزامی وەرگێڕاوە، گەلی ئەرکم لەسەری کێشاوە و بەدڵێکی پڕ لە ئیش، بەزمانی کوردی هۆنیمەوە بە هۆنراو.

بارام و گوڵەندام چیرۆکێکی کۆنی کوردییە و لەم چیرۆکەدا پادشایەک بەناوی کیشوەر لە خوا داوا دەکا کە کوڕێکی پێ ببەخشێ و بۆ ئەوە نزاکەی لە دەرگای خوادا قبووڵ بێ گەلێ زێو و زێڕ بەهەژاران دەبەخشێ و لە پاش ماوەیەک نزاکەی دێتە دی و خوا کوڕێکی پێ دەبەخشێ و ناوی دەنێ بارام و شا بارام ئەسپێرێتە دایەنێک تا بەخێوی بکا و کاتێ تەمەنی گەیشتە شەش ساڵان ناردییە قوتابخانە تا فێری زانست بێ و لە دوانزە ساڵیدا فێری هونەرەکانی شەڕ بوو و، ڕۆژێکیان چووە شکار و لە ڕێدا لەشکرەکەی جیا بووەوە و گەیشتە خانووچکەیەک و لەوێدا پیرەمێردێکی بینی و ئەو وێنەی کچێکی بەناوی گوڵەندام پێ پیشان دا و بارام کاتێ وێنەکەی بینی سەوداسەری بوو، ئەوسا لە دەشت و بیاوانەکان تێ پەڕی و ماوەیەک لەگەڵ دێوان و جانەوەرەکاندا بەشەڕ هات و سەرەنجام بەپرس و جۆ گەیشتە شاری دڵدارەکەی کەچی لەم کاتەدا پادشایەکی فەرەنگ دڵی لە گوڵەندام چوو بوو

بەلەشکرێکەوە هاتبووە ولاتەکەی گوڵەندام بۆ ئەوەی بەزۆر بیرفێنێ، بەلام گوڵەندام حەزی لێ نەدەکرد و ئەوە بوو بارام خۆی ئامادەی شەڕ کرد و پادشاکەی تێکشکان و کوشتی و باوکی گوڵەندام کە ئەم نەبەزییەی لە بارام دی گوڵەندامی بۆ مارەبڕی و چەند شەو و چەند ڕۆژ زەماوەنی بۆی دانا و لە پاش ماوەیەک هەردووکیان گەڕانەوە نیشتمان.

هۆنەر لە هۆنینەوەی ئەم چیرۆکەدا، لە شێوەی نیزامیی گەنجەویی پەیرەویی کردووە، وەکو لە باسی لەدایکبوونی بارامدا دەڵێ:

نۆ مـانگ و نۆ ڕۆژ جـە مـابەین ویەرد
ئاسـار حـەملش زاهیـر ئەسـەر کـەرد
بە لوتف خـالق بینای بێ هـەمـتـا
بوڵبـوڵێ وەناو گـوڵزار کـەرد صـەدا
شوستشۆش کەردن وە موشک و گوڵاب
شـازادەی نەجـیب شـای عـالی جـەناب
پێـچـاشـان وە بەرگ هـەزار ڕەنگەوە
تـوحـفـەی ئاوەردە ژ فـەرەنگەوە
شـوکـر خـودا کـەرد پادشـای کـیشـوەر
بەخـشـا وە دایان دانەی سـیم و زەر
بە حـەسـاو ڕەمڵ بە فـەرمـوودەی عـام
نـام شـەریفش نیـان وە بـارام
داشـان وەدایە شـازادە بـارام
خدمەت کەرۆ پێش ئەو شەش ساڵ تەمام
ئەوسـا سپەردش وە شـەخسێ کـاردان
تـەعلیـمش دەرۆ نـە دەشت و هـەردان
تـەمـامی کـاران عـیلم و سـواری
پیـر ئامـوزیش دا مـەرد دیاری

واتە: نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ تێ پەڕی، دووگیانی و زکپڕی ژنی شا ئاشکرا بوو، بەمێهری داهێنەری بینای بێ هاوتا، بوڵبوڵێ لەناو گوڵزار کەوتە چریکە و نەواخوانی، بە موشک و گوڵاو شۆردیان، ئەو شازادەی ڕەسەن شای هەرە بەرز، ئەویان لە جلوبەرگی هەزار ڕەنگ پێچاوە، سەوقاتی هێنراو لە فەرەنگ، پادشای کیشوەر سپاسی خوای کرد، بەدایەنەکەی

دانەی زێو و زێڕی بەخشی، بە حەساوی ڕەمڵ و بەپێی بیروڕای خەڵک، ناوی ئەویان نا بارام، دایەنێکیان بۆی گرت و شازادە بارامیان دایە ئەو، تا شەش ساڵی ڕەبەق ئەو بەخێو بکا، لە پاشا سپاردیانە پیاوێکی کارزان، تا فێری سواری و تیرەندازیی بکا، ئەو تەواوی هونەرەکانی هەر لە سوارییەوە تا زانستی تیرهاوێژی، فێری ئەو کرد ب خەلات و دیاری.

ئەوسا بارام نامەیەکی بۆ گوڵەندام نووسی کە لەم بارەوە دەڵێ:

قەڵەم گرت وەدەست بارام کیشوەر
نویسا ئەی خورشید تابان ئەنوەر
ئەگەر بە غەزەب مەپێکم بە چەنگ
نییەن وەرگەردم ژەو خاڵ سێوەنگ
هیچ نمەترسور ژ قار و قینت
عاشقم بە شەوق جام جەمینت
مەر وەختێ واچۆ نام و نیشانم
کێشۆ بە خەڵوەت بێ وە میهمانم
ئەسڵ و نەسەبم ئەگەر بزانی
منەت مەبەری تۆ بە میهمانی
گەدای بێ نیشان بێ ملک و جاهم
پای قەسرت بییەن وە تەکیەگاهم
ئەگەر مەبەخشیم بە خاڵ سیات
حەج ئەکبەرەن پەی ڕۆژ فەردات

واتە: بارام پێنووسی گرتە دەستەوە و، نووسیی ئەی هەتاوی درەوشاوە، ئەگەر بەڕقوقین من بهێنیتە چنگ، هیچ کاتێ من لە خاڵەکانی ڕەشی تۆ ڕوو وەرناگێڕم و، لە ڕق و قاری تۆش ناترسم، من سەوداسەر و گراوی جامی تەوێڵی تۆم و، ئەگەر من ناوونیشانی خۆم بە تۆ بڵێم، تۆ من بۆ مێوانی بانگ دەکەی، ڕەسەن و ڕەگەزی من ئەگەر بزانی، حەز دەکەی تۆ من مێوانی بکەی، ئێستا گەدایەکی بێ ناوونیشانم و، لەپێی کۆشکەکەتدا ئارام ئەگرم، ئەگەر من بەخاڵی ڕەشت ئەبەخشی، حەجی گەورەیە بۆ ڕۆژی دواییت.

شەوێکیان بارام باوکی خۆی لە خەودا بینی وەکو دەڵێ:

غەریبی شاران گنا بەیادش
دیش نە خاودا کیشوەر بابش

ئەوەند ژ هیجران فەرزەند گراوا
نوور بینایی چەمانش لوا
نالا بە دەرگای حەی ڕەبانی
دەلیلێ ژ لای بابۆم بکیانی
بە ئەمر و فەرمان بینای بان سەر
کیشوەر بارامش گنا بە خاتەر

واتە: ئاوارەی شارەکان کەوتە بیری، لە خەودا کیشوەری بابی دی، دی ئەوەندە لە دووریی ئەو گریاوە، کە سۆمای چاوەکانی بەجارێ ڕۆیشتووە، نالاندی بەدەرگای خوای مەزن، وتی: خوایا پەیکێکم لەلایەن بابمەوە بۆ بنێری، بە فەرمانی خوای بانی سەر، کیشوەر بارامی کەوتەوە بیر.

وتوویژی بارام و گوڵەندام وەکو دەڵێ:

گوڵ ئەندام واتش ژ کام مەکانی
بەهرام وات هەر تۆ خاوەن ئەرکانی
گوڵ ئەندام واتش وەش ئامای غەریب
بەهرام وات عومرت زیاد بۆ نەجیب
گوڵ ئەندام واتش پەی چێش ئامانی
بەهرام وات تەڵەب حوور ڕێزوانی
گوڵ ئەندام واتش پەی کێ مەگێڵی
بەهرام وات پەی تۆ تاقانەی خێڵی
گوڵ ئەندام واتش مەر نمەترسی
بەهرام وات هەواڵ ژێم نمەپرسی
گوڵ ئەندام واتش بەتۆ چ نسبەت
واتش بە غەریب واجبەن غوربەت
گوڵ ئەندام واتش تۆ نامت چێشەن
بەهرام وات خۆ من دەروونم ڕێشەن
گوڵ ئەندام واتش دیارەن هوشیاری
بەهرام وات بەڵێ تۆ پەی من یاری
گوڵ ئەندام واتش نمەدت پۆشان
بەهرام وات پەرێت عەشقم خرۆشان

گــوڵ ئەندام لوا نیـــشـت وە باڵنێش
گــۆش دا بە نـاڵەی ســـۆز نـاڵێنـش

واتە: گـوڵەندام وتـی خـەڵکی کـوێی، بارام وتی هـەر تۆ خـاوەن پلەوپایەی، گوڵەندام وتی بەخێر بێی، بارام وتی تەمـەنت زیاد بێ، گوڵەندام وتی لەبەرچی هاتی، بارام وتی بەشوێن پەرییـەکـدا هاتووم، گـوڵەندام وتـی بۆ کێ ئەگـەڕی، بـارام وتی بۆ تۆ کـە تاقـانـەی خـێـڵـی، گـوڵەندام وتـی مـەگـەر ناترسی، بـارام وتی تۆ هـەواڵم ناپرسی، گـوڵەنـدام وتی ئەمـە چ پەیوەندییەکی بەتۆوە هەیە؟، بارام وتی ئاوارەیی بۆ ئاوارە پێویستە، گوڵەندام وتی تۆ ناوت چییە؟، بارام وتـی خۆ من دەروونم بریندارە، گوڵەندام وتی دیارە وشـیـاری، بارام وتی بەڵێ تۆ بۆ من یاری، گـوڵەندام وتـی نەوت لەبەر کـردووە، بارام وتـی ئەوینـم بۆ تۆ خـرۆشـاوە، گوڵەندام ڕۆیشت دانیشت لەسەرینیەوە، گوێی دایە ناڵەی سۆزی دەروونی.

سەرچاوەکان
١- نوسخەی دەستنووسی بارام و گوڵەندام.
٢- بەیازێکی کۆن.
٣- یاداشتەکانی خۆم سەبارەت بە مەلا محەمەدی کەندوڵەیی.

## میرسادقی دینەوەری

١٢٨٣ - ١٣١٨

میرسـادقی کوڕی مـازیاری دینەوەری لە سـاڵی ١٣١٨ی کۆچی لە دینەوەردا لە دایک بووە و لە منداڵیدا فێری قورئانی پیرۆز بووە و پاشـان لـەلای زانایانی ئاینی ڕێزمانـی عـەرەبی و ڕەوانبێژی و پیـتـۆڵیی خوێندووە و لـە لاویەتیدا چووەتە هـەورامـان و مـاوەیەک لەلای زانایان وێژەی فارسیی خوێندووە و لەوێوە ڕۆیشـتـووەتە دێی تووت شامی و چاوی کەوتووەتە سەی براکە و مـاوەیەک لەلای ماوەتەوە لـە پاشا چووەتە گـەڕان و گـەلێ مـەڵبەند و شار گەڕاوە و لەم گەڕانەدا لەگەڵ گەلێ لە هۆنەران و زانایاندا ئاشنابووە و سەرئەنجام گەڕاوەتەوە زێد و مەڵبەندەکەی خۆی و پاشماوەی تەمەنی بەوانەوتنەوە و ڕێنوێنیی خەڵک بردووەتە سەر تا لە ساڵی ١٢٨٣ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

مـیرسـادق یەکێ لە هۆنەرانی هـەرە بەرزی کـوردە و ئەو گـەلێ هۆنراوی جـوانی بەزاراوەی شـیـرینی گۆرانی هۆنیـوەتەوە کـە ئەوا لێرەدا دوو پارچـە هـەڵبـەسـتی ئەو لەژێر سـەر دێری: ناوی مانگەکان و ناوی ڕۆژەکان لێرەدا دێنین و لەسەریان دەکۆڵینەوە و شییان دەکەینەوە.

کوردەکـان هـەر لەمێژەوە سـاڵیـان دابەش کردبووە دوانزە مـانگ و هـەر مانگێکیـان بەناوی

یەکێ لە فریشتەکانەوە ناونابوو و، ناوی ئەم مانگانە لە پەڕتووکی ئاڤێستادا نووسراوە و زۆربەی کوردەکان هەر لە کۆنەوە ئەم ناوانەیان بەکار بردوون. میرسادقی دینەوەری ناوی ئەم دوانزە مانگەی لە پارچە هەڵبەستێکیدا هێناوە. ئەوەش دەبێ بڵێین کە جگە لەم ناوانە لەناو هۆزەکانی کوردا بۆ مانگەکانی ساڵ هەندێ ناوی تر هەیە کە ئەو ناوانە نوێنگەی وەرزەکانی ساڵ و ژیانی جانەوەرەکان و پەلەوەران و ڕووەکەکان و ڕێ و ڕەوشتی وەرزێران و کشتوکاڵ و مالاتدارین و لە ڕاستەقینەدا ڕۆژئەژمێری کوردی لەسەر ژیانی کۆمەلایەتی و ئاڵوگۆڕی ئاووهەوا و ژیانی ولّسات دانراوە. ناوی مانگەکـن کە لەناو خەڵکدا باوە بەم جۆرەیە:

١- خاکەلێوە- کە ناوی یەکەمین مانگی کوردییە و بریتییە لە ئاڵوگۆڕی خاک و سروشت و ئەم مانگە لە مەڵبەندەکانی تری کوردستاندا بەناوی نەورۆز مانگ و دارپشکێو و بەرەجەژنان ناسراوە.

٢- بانەمەڕ- کە دووەمین مانگی بەهار و بەواتای لەوەڕگەی مەڕومالاتە و ئەم مانگە لە ناوچەکانی تری کوردستاندا گولان و شەستەباران و هێلانەمە و بازەبەرانی پێ دەڵێن.

٣- جۆزەردان- کە مانگی سێیەمی بەهارە و لە هەندێ شوێنی تری کوردستاندا بەم مانگە بەختەباران و باران بڕان دەوترێ.

٤- پووشپەڕ- کە ناوی یەکەمین مانگی هاوینە و لە هەندێ ناوچەی تری کوردستاندا بەم مانگە پەڕپەڕ و مرداره مانگ و تیرمە دەڵێن. ئەم مانگە وشەی ئەپەئووشەی ئاڤێستاییمان دەخاتە بیر کە بەواتای دێوی وشکییە.

٥- گەلاوێژ- کە ناوی دووەمین مانگی هاوینە و بریتییە لە ئەستێرەیەک کە ساڵێ دووجار لە ئاسماندا دەردەکەوێ و ئەم مانگە لە هەرێمەکانی تری کوردستاندا جۆخینان و میوەگەنانی پێ دەوترێ.

٦- خەرمانان- کە ناوی سێیەمین مانگی هاوینە و بەم مانگە تەباخیش دەڵێن کە بەواتای تێ و تاوی زەوییە.

٧- ڕەزبەر- کە ناوی یەکەمین مانگی پایزە و بەم مانگە مێشپەڕ و میران و باران پەڵەش دەڵێن.

٨- خەزەڵوەر- کە ناوی دووەمین مانگی پایزە و بەواتای گەلاڕێزانە و لە مەڵبەندەکانی تری کوردستانا بەم مانگە گەلاڕێزان و چریاپێشین دەڵێن.

٩- سیخوارکە- ناوی سێیەمین مانگی پایز و بەواتای زوقمە و لە هەندێ شوێنی تری کوردستانا بەم مانگە چریاپاشین و کەوبەرداریش دەڵێن.

١٠- بەفرانبار- کە ناوی یەکەمین مانگی زستانە و لە هەندێ شوێنی تری کوردستاندا بەم مانگە سەرماوەزیش دەوترێ.

١١- ریبەندان- کە ناوی دووەمین مانگی زستانە و بەم مانگەسەهۆڵ بەندانیش دەڵێن.

١٢- ڕەشەمە- کە ناوی سێیەمین مانگی زستانە و لەم مانگەدا پشیلەکان دێنە باو ئەپەڕنە سەر یەک و لە هەندێ مەڵبەندی تری کوردستاندا بەم مانگە پۆلانیش دەڵێن.

ناوی مانگەکان کە لە ڕابردوودا لەناو کوردەکاندا باو بووە، بریتین لە: (فرۆدان، ئەرتەوەهێشت، هەرۆتات، تیشتەر، ئەمرتات، شەتەروەر، میترە، ئاوان، ئاهر، دەتۆش، وەهمەن، سپەندارمەز) کە ئەوا لێرەدا لەسەریان دەکۆڵینەوە، وەکو میر سادق دەڵێ:

وەرینان واتن ساڵ دوانزە مانگەن

هەر مانگێ وێنەی ملک شەشدانگەن

واتە: پێشینان وتیان ساڵ دوانزە مانگە

وە هەر مانگێک وەکو پارچە زەویەکی شەش دانگە

کورد هەر لەمێژەوە ساڵ ناسی بوو، بەڵام دابەشکردنی ساڵ بەچوار وەرز و دوانزە مانگ دیارە لە دوای ناسینی ساڵ پێکهاتووە. لە ئاڤێستادا نووسراوە یەکەمین پەڵە زەوییەک کە ئەهوورامەزدا بەدیی هێنا ناوی ئێران وێج بوو کە ئەهریمەن لەوەدا ئەژدیهایێ سووری داهێنا و مەبەست لە ئەژدیهای سوور کێوی ئاوریژێنە و کوردەکان لە دوای ناسینی ساڵ و چوار وەرز، مانگیشیان ناسی و هەر مانگێکیان بەناوی فریشتەیەکەوە ناونا کە ناوەکانیان لە پەڕاوی ئاڤێستادا نووسراون.

هەر مانگێ پەڕێ بەنەن وە بالاش

هەر پەڕێ سەد ڕەنگ مەنمانۆ کالاش

واتە: هەر مانگێ پەڕێ بەسەر قەد و بالایا بەند بووە

وە هەر پەڕێکیش سەد ڕەنگ دەنوێنێ وەکو کالایەکی باییدارە

مانگەکان لە چاوی کوردکانەوە دیارە جوان بووە، بۆیە هۆنەر ئەوانەی بەپەلەوەر چواندووە، چونکە هەر وەرزێک داگری سێ مانگ بووە و هەر مانگێکی بریتی بووە لە سی ڕۆژ کە کوردەکان بۆ هەر ڕۆژێکی ناوێکیان داناوە و ئەو ناوانەش لە پەڕتووکی ئاڤێستادا هاتووە.

مانگ یەکەمش مای فرۆدانەن

گوڵ و وەنەوشە پڕ لە هەردانەن

واتە: مانگی یەکەمی ناوی فرۆدانە

گوڵ و وەنەوشە پڕ لە هەردو کێوانە

وشەی فرۆدان کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا فرەوەرتی و لە پەهلەویدا فەروەرتین و لە پارسی کۆندا فرەوەرتینام و لە فارسیدا فەروەردینە و ناوی یەکەمین مانگی ساڵە و هەروەها ناوی نۆزدەهەمین رۆژی زەردەشتییەکانە و فرەوەهەر پارێزەری مرۆ و جانەوەر و ئاو و با و ئاور و خاکە.

مـــانگ دوەمش ئەرتەوەهێشتەن

ئای ئای کوردستان وێنەی بەهەشتەن

واتە: مانگی دووەمی ناوی ئەرتەوەهێشتە

ئای ئای کوردستان وەکو بەهەشت وایە

ئەرتەوەهێشت کە دیاردی پێ کراوە لە ئاڤێستاییدا ئەشەوەهیشتەیە و لە پەهلەویدا ئەرتەوەهیشت و لە فارسیدا ئوردی بەهەشتە و ناوی مانگی دووەمی ساڵە و بەواتای باشترین راستییە و لە ئاڤێستادا نووسراوە کە ئەشەوەهیشت نوێنەری راستی و دروستی و پاکییە و لە جیهاندا پاسەوانی تەواوی ئاگرەکانی ڕووی زەوی بەئەو سپێرراوە.

مـانگ سێوەمش مـانگ هەرۆتاتەن

مـــانگ هەلاڵە و گـــەزیزە و واتەن

واتە: مانگی سێیەمی مانگ هەرۆتاتە

مانگی هەلاڵە سوورە و گەزیزە و بایە

وشەی هەرۆتات کە دیاردیی پێ کراوە، لە ئاڤێستادا هەئوورووەتات و لە پەهلەویدا خوردات و لە فارسیدا خورداده و ناوی سێیەمین مانگی ساڵە و بریتییە لە یەکێ لە فریشتەکان کە بەواتای لەش ساخییە. بەپێی پەڕاوی ئاڤێستا هەرۆتات بەسەر خەڵکا فەرمانڕەوایی دەکا و ئەو دەبێتە هۆی سەوزبوونی ڕووەکەکان و میوەی دارەکان و هەر ئەو دارەکان دەپارێزێ و لەم رۆژەدا خەڵک ستایشی یەزدان دەکەن و جەژن دەگرن و دەپاڕێنەوە.

مـانگ چوارەمش مـانگ تیشتەرەن

کەژ و کۆ و دەشت نەی دەم وەشتەرەن

واتە: مانگی چوارەمی ناوی تیشتەرە

کەژوکێو و دەشت لەم دەمەدا خۆشترە

وشەی تیشتەر کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستاییدا تیشتریە و لە پەهلەوی و فارسیدا تیرە و ناوی چوارەمین مانگی ساڵە و هەروەها ناوی یەکێ لەو چوار ئەستێرانەیە کە کوردەکان بڕوایان پێیان بووە و ناوی یەکێ لە فریشتەکانە کە هەندێ ئەو بەفریشتەی ڕۆزی دادەنێن. بەپێی پەڕاوی ئاڤێستا ئەم فریشتە باران دەبارێنێ و خەڵک دەبێ ڕێزی بۆ دانێن و ستایشی کەن. بەپێی ئەفسانەکانی کۆن لەم ڕۆژەدا بوو کە ئەفراسیاو بەسەر خەڵکا زاڵ بوو، ئەوسا مەنووچێر هێرشی بردە سەر تورانییەکان و سەرئەنجام هاتنە سەر ئەوە کە ئارەش تیرێ بهاوێژێ و تیرەکە لە هەر کوێدا دابەزی ئەو شوێنە بکەنە سنوور و ئارەش تیرەکەی هاوێشت و لە کەناری ڕووباری ئامۆندا دابەزی و ئەوسا ئەو شوێنە بووە سنوور و پاشان ئەو ڕۆژەیان جەژن گرت کە بەجەژنی تیریگان ناسراوە.

مانگ پەنجمش مانگ ئەمرتاتەن

مانگ بێ مەرگی و کام و هاواتەن

واتە: مانگی پێنجەمی ناوی ئەمرتاتە

ئەم مانگە مانگی بێ مەرگی و هیوا و ئاواتە

ئەمرتات کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستایی و پەهلەویدا ئەمرتاتە و لە فارسیدا مورداد و ناوی یەکێ لە فریشتەکانە کە پارێزەری گیا و ڕووەکەکانە و لەم ڕۆژەدا خەڵک جەژن دەگرن و بەم جەژنە لیلوویەڕ دەڵێن. ئەبووڕێحانی بیروونی دەڵێ: ئەمرتات فریشتەیەکە کە جیهان و خواردەمەنی و دەوا گیاییەکان دەپارێزێ بۆیە خەڵک ستایشی دەکەن.

مانگ شەشەمش مانگ شەتەرووەرەن

مانگ هەسارە و ئافتاو و وەرەن

واتە: مانگی شەشەمی مانگی شەتەرووەرە

مانگی ئەستێرە و هەتاو و خۆرە

وشەی شەتەروەر کە دیاردیی پێ کراوە لە زمانی ئاڤێستاییدا خشەترە وە ئیریەیە و لە پەهلەویدا شەترەووەرە و لە فارسیدا شاریوەرە و ناوی شەشەمین مانگی ساڵ و یەکێ لە فریشتەکانە کە پارێزەری ئاورە. ئەبووڕێحانی بیروونی دەڵێ: ڕۆژی چوارەمی شاریوەر خەڵک جەژن دەگرن و شاریوەر یەکێ لە فرێشتەکانە کە پارێزەری زێڕ و زێو و ئەردزینە.

مانگ هەفتەمش هەر مانگ میترەن

مانگ شایی و وەشی و براتی و مێهرەن

واتە: مانگی حەوتەمی هەر مانگی میترەیە

مانگی شایی و خۆشی و برایی و خۆشەویستییە

وشەی میترە کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستایی و لە پەهلەویدا میترەیە و لە فارسیدا مێهرە و حەوتەمین مانگی ساڵە و ناوی یەکێ لە فریشتەکانە. لە ئاڤێستادا ئەم فریشتە بەیەکێ لە گەورەترین فریشتەکان دێتە ژمار و لە بەردە نووسراوەکانی هەخامەنشیشدا بەم فریشتە دیاردی کراوە. میترە سامان و دارایی بەخەڵک دەبەخشی و بنەماڵەکان شاد دەکا و خان و مانی دوژمنەکان خاپوور دەکا و بەیارانی پاداشت دەبەخشێ و نەیاران و تاوانباران دەگەینێتە سزای خۆیان.

مانگ هەشتەمش مانگ ئاوانەن

مانگ ئاویاری دەشت و کاوانەن

واتە: مانگی هەشتەمی مانگی ئاوانە

مانگی ئاودێری دەشت و کێوەکانە

وشەی ئاوان کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستاییدا ئەپەم و لە پەهلەویدا ئاپان و لە فارسیدا ئابانە و ناوی هەشتەمین مانگی ساڵە و ئەم فریشتە پارێزەری ئاوە و لە دەوری کۆندا پیس کردنی ئاو بەیەکێ لە گوناهە گەورەکان دەهاتە ژمار بۆیە لەسەر چەم و ڕووبارەکاندا پردیان دەبەست تا مەڕوماڵات و چوار پێیان بەسەریا تێپەڕن و ئاوەکە لێڵ نەکەن.

مانگ نۆهەمش مانگ ئاهرەن

زێڵ جە پەژارە یەکسەر باهرەن

واتە: مانگی نۆهەمی ناوی مانگی ئاورە

دڵ لە خەم و پەژارە بەتەواوی خاڵییە

وشەی ئاهر کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستاییدا ئاتەر و لە پەهلەویدا ئاتوور و لە فارسیدا ئازەرە و بەواتای ئاگرە و ناوی نۆیەمین مانگی ساڵ و فریشتەیەکە کە پارێزەری ئاورەکانی ڕووی زەوییە. لە دەوری کۆنا سێ جۆر ئاگر هەبوو کە گرنگترینی ئەوانە ئازەر گۆشەسپ یا ئاوری لەشکرەکان بوو و، ئاورگای ئازەر گوشەسپ لە شاری شیزی نزیکی تیکانتەپەی هەوشاردایە و بەشێک بووە لە خاکی مادی ئاتروپاتی و پادشایان ساسانی بەپێی خاوسەوە دەچوونە دیتنی ئەو ئاگر گایە و لەوێدا لە خوای مەزن دەپاڕانەوە.

مانگ دەهەمش مانگ دەتۆشەن

هەر کەسێ پاک بۆ ئەو خاوەن هۆشەن

واته: مانگی دەهەمی ناوی دەتۆشە
هەر کەسێک پاک بێ ئەو خاوەن هۆشە

وشەی دەتۆش کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا دەتۆشووە و لە پەهلەویدا دەدووە و لە فارسیدا دەیە و ناوی دەیەمین مانگی ساڵە و هەروەها ناوی فریشتەیەکە و ئەم وشە بەواتای بەدیهێنەر و ئافەریننەدەیە.

مانگ یانزەهەمش مانگ وەهمەنەن
مانگ پاکان و مێردان وەنەن

واتە: مانگی یانزەهەمی مانگی وەهمەنە
مانگی پاکان و مێردانی نەبەز و بێ باکە

وشەی وەهمەن کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستاییدا وەهوومەنەیە و لە پەهلەویدا و هوومەن و لە فارسیدا بەهمەنە و ناوی یانزەیەمین مانگی ساڵ و یەکێ لە فریشتەکانە کە نوێنگەی بیری چاکە. بەپێی چیرۆکەکانی ئاینی وەهمەن بوو کە گیانی زەردەشتی لەکاتی خەوا بردە بارەگای پاکی ئەهوورامەزدا بۆیە ئەو نزیکترین فریشتەیە بەخوا و پلەوپایەیەکی بەرزی هەیە. ئەم فریشتە پارێزەری گا و مەڕوماڵاتە و جەژنی سەدە کە یەکێ لە جەژنەکانە پەیوەندیی بەم مانگەوە هەیە.

مانگ دوانزەهەمش سپەندارمەزەن
مانگ ژەنان و دوێتان و گەزەن

واتە: مانگی دوانزەیەمی ناوی سپەندارمەزە
مانگی ژنان و کچانی شۆخوشەنگە

وشەی سپەندارمەز کە دیاردیی پێ کراوە لە زمانی ئاڤێستاییدا سپەنتە ئارمەئیتییە و لە پەهلەویدا سپەندارمەت و لە فارسیدا ئەسفەندە و ناوی دوانزەیەمین مانگە و بەیەکێ لە فریشتەکان دێتە ژمار کە پارازتنی زەوی دراوەتە ئەو ئەو بەنوێنگەی ئەوین و خۆشەویستی خوایی دادەنێن. ئەبووڕێحانی بیروونی دەڵێ: سپەندارمەز ناوی دوانزەیەمین مانگی ساڵە و هەروەها ناوی فرێشتەیەکە کە زەوی دەپارێزێ و ئەوین دەخاتە دڵانەوە و، لە رابردوودا ژنەکان لەم مانگەدا جەژنیان دەگرت و پیاوان دیارییان بۆیان دەبرد و ئەم رێ و رەوشتە ئێستاش لەناو خەڵکدا باوە.

(سادق) گوفتارت خەیلێ شیرینەن
بێ گومان ئانە واتەی دێرینەن

واتە: ئەی سادق قسەکانت گەلێ شیرینە
بێ گومان ئەم قسانە هی دەوری کۆنە

مەبەست لە دەوری کۆن کە هۆنەر دیاردیی پێ کردووە، دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی بەر لە ئیسلام کە ئەو کاتە کوردەکان زەردەشتی بوون و، ناوی ئەم دوانزە مانگە کە باسمان لێوە کرد لە ناوی دوانزە فریشتەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەمانە پەیوەندییان بەئاینی زەردەشتەوە بووە.

کوردەکان بێ شک گەلێ لە ڕێ و ڕەوشتەکانی کۆنی باوباپیرانیان پاراستووە و لەبەرئەوەی سەرەتا زەردەشتی بوون ناوی ڕۆژەکانیان لەناوی فریشتەکانەوە وەرگرتووە و پاسەوانی هەر ڕۆژێکیان سپاردووەتە فریشتەیەک و هەر کام لەم ڕۆژانە ناوێکی تایبەتی بووە کە ناوی دوانزە مانگیش لەناو ئەو ناوانەدا دەبینرێ و، لە ڕۆژدەژمێری کۆنی کوردیدا هەر کاتێ ناوی ڕۆژ لەگەڵ ناوی مانگدا یەک بگرێ ئەو ڕۆژە دەکەنە جەژن بۆ وێنە بەڕۆژی شانزەمی مانگی میترە ئەیانوت میترەگان.

ناوەکانی سی ڕۆژ کە لە پەڕتووکی ئاڤێستا سەرچاوەیی گرتووە، لەڕابردوودا لەناوی کوردەکاندا باو بووە و لە دوای ئیسلام ئەو ناوانە کەم کەم لەبیرچووەوە، بەڵام ناوە کوردییەکان لەگەڵ ناوەکانی ئاڤێستایی و پەهلەوی و سوغدی و خارەزمی و فارسیدا تۆفیری هەیە و ئێمە لێرەدا لە بارەیانەوە دەدوێین.

ناوی ڕۆژەکان کە لە ڕابردوودا لەناو کوردەکاندا باو بوون بەم چەشنەیە: (هۆرمز، وەهمەن، ئەرتەوەهێشت، شەتەروەر، سپەندارمەز، هەرۆتات، ئەمرتات، دەتۆش، ئاهر، ئاوان، وەر، مانگ، تیشتەر، دەرەسپ، دەژەن، میترە، سرۆش، ڕەش، فرۆدان، بارام، ڕام، وا، دەزوە، دین، ئەرت، ئەشتات، ئاسمان، زام، ماراسپەند، ئەنغەر).

ناوی ڕۆژەکانی حەوتە کە لە دوای ئیسلام لە کوردستاندا برەویان پەیدا کرد سەرەتا بەهۆی جوولەکەکانەوە بڵاو بوونەوە، چونکە جوولەکەکان لە دەوری ساسانییەکاندا پتر لە شاری کورد ئاوا و مادایان و ئاوربایگان و هەمەداندا دەژیان و ئەوان ناوی ڕۆژەکانی حەوتەیان دانا و کاتێ کە ئیسلام سەری هەڵدا و موسڵمانەکان کوردستانیان داگیر کرد بەهۆی ڕۆژی هەینی و نوێژی هەینییەوە ئەو ناوانەیان بەکار برد، چونکە جوولەکەکان بەڕۆژی یەکەمی حەوتە شابەتیان دەوت کە بەواتای پشوودانە و ئەم ناوە لە زمانی سریانیدا شەبتە و لە زمانی ئەکەدیدا شەباتوویە و لە عەرەبیدا بووەتە سەبت و لە پەهلەویدا شونبەتە و لە فارسیدا شەنبە و لە کوردیدا بووەتە شەمە و لە ڕاستەقینەدا شەمە هەر شەبتی عبرییە کە جوولەکەکان بەکاریان دەبرد کە پاشان وشەکانی یەکشەممە و

دووشـەممە و سـێشـەممە و چوارشـەممە و پێنجشـەممە لەناو کوردەکـاندا باو بوون و، لەبەرئەوەی موسڵمانان بەدوارۆژی حەوتە (یوم الزینە)یان ئەوت کوردەکان وشەی هەینییان لە چاوگی ئادین بەواتای ڕازانەوە وەرگرت و بەکاریان برد.

میرسادقی دینەوەری لە یەکێ لە پارچە هەڵبەستەکانیدا ناوی ئەو سی رۆژەی هێناوە کە بۆ ئێمـە زۆر گرنگە و ئەوا لێرەدا ئەو هۆنراوانە دەخـەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە و، ئەو ئەفسانە و چیرۆکانە کە لە بارەی رۆژەکـانەوە هاتووە دێنێ. میرسـادق سـەرەتای پارچە هەڵبەستەکەی بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

وەرینـان واتن هەر مـانگ سی رۆچەن

هەر کام چون ئافتاو برێ و ئەفرۆچەن

واتە: پێشینان وتیان هەر مانگ سی رۆژە

هەر کام لەو رۆژانە وەکو هەتاو دەدرەوشێتەوە

کوردەکان لە ڕابردوودا مـانگیان دابەش کردبووە سی رۆژ کە دوانزە مـانگەکەی دەبووە سێسـەد و شـەست رۆژ و کەچی سـاڵ سێسـەد و شـەست و پێنـج رۆژە و پێنج رۆژ و چەند کاژمێری دەمـایەوە و لە دەوری کـۆنا هەر سـەد و بیـست سـاڵ جارێک ئەو رۆژانەیان کۆ دەکردەوە و تا دەبووە سی رۆژ و دەیانکردە سێنزە مانگ و ئەو مانگەیان جەژنی دەگرت.

رۆژ یەکـــــەمش نامش هۆرمـــــزەن

وەبێ نام ئەو گـــرد مـــات و کـــزەن

واتە: رۆژی یەکەمی ناوی هۆرمزە

وە بێ ناوی ئەو هەموو مات و کزن

وشـەی هۆرمز کـە دیاردی پێ کراوە بەواتای گـەورە و سـەرۆک و خـوایە. لە ئاڤێستـادا نووسـراوە کە هۆرمز زانایەکی هەرە بەرزە و ئەو لە هەمـوو شتێک تەنانەت لە ڕووداوەکـانی رابردوو و، داهـاتوو ئاگەدارە و ئەوبوو کە بنیادەمی خـوڵقاند و زەوی و ئاسمانی بەدی هێنا و رۆشنایی خستە جیهانەوە.

دووەمـین رۆژش وەهـمـــــەنەن نـامش

هەر کـەس دڵپـاک بۆ ئـەو بۆ وەکـامش

واتە: دووەمین ڕۆژی ناوی وەهمەنە

هەر کەسێک دڵپاک بێ ئەو هیوای دێنێتە دی

وشـەی وەهمـەن کە دیاردی پێ کراوە لـە ئاڤێستـادا وە هوومـەنە و بەواتای بیری چاکە و

وەهمەن یەکەمین ئافەریدەی هۆرمزە و لە سەرتاسەری ئاڤێستادا لە بارەی ئەوەوە قسە کراوە و بەپێی پەڕاوی بوندهشن ئەو نزیکترین پێغەمبەر و فریشتەی هۆرمزە و کەڵەشێر کە بەیانیان ئەقووقێنێ و خەڵک لە خەو هەڵدەسێنێ تایبەتی وەهمەنە و هەر وەهمەن بوو کە گیانی زەردەشتی لە کاتی خەوا بردە بارەگای هۆرمز.

سێهەمین رۆژش ئەرتەوەهێشتەن

هەر کەسێ راست بۆ جاگەش بەهەشتەن

واتە: سێیەمین رۆژی ناوی ئەرتەوەهێشتە

هەر کەسێک راست بێ جێگای بەهەشتە

وشەی ئەرتەوەهێشت کە لە ئاڤێستادا ئەشاوەهیشتە ناوی یەکێ لە فریشتەکانە و پاسەوانیی ئاور دراوەتە ئەو و ئەو هەمووی ئاگرەکان دەپارێزێ و ناهێڵێ بکوژێنەوە و، هەر لەبەر ئەمەیە پلەوپایەیەکی بەرزی هەیە.

چوارەمین رۆژش هەر شەتەروەرەن

هەر ئەو یاوەر مێرد بێوەرەن

واتە: چوارەمین رۆژی ناوی شەتەروەرە

هەر ئەو یار و یاوەری مێردی بێ بەری و نائومێدە

وشەی شەتەروەر کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستا خسترەوە ئیرییە کە لە پەهلەویدا شەتریوەرە و بەیەکێ لە فریشتەکانی ئەمشاسپەنتا دێتە ژمار و رۆژی چوارەمی هەر مانگ بەو سپێرراوە و ئەو یار و یاوەری دەروێشان و هەژارانە.

پەنجەمین رۆژش سپەندار مەزەن

پەرێ گرد ژەنان بەوێنەی گەزەن

واتە: پێنجمین رۆژی، رۆژی سپەندارمەزە

وە ئەو بۆ هەمووی ژنان وەکو گەز وایە

وشەی سپەندارمەز کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا سپەنتەئارمەئیتییە و لە پەهلەویدا سپەندارمەتە و یەکێ لە فرێشتەکانی ئەمشاسپەنتایە و بەواتای خۆ بەکەم زانینە و ئەم فرێشتە پاسەوانی زەوییە و پارازتنی خاک وزەوی بەئەو سپێرراوە.

شەشەمین رۆژش هەرۆتات رۆژەن

زێڵ کناچان پەرێش و سۆژەن

واتە: شەشمین رۆژی ناوی هەرۆتانە

دڵی کچەکانی بۆ دەگرێ

وشـەی هەرۆتات کـە دیاردیی پێ کـراوە لە ئاڤـێسـتـادا هەئوورەوەتاتـە و لە پەهلـەویدا خـورداتە و بەیەکێ لە فریشـتـەکـانی ئەمشـاسـپەنـتـان دێتـە ژمـار و بەواتای دروسـتی و راستییە و پاراستنی ئاوەکان بەئەو سپێرراوە و هۆرمز ئەوی بۆ حەسانەوە و هێمنی خەڵک بەدی هێناوە و هەموو دەبێ هەر رۆژی ئەو ستایش بکەن.

هـەفــتــمین رۆژش رۆژ ئـەمــرتاتـەن

رۆژ بێ مـەرگـی و کـام و شـێـتـاتـەن

واتە: حەوتەمین ڕۆژی ناوی ئەمرتاتە

ڕۆژی بێ مەرگی و کام و شادمانییە

وشەی ئەمرتات کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستا و پـەهلەویشدا هەر ئەمرتاتە و بەواتای بێ مـەرگییـە و ناوی یەکێ لە فریشتـەکانی ئەمشـاسپەنتایە و پارازتنی گیـا و ڕووەکەکـان بەئەو سپێرراوە.

هەشـتــەمین رۆژش، ڕۆژ دەتۆشــەن

هـەرچی کـــە دارۆ ئەو پەرێ تـۆشــەن

واتە: هەشتەمین رۆژی ناوی دەتۆشە

ئەو هەرچێکی هەیە هەر بۆ تۆیە

وشەی دەتۆش کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا دەتووشـەیە و لە پەهلەویدا دەزوەیە کە بەواتای داهێنەر و خـوڵقێنەرە و بەپێی ئاڤێسـتـا خـەڵک لەم رۆژەدا دەبێ سـەریان بشـۆن و ناخوێنەکانیان بگرن و خۆیان پاک و خاوێن بکەنەوە تاهۆرمز خذشی لێیان بێ.

نـۆهـەمــین رۆژش ئــاهــرەن هــەر رۆ

ســرۆشــیـش مــەیۆ ڕەم بێـدار کـەرۆ

واتە: نۆیەمین رۆژی ناوی ئاگرە و هەر رۆ

سرۆش دێت و خەڵک لە خەو وریا دەکاتەوە

وشـەی ئاهێر کـە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێسـتـادا ئاتەر و لە پەهلـەویدا ئاتوورە و ناوی یەکێ لە فـریشتەکانە و ئەو هەمووی ئاگرەکانی جیـهـان دەپارێزێ و پاسـەوانی ئاورگـاکانی پێ دراوە و ناهێڵێ بکوژێنەوە و، هەر ئەو داوا لە سرۆش دەکا کە خەڵک لەخەو هەڵسێنێ.

دەهــەمــین رۆژش ئــاو و ئــاوانــەن

ئاو پەی گـرد کـەسێ وێنەی دەرمـانەن

واتە: دەهەمین رۆژی ئاو و ئاوەکانە

ئاو بۆ هەموو کەسێک وەکو دەرمان وایە

وشەی ئاوان کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا ئەپەم و لە پەهلەویدا ئاپانە و بەواتای ئاوەکان و کاتی ئاوە، هەروەها ناوی فریشتەیەکە کە ئاوەکان دەپارێزێ و، ئاو لەناو کوردەکاندا زۆر پیرۆز بووە و پیس کردنی ئاو گوناهێکی زۆر گەورە بووە و هەرگیز ئاویان پیس نەدەکرد و فریشتەیەکی تری ئاو کە ناوی ئەناهێتا یا نەهیە بووە ئەرکی ئەو ئەوەبووە کە بەژنان کۆمەک بکا تا بەئاسانی منداڵیان ببێ.

یانزەهەمین رۆژ ئافتاو وەرەن

ئانە رۆشنی و چرای داوەرەن

واتە: یانزەهەمین رۆژ، رۆژی هەتاو و خۆرە

ئەمە رۆشنی و چرای خوای داوەرە

وەر کە دیاردی پێ کراوە لە ئاڤێستادا هورەخشەئیتەیە و لە پەهلەویدا خوەرشێتە و ناوی یانزەمین رۆژی هەر مانگە و هەر لە دەوری کۆنەوە تیشک و رۆشنایی لەناوی کوردەکاندا ستایش کراوە و لە ئاڤێستادا خۆر بەچاوی هۆرمز چوانرایە و زەردەشتییەکان هەموو رۆژێ سێ جار ڕوودەکەنە خۆر و ستایشی دەکەن واتە: لەکاتی بەرەبەیان و نیوەڕۆ و ئێوارەدا.

دوانزەهەمین رۆژ هەر رۆژ مانگەن

پەرێ شەوەزەنگ چرای شەش دانگەن

واتە: دوانزەهەمین رۆژ هەر رۆژی مانگە

بۆ شەوەزەنگ وەوو چرای شەش دانگە

وشەی مانگ کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا ماونگەیە و لە پەهلەویدا مایە و ناوی دوانزەمین رۆژی مانگە و مانگ هەر لە مێژەوە لەلایەن کوردانەوە ستایش کراوە و هەروەها ناوی فریشتەیەکە کە پاسەوانیی ڕوەک و گیاکان و دارەکان بەئەستۆی ئەوەیە.

سێنزەهەمین رۆژ تیشتەرەن یاران

هەر ئەوەن مەبۆ وە ئەور و باران

واتە: سێنزەمین رۆژ رۆژی تیشتەرە ئەی یاران

هەر ئەوە کە دەبێ بەهەور و باران

تیشتەر کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا تیشتریەیە و لە پەهلەوی و فارسیدا تیرە و

ناوی سێنزەمین ڕۆژە و بەپێی ئاوێستا تیشتەر فریشتەی بارانە و ناوی ڕووناکترین ئەستێرەیە و سەرۆکی هەمووی فریشتەکانە و هۆرمز ئەوی کردە سەرۆک و هەر ئەوبوو کە زەردەشتی ڕێنوێنی کرد و ئەهریمەن نەیتوانی فریوی بدا و لەڕێ دەری بکا.

چواردەهەمین ڕۆژ، ڕۆژ دەرەسپەن

ئەو ڕۆژە وێنەی ئازەرگوشەسپەن

واتە: چواردەمین ڕۆژ، ڕۆژی دەرەسپە

ئەو ڕۆژە وەکو ئازەرگوشەسپە

وشەی دەرەسپ کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا درواسپەیە و لە پەهلەویدا گۆشە و ناوی چواردەمین ڕۆژی مانگە و هەروەها ناوی یەکێ لە فریشتەکانە کە جانەوەرەکان دەپارێزێ. ئەبوو ڕێحان دەڵێ: ڕۆژی چواردەم ڕۆژی گۆشە کە بەو ڕۆژەش سیرسووریش دەڵێن و لەم ڕۆژەدا خەڵک شەراو دەخۆنەوە و هەروەها سیر و پیازیش دەخۆن بۆ ئەوەی بەساخی بمێننەوە.

پانزەهەمین ڕۆژ مەواجن دەزەن

ڕۆژ سرۆش و وەشکەل و ڕەزەن

واتە: پانزەهەمین ڕۆژ ناوی دەزەنە

ئەو ڕۆژە ڕۆژی سرۆش و ترێ و ڕەزە

وشەی دەزەن کە دیاردیی پێ کراوە، لە ئاڤێستادا دەزوەیە و لە پەهلەویدا دەدوویە و ناوی پانزەمین ڕۆژی مانگە و بەم ڕۆژەش ڕۆژی خوا دەڵێن.

شانزەهەمین ڕۆژ میترە و مێرەن

دەستگیری مەردوم نەی ڕۆژە خێرەن

واتە: شانزەمین ڕۆژ ناوی میترەیە

یارمەتیدانی خەڵک لەم ڕۆژەدا خێرە

وشەی میترە کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستا و پەهلەویدا هەر میترەیە و ناوی ڕۆژی شانزەمین مانگە. میترە لە ئاڤێستادا ناوی یەکێ لە گەورەترین فریشتەکانە. ئەبووڕێحانی بیروونی دەڵێ: خەڵک لە مانگ و ڕۆژی میترەدا سی ڕۆژ جەژن دەگرن و پادشاکان لەم ڕۆژانەدا تاجێکیان دەنایە سەر و بەشایی و خۆشییەوە ڕایان دەبوارد.

هەڤدەهەمین ڕۆژ، ڕۆژ سرۆشەن

خرۆیچ پەرێ ئەو هەر نەخرۆشەن

واتە: حەڤدەهەمین ڕۆژ، ڕۆژی سرۆشە

کەڵەشێریش بۆ ئەو هەر لە بانگ و خرۆشدایە

وشەی سرۆش کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا سرەئۆشەیە و لە پەهلەویشدا هەر سرۆشە و ناوی ڕۆژی شانزەمی مانگە و هەروەها ناوی یەکێ لە فریشتەکانە کە پارازتنی جیهان بەئەستۆی ئەوەیە بۆیە دێوەکان لە دەست ئەو ڕادەکەن و ئەمە سرۆشەکە کەڵەشێر وریا دەکاتەوە و ئەویش بەقووقەی خەڵک هەڵدەسێنێ تا نوێژ و نزا بۆ خوای مەزن بکەن.

هەژدەهەمین ڕۆژ واچن ڕۆی ڕەشـــەن

ڕۆژ دادگـــــەری و درۆن بـەشـــــەن

واتە: هەژدەهەمین ڕۆژ ڕۆژی ڕەشە

ڕۆژی دادگەری و بەخششە

وشەی ڕەش کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا ڕەشنوویە و لە پەهلەویدا رەشنە و ناوی هەژدەهەمین ڕۆژی مانگە کە بەواتای دادگەرە و بریتییە لە فریشتەی داد و دادگەری و ئەم فریشتەیە دادگەری لەناو خەڵکدا بەدی دێنێ و ئەو لەسەر پردی چینوەت لە بەرەبەیانی ڕۆژی سێیەمدا لە دوای مەرگ کردەوەی چاک و خراپی مردووان هەڵدەسەنگێنێ.

نۆزدەهـەمین ڕۆژ، ڕۆی فـــــرۆدانەن

ڕۆژ ئامـــورزین گـــردین مـــێـــردانەن

واتە: نۆزدەهەمین ڕۆژ، ڕۆژی فرۆدانە

ڕۆژی بەخشینی هەمووی مێردانی خوایە

وشەی فرۆدان کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاوێستادا فرەوەشی و لە پەهلەویدا فرەوەهەرە و ناوی ڕۆژی نۆزدەمی مانگە. لە پەڕاوی بوندهشندا هاتووە کە بەر لە بەدیهێنانی مرۆ، هۆرمز جیهانی فرەوەشی خوڵقاند و پاشان مرۆی بەدی هێنا.

بیـســتـــەمین ڕۆژیچ، ڕۆژ بارامـــەن

نـە ئـی ڕۆژەدا ئـەنـدەر ئارامــــــەن

واتە: بیستمین ڕۆژیش ڕۆژی بارامە

ئەندەر لەم ڕۆژەدا ئارامە

وشەی بارام کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا ورتەغەنە و لە پەهلەوی داواهرامە و ناوی ڕۆژی بیستەمی مانگە و هەروەها ناوی فریشتەیێکە کە شایی و خۆشی دەخاتە دڵانەوە و ئەندەر کە هۆنەر ئامـاژەی پێ کردووە ناوی دێوێکە کە وێرانی و لافاو دێنێتەدی،

بەڵام بارام ئەو تێکدەشکێنێ و ڕاوی دەنێ.

بیست و یەکەمین ڕۆژ، ڕۆژ ڕامەن
مەردوم نەی ڕۆژە نە وەشی و کامەن

واتە: بیست و یەکەمین ڕۆژ ناوی ڕامە
وە خەڵک لەم ڕۆژەدا لە ئەوپەڕی خۆشی و شاییدا دەژین

وشەی رام کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا رامەنە و لە پەهلەویشدا هەر رامە و ناوی بیست و یەکەمین رۆژی مانگە کە بەواتای ئاشتی و هێمنییە و بەپێی ئاڤێستا رام دەبێتە هۆی سەوزبوونی لەوەڕگەکان.

بیست و دوومین رۆژ هەر رۆژ وان
واتیش هەر نە ئێر فەرمان خوان

واتە: بیست و دووەمین رۆژ هەر رۆژی بایە
بایش هەر لەژێر فەرمانی خوایە

وشەی وا کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستایی و پەهلەوی دا واتە و ناوی بیست و دووەمینی مانگە و هەروەها ناوی یەکێ لە فریشتەکانیشە و ئەم فریشتە یارمەتی شەڕکەران دەدا کە بەسەر دوژمندا زاڵ بن و هەر بۆ ئەمەیە گەلێ لە پادشایان و قارەمانان و پاڵەوانان بۆ سەرکەوتنی خۆیان لە فریشتەی با داوای یارمەتی دەکەن.

بیست و سێوەمین ڕۆژ، ڕۆژ دەزوەن
وەشش ئەمەیۆ مار گاوەزەن

واتە: بیست و سێیەمین رۆژ، رۆژی دەزوەنە
ماری گاوەزەن خۆشی لێ نایە

وشەی دەزوەن کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستاشدا دەزوەیە و لە پەهلەویدا دەزووە و ناوی رۆژی بیست و سێیەمین مانگە بەواتای داهێنەرە و لەم رۆژەدا خەڵک ناخوێنەکانیان دەگرن و خۆیان دەڕازێننەوە و جلوبەرگی تازە دەکەنە بەریان.

بیست و چوارەمین ڕۆژ، ڕۆژ دینەن
پەرێ بی دینان ئی رۆژە شینەن

واتە: بیست و چوارەمین رۆژ، رۆژی دینە
بۆ بێ دینەکان ئەم رۆژە شین و شیوەنە

وشەی دین کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا دەئنایە و لە پەهلەویشدا هەر دینە و

ناوی رۆژی بیــست و چوارەمی هەر مــانگە کـە بەواتـای ئاین و ڕێ و ڕەوشـتـە و هێـزێکی خوایییە کە لە گیانی هەر کەسێکدا هەیە.

بیـست و پەنجـمین رۆژ ئەرتەن جـە نۆ

پەی ژەن و کنیک جـوانی مـەبەخـشـۆ

واتە: بیست و پێنمین ڕۆژ ناوی ئەرتەولەسەرنۆ

بەژن و کچ جوانی دەبەخشێت

وشەی ئەرت کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا ئەشی وەنگووهییە و لە پەهلەویدا ئەرتە و ناوی رۆژی بیـست و پێنجـەمی هەر مـانگە و هەروەهـا ناوی فرێشـتـەیێکە کـە سـامـان و دارایی خەڵک دەپارێزێ.

بیست و شـەشـەمین رۆژیچ ئەشـتـاتەن

دێو و ئەهـریمەن جـە دەسـتـش مـاتەن

واتە: بیست و شەشەمین رۆژیش ناوی ئەشتاتە

دیو و ئەهریمەن لە دەستی ئەو ماتە

وشەی ئەشتات کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستاییدا ئەرشتات و لە پەهلەویدا ئەشتاتە و ناوی بیست و شەشەمین رۆژی هەر مانگە و هەروەهـا ناوی یەکێ لە فریشتەکانە و بەواتای ڕاسـتی و دروسـتـیـیـە. بەپێی پەڕاوی بوندهشن، تەواوی گـیـاکـانی هووم پەیوەندییـان بەئەشتاتەوەیە.

بیـست و هەفـتــەمین ڕۆژ ئاسـمــانەن

وارانش پەی ژار داو و دەرمـــــانەن

واتە: بیست و حەوتەمین رۆژ، رۆژی ئاسمانە

بارانی بۆ هەژار داودەرمانە

وشـەی ئاسمـان کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستـادا ئەسـمەن و لە زمـانی پەهلەویدا هەر ئاسمـانە و ناوی رۆژی بیست و نـاوی بیست و حـەوتەمـی هەر مـانگە و کوردەکـان هەر لە دەوری کۆنەوە حەزیان لە ئاسمـان و ئەسـتێرەکـان و مـانگ و خۆر کردووە و سـوێندیان پێ خواردووە.

بیـست و هەشـتـەمـین رۆژ، ڕۆژ زامـەن

مــێــرد پـاپەتیش پەرێ ئەو ڕامـــەن

واتە: بیست و هەشتەمین ڕۆژ، رۆژی زەوییە

پیاوی پێخاوس بۆ ئەو ڕامە

وشەی زام کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا زامیاد و لە زمانی پەهلەویشدا هەر زامە و بەواتای زەوییە و ناوی ڕۆژی بیست و هەشتەمی هەر مانگە و زەوی هەر لە مێژەوە لەناو کوردەکاندا ستایش کراوە، چونکە بەیارمەتیی سپەندارمەز ڕوەک و گوڵ و گیاکان لە زەویدا دەڕۆن و خەڵک کەڵک و سوودییان لێ وەردەگرن، بۆیە بەپیرۆز دایان دەنا.

بیست و نۆهەمین ماراسپەندەن

خواجام پەرێ ئەو مانسرش وەندەن

واتە: بیست و نۆهەمین ڕۆژ، ڕۆژی ماراسپەندە

خوام بۆ ئەو وتاری پیرۆزی دەخوێندەوە

وشەی ماراسپەند کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاوێستادا، مەنترەسپنتەیە و لە پەهلەویدا ئەمەهرەسپەندە و ناوی ڕۆژی بیست و نۆیەمی هەر مانگە و بەواتای قسەی خوایییە و لەم ڕۆژەدا مارەبڕین و لەگەڵ دۆستان و هاوەڵان دانیشتنندا ڕەوایە.

سیهەمین ڕۆژیش ڕۆژ ئەنغەرەن

ئی ڕۆژ دەرمان مێرد لاغەرەن

واتە: سییەمین ڕۆژ، ناوی ئەنغەرە

ئەم ڕۆژە بۆ پیاوی لەڕ و لاواز دەرمانە

وشەی ئەنغەر کە دیاردیی پێ کراوە لە ئاڤێستادا ئەنغرە ڕەئۆچەیە و لە زمانی پەهلەویدا ئەنیرانە و ناوی سییەمین ڕۆژی مانگە و بەواتای مەکۆی تیشکە و لەم ڕۆژەدا خەڵک خۆیان دەدەنە بەر تیشک ودەچنە بەر بەرۆچکە تا گەرمیان بێتەوە و هێز بگرن و لە ڕاستەقینەدا تیشک، هێز و لەش ساخی دەداتە مرۆ.

لێکۆڵینەوە و تۆژینەوە سەبارەت بەپەلەوەران و گیاکان و جانەوەرەکان و زیندەوەرانی سروشت بۆ مرۆ گەلێ پێویستە بەتایبەت بۆ ئەوانەی کە لە باری زیندەوەرناسی و زمانناسییەوە دەکۆڵنەوە زۆر گرنگە چونکە بەشێکی گرنگ لە زانستی مرۆ پێک دێنێ. ئادەمیزاد هەر لەمێژەوە خەریکی پەروردەکردن و بەخێوکردنی پەلەوەر بووە و زۆربەی کاتی خۆی بۆ بەخێوکردنی پەلەوەرەکان بەسەربردووە و سەبارەت بەپەلەوەرەکان هەر لە دەوری کۆنەوە نووسەران و لێکۆڵەران پەرتووکیان نووسیوە و کۆنترین پەرتووکێک کە لە بارەی پەلەوەرانەوە نووسراوە پەرتووکێکە بەناوی بازنامەی نەوشیروانی کە بەفەرمانی عەبدولەلک کوڕی نۆحی سامانی (٣٤٢ - ٣٥٠ی کۆچی) لە زمانی پەهلەوییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی کەچی ئەم پەرتووکە ئێستاکە نەماوە و لەناوچووە بەڵام

زۆربەی مەبەستەکانی لە نامیلکەی شکارنامەی ئێلخانیدا نووسراوە و کورتەی مەبەستەکە ئەوەیە کە دەڵێ: خەسرەو ئەنووشیروان (٥٣١ – ٥٧٩ی زاینی) لەبەرئەوەی حەزی لە ڕاووشکار و بەخێوکردنی پەلەوەرەکان دەکرد فەرمانی دایە وزورگمێهری، وەزیری کە لەم بارەوە پەڕتووکێک بنووسێ و ئەویش سەبارەت بەپەلەوەرەکان گەلێ نووسراوی بەزمانی سانسکریت کۆ کردەوە و وەریانی گێڕایە سەر زمانی پەهلەوی و ناوی نا بازنامەی نەوشێروانی و پاشان گەلێ پەڕتووک لەم بارەوە نووسرا.

لە دەوری مەلک شای سەلجووقی (٤٦٥ – ٤٨٥ی کۆچی)دا عەلی کوڕی محەمەدی نیشانبووری نامیلکەیەکی بەناوی شکارنامەی مەلک شایی نووسی و پاشان مەنسووری حەلوانی ئەو پەڕتووکانەی کە سەبارەت بەپەلەوەرەکان نووسرابوون، کۆیانی کردەوە و پەڕتووکێکی سەبارەت بەباز و نەخۆشیی پەلەوەرەکان نووسی و ناوی نا شکارنامەی ئێلخانی و ئەم پەڕتووکەش بەهۆی تێپەڕبوونی زەمانەوە لەناوچووە و فەوتاوە.

سەبارەت بەناوی پەلەوەرەکان گەلێ لە هۆنەرانی کورد هۆنراویان هۆنیوەتەوە بۆ وێنە خانای قوبادی (١٠٨٣ – ١١٦٨ی کۆچی) لە چیرۆکی یوسف و زلێخا و لەیلا و مەجنوون داناوی دەیان پەلەوەر و ئەسپ و ڕەنگ و گوڵی هێناوە کە زۆر گرنگن و هەروەها شێخ شەهاوی لهۆنی (١١١٣ – ١١٨٥ی کۆچی) ناوی گەلێ پەلەوەری لە چەکامەیەکیدا بەناوی بەهار هێناوە کە لە وێژەی کوردیدا زۆر گرنگ و بەبایەخە.

میر سادقی دینەوەریش کۆمەڵە هۆنراوێکی سەبارەت بەپەلەوەرەکان هۆنیوەتەوە و ناوی ناوە مەلنامە و مەبەستی ئەو ئەوەبووە کە ناوی پەلەوەرەکان کە لەناو کوردەواریدا باوە زیندوو بکاتەوە و ئەو لە سەرەتای هۆنراوەکاندا کە نزیکەی سەد هۆنراوێک دەبن دەڵێ:

نەو وەهار ئاما وەشەن دەر و دەشت
کوردستان ماچی بەهەشتەن بەهەشت
وای شەماڵ شەق شەق شکاوا یەخ بەند
نە هەر کۆ مەشی مەوێنی زەمەند
گرمە گرمی هەور جە ئاسمان خێزا
بەهەشت نە چەم گرد مەلان بێزا
شای وەهار وستەن ئانە ڕەنگ و بۆ
تا بەیان یاران وەشی کەن جە نۆ
جۆق جۆق مەلان ئامان وە گوڵزار
نیشتن نە سەر کۆ و قولێ و نزار

واتە: بەهاری نویّ هات و دەشت و دەر خۆشە، کوردستان دەڵێی هەروەکو بەهەشت وایە بای شەماڵ شەق شەق سەهۆڵەکانی شکاند و کردیە ئاو، دەچیتە هەر کویّ زەمەند و گژوگیا دەبینی، گرمەگرمی هەور لە ئاسمان هەڵسا، بەهەشت لە چاوی هەمووی مەلان بێزرا شای بەهار ئەوا رەنگ و بۆنی خۆی بڵاو کردەوە، تا یاران بێن و سەرلەنویّ خۆشی بکەن پۆل پۆلی مەلان هاتنە گوڵزار، نیشتنە سەر کێو و تەپۆڵکەکان

میر سادق لە پاش ئەم سەرەتایە دێتە سەر باسی پەلەوەران و باسی یەک یەکی باڵندەکان دەکا و دەنگ و ڕەنگ و چۆنییەتیی ژیانیان دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە کە لە باری پەلەوەرناسی و زماناسییەوە زۆر گرنگن، وەکو دەڵێ:

خۆ ئاهێر مەلووچ رەنگش چون بووڵەن<br>
پەی واردن تفی هەمیشە ژووڵەن<br>
ئەلوو هەر ژەرەژ شکار مەکەرۆ<br>
وە شەقەی شاباڵ ئی کار مەکەرۆ<br>
باز نە پەی شار نە کۆ و دەشتەن<br>
وە هەر کۆ مەشی ئەو هەر نەگەشتەن<br>
بەوێنەی باڵباز وازی کەر نە ئاو<br>
گۆش دەر وە ناڵە و زاری و چاوچاو<br>
باڵزر هەر کوللە مەگیرۆ وە چنگ<br>
مەنیشۆ نە پای سەوزەگیا و شنگ<br>
باڵەوان نە پەی شار چون بازەن<br>
چەنی چەرخ و قووش هەمیشە سازەن<br>
وینەی بایەقوش هەر شەو مەناڵم<br>
کەس نییەن رەحمش بەیۆوە حاڵم<br>
وێنەی بزەلەڕ تۆ هەر ماساو وەر<br>
نزانی شەو و رۆ پەی وێت باوەر<br>
بوڵبوڵ مەوانۆ شەو و رۆ پەی گوڵ<br>
گوڵیش هەر وە ناز دڵ مارۆ و کوڵ<br>
بۆرچین نە کەنار شەتاودا دیارەن<br>
هەر مەلیّ کەرۆ و چەمەڕای یارەن

واته: خۆ عاینه مەل ڕەنگی وەکو خۆڵەمێشە، بۆ خواردنی توو هەمیشە پەرێشانە، هەڵۆ هەر کەو شکار دەکا. و بەشەقەی شاباڵ ئەم کارە ئەنجام دەدا. باز لە دووی شکار لە کێو و دەشت دایە، بەهەر کوێدا دەچی ئەو هەر لە گەشت و گێڵە وەکو باڵباز لەناو ئاوا مەلە بکە. وا بەناڵە و گریان و چریکەی پەلەوەران گوێ بدە باڵزر هەر کوللە بەچنگ دەگرێ و لەپای سەوزەگیا و شنگ دادەنیشێتەوە، باڵەوان وەکو باز لە دووی شکار و نێچیرە، وە لەگەڵ چەرخ و قووشدا هەمیشە سازە، وەکو بایەقوش هەر شەو دەناڵم، کەس نییە بەزەیی بەحاڵی من دابێتەوە، وەکو بزە لەڕ تۆ هەر ماسی بخۆ، مزگێنی شەو و ڕۆ بۆ خۆت بهێنە، بولبول شەو و ڕۆ بۆ گوڵ دەچریکێنێ گوڵیش هەروە ناز دڵ دێنیتە کوڵ. بۆرچین لە کەنار شەتاودا دیارە هەر مەلە دەکا و چاوەڕێی یارەکەیەتی. میرسادق لە دوای کۆتایی پێ هێنانی ناوی باڵندەکان بەمێژووی هۆنینەوەی مەلنامەکەی دیاردی دەکا کە ساڵی ۱۳۷۵ی کۆچییە و ئەوسا دەڵێ: ئەمە (سادق) هۆنیویەتەوە کە هەموو دەم لە ئەرک و ڕەنجدایە و تۆش بەوردی پێی دا بڕوانە و لەبەری بکە و دڵی خۆتی پێ شادکە وەکو دەڵێ:

یە(ســـــادق) واتـەن ئـانـە نـەرەنجـــەن
هەزار و دووســـەد هـەفــتــا و پەنجـــەن
نـام ئـی مـــــەلانـە واتم وە کـــــوردی
تـــۆش بــێــش بــووانــە ئــارۆ بــەوردی
نـام ئـی نـامـــەم نیـــا مـــەلنـامـــە
ئـی نـامـــە پەرێ گــرد کــوردێ کـامـــە
تـا کـــــە بمـانـۆ پـەرێ یـادگــــــار
شــــادی کــەن شــــادی نە ئی ڕۆژگـــار
نـام ئـی مـــــەلانـە لەبـەرکـــــەن یـاران
پەیش دڵـتـان شـادکـەن چون جـار جـاران

واتە: ئەمە (سادق) وتوویەتی کە ئەوا لە ئەرک و ڕەنجدایە ئێستا ساڵی هەزار و دووسەد و حەفتا و پێنجە ناوی ئەم مەلانەم بەکوردی هۆنییەوە تۆش ئەمڕۆ بەوردی پیایا بڕوانە ناوی ئەم نامیلکەیەم نا (مەلنامە) ئەم نامیلکە بۆ هەموو کوردێک کام و خۆشییە هەتا بەیادگار بمێنێتەوە شادی کەن شادی لە ئەم ڕۆژگارەدا و ناوی ئەم مەلانە لەبەرکەن و وەکو جاری جاران دڵتانی پێ خۆش کەن ئەڵبەت ئەوەش دەبێ بڵێین کە لە زەمانەکانی ئەوروپاییدا گەلێ پەڕتووک و نامیلکە سەبارەت بەپەلەوەران و جانەوەرەکان نووسراوە کە زۆر گرنگ و بەکەڵکن.

لەم نووسراوەدا گەلێ وشەی ڕەسەنمان دەکەوێتە بەرچاو کە لە باری زمانناسییەوە زۆر بەکەڵکن وەکو: وەهار: بەهار، وا: با، زەمەند: گژوگیا، بووڵ: خۆڵەمێش، ژووڵ: پەشۆکاو، ئەلوو: هەڵۆ، ماساو: ماسی، نزانی: مزگێنی، مەلێ: مەلە، چەمەڕا: چاوەنواڕ، وەگەلێک وشەی تر.

سەرچاوەکان:

١- دیوانی دەستنووسی میرسادقی دینەوەری.

٢- بەیازێکی کۆن.

٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەمیر سادقی دینەوەری.

٤- یەشتەکان وەرگێڕاوی پور داود - تاران، ١٣٠٧.

٥- فەرهەنگی پەهلەوی، نووسراوی: د. بارامی فەرەوەشی - تاران، ١٣٤٦.

## شێخ یەحیای سووەرەبەردی

٥٨٧ - ٥٤٩

شێخ شەهابەدین یەحیا، کوڕی حەبەش لە ساڵی ٥٤٩ی کۆچی لە دێی سووەرەبەردی سەر بەشاری زەنگانذ لەدایک بووە و هەر لەوێدا خەریکی خوێندن بووە و پاشان چووەتە مەراغە و لەلای شێخ ئیمام مەجددینی جیلی ڕێزمان و قورئان و شەریعەتی ئیسلامی خوێندووە و لە پاشا چووەتە ماردین لەلای شێخ فەخرەدینی ماردینی وێژەی عەرەبی و پیتۆڵی خوێندووە و لەوێوە چووەتە ئەسپەهان و لەوێدا ماوەیەک وێژەی فارسیی خوێندووە و ودمی مەلایەتیی وەرگرتووە و ئەوسا چووەتە حەڵەب و خەریکی وانەوتنەوە بووە، بەڵام هیچ مەلایەک نەیتوانیوە لە بارەی زانستەوە لەگەڵیا بدوێ و ئەوەبوو کە هەندێک ئێرەییان پێ برد و ئەویان بەبێ دین و بێ بڕوا دایە قەڵەم و هەتا لە ساڵی ٥٨٧ی کۆچیدا مەلاکان فەرمانی کوشتنیان دا و ئەوسا لە سێدارەیان دا و تەنانەت تەرمەکەیان سێ ڕۆژ لە دەرەوە هەڵواست تا بردیان ناشتیان. شێخ شەهابەدین زانا و وێژەوان و هۆنەرێکی هەرەبەرز بوو کە بە سێ زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی هۆنراوی دەهۆنییەوە و لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ پەڕتووک و نامیلکەی سەبارەت بەئاینی ئیسلام بەزمانەکانی فارسی و عەرەبی نووسیون کە بریتین لە: (التنقیحات فی اصول الفقه)، (کتاب التلویحات)، (کتاب الهیاکل)، (کتاب حکمة الاشراق)، (الغربة الغربیة)، (رسالة فی بن یقظان)، (المبدأ والمعاد)، (بستان القلوب)، (طوارق الانوار)، (کتاب البصیر)، (رسالة فی العشق)، (رسالة فی المعراج)، (الحکمة الالهیة).

ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی ئەم هۆنەرە بەزاراوەی گۆرانی کە دەڵێ:

ویت مەدەر وە غەم، ویت مەدەر وە غەم
میرزام ئامانەن ویت مەدەر و غەم
نە جام مەمانۆ، نە جەمشێد نە جەم
هەر شاد و وەش بە نە گێتی هەردەم
نە هامدَەم، نە خوێش، نە هوونرِەس، نە کەس
کەس وە دەرد کەس نەبۆ فەریاد رِەس
دڵسۆزان دڵتەنگ بێ دەسەڵات بۆ
دۆستان جەرِاس، راگەی نەهات بۆ
(ئیشراق) ئومێدت تۆ هەر وە وەر بۆ
تا یەشتت جە رِۆی رەستاخێز سەر بۆ

واتە: خۆت مەدە بەخەم و پەژارە، ئەی میرزا هانایە خۆت مەدە بەخەم و پەژارەوە، نە جام دەمێنێ و نە جەمشێد و نە جەم، هەر شاد و خۆش بە هەردەم لە جیهاندا نە هاودەم، نە خزم، نە خوێن سێن، نە کەسوکار کەسێک بە فریا و دەردی کەسێک ناگا، دڵسۆزان دڵتەنگ و بێ دەسەڵاتن دۆستان هەر لە رِێی نەهات دانەی (ئیشراق) هیوات تۆ هەر بەخوای خۆربێ تا نزات لە رۆژی پەسڵاندا قبووڵ بێ.

ئەمەش چارینەیەکی فارسی ئەم هۆنەرەمان کە دەڵێ:

هان تا سَررشتەء خِرَد گم نَکُنی
خود را زِ برای نیك و بَد گُم نَکُنی
رَهرَو تویی و راه تویی، مَنزِل تو
هُش دار کة راه خود بقخود گُم نَکُنی

واتە:

هانایە سەرِرشتەی ئاوەز ون نەکەی، خۆت بۆ چاک و خراپ ون نەکەی رێرەو تۆیت و رێ تۆیت و ماڵ و هەوارگە هەر تۆیت وشیاربە کە خۆ بەخۆ رێ ون نەکەی.

سەرچاوەکان:

١- حکمه الاشراق، تألیف شیخ شهید شهاب الدین یحیی سهروردی - ترجمه دکتر سید جعفر سجادی - تهران ١٣٦١.
٢- بەیازێکی کۆن کە دووسەد ساڵ لەمەوپێش نووسراوە.
٣- کەشکۆڵێکی کۆن کە هەندێ هۆنراوی شێخ شەهابەدینی تێدا تۆمار کراون.

## شێخ مستەفا تەختەیی

١٠٤٧ - ٩٥١ی کۆچی

شێخ مستەفا کوڕی شێخ شەمسەدین وەلی مەردۆخی لە ساڵی ٩٥١ی کۆچی لە دێی تەختەی سەر بەسنەدا لەدایک بووە و لە منداڵیدا لەلای باوکی خوێندوویەتی و لە تافی جوانیدا دەڕواتە بەغدا و لەلای زانایانی ئاینیدا ڕێزمان و شەریعەتی ئیسلام و لێکدانەوەی قورئان و پیتۆڵی دەخوێنی و ئەوسا دەڕواتە شام و لەوێوە دەچێتە حیجاز و لە شاری مەکەدا بۆ ماوەی ساڵێک لەلای ئیبنی حەجەر دەخوێنی و هەر لەلای ئەو ودمی مەلایەتی وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە زێدەکەی خۆی و پاشماوەی ژیانی بەوانەوتنەوە و ڕێنوێنیی خەڵک دەباتە سەر تا لە ساڵی ١٠٤٧ی کۆچیدا گیانی بەگیان ئافەرین دەسپێرێ.

شێخ مستەفا یەکێ لە زانایانی هەرە بەرزی کوردە و ئەو لە لێکدانەوەی قورئان و شەریعەتی ئیسلامدا مامۆستا بووە و لە هۆنینەوەی هۆنراویشدا دەستێکی بەرز و باڵای هەبووە و دیوانێکی لە شوین بەجێ ماوە کە بریتییە لە هۆنراوی کوردی و عەرەبی و لە ئەوپەڕی جوانی و تەڕ و پاراویدان. ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی ئەو کە دەڵێ:

دڵە هاکە ویەرد، دڵە هاک ویەرد
فام ئاوا کەرە دنیا هاکە ویەرد
هاکە باد فەنا کۆوان کەرد بەگەرد
هاکە مەیل و مۆبەت دۆستان بی سەرد
هاکە ئەجەل یاوا شی وە سەرینت
هاکە جە دەستت شی، وەشیی وەرینت
هاکە (یَوم البَعث) وەنەت بی زاهێر
هاکە دنیای دوون گشت مەند بەباهێر
(وَجهتُ وَجهي) ڕوو نە خودا کەر
هەنیچ وەس مەیل نە دنیای دوون دەر
وێت مەدەر بەمەیل دنیای دوونەوە
مەویارە بەفکر چەند و چوونەوە

واتە: ئەی دڵ تێ پەڕی کەمێ بیر بکەرەوە جیهان ئەوا تێ پەڕی ئەوا بای نەمان کێوەکانی کردە تۆز ئەوا ویست و خۆشەویستیی دۆستان ساردبووەوە، ئەوا لەوانەیە کە ئاکام بێت و بگاتە سەرینت. ئەوا ڕەنگە خۆشی پێشووت لە دەست دەربچێ، ئەوا ڕەنگە

ڕۆژی زیندووبوونەوەت لێ ئاشکرابێ، لە پڕ ئەم جیهانەت لێ ببێتە بایر من ڕووم کردە ڕووت و تۆش ڕوو لە خواکە و ئارەزووت مەدە بەجیهانی نادیار، خۆت مەدە دەستی ئەم جیهانەوە مەکەوە بیری شتی پڕ و پووچەوە

سەرچاوەکان:

١- نوسخەی دەستنووسی کەشکۆڵەکەی شێخ عەبدولمۆمنی مەردۆخی.

٢- بەیازێکی کۆن.

٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەشێخ مستەفا تەختەیی.

## سۆفی عەلی کەوانی

٩٧٥ - ١٠٦٤ی کۆچی

سۆفی عەلی، کوڕی محەمەدی کەوانی لە ساڵی ٩٧٥ی کۆچی لە دێی کەوان-ی سەر بەبێلەوار لە دایک بووە و باوکی لەلاویەتیدا مردووە و ئەوی بەهەتیوی بەجێ هێشتووە و دایکی گەورەی کردووە و ناردوویەتە قوتابخانە و هەر کە بووەتە خوێندەوار دایکی ئەوی ناردووەتە لای شووی خوشکەکەی کە ئاسنگەر بووە و ئەوی کردووەتە شاگردی خۆی و، لەبەرئەوەی حەزی لە خوێندن کردووە وازی لە پیشەی ئاسنگەری هێناوە و ماوەیێک بووەتە سۆفیی یەکێ لە شێخەکان و ئەوسا لەگەڵ چەند کەسێکدا بەرەو بەغدا کەوتووەتە ڕێ و لەوێدا ماوەیەک لەلای زانایانی ئاینی خەریکی خوێندن بووە و ڕێزمانی عەرەبی و لێکدانەوەی قورئان و ڕەوانبێژیی خوێندووە و لە پاشا گەڕاوەتەوە زێدەکەی خۆی و پاشماوەی تەمەنی بەکاری کشتوکاڵ و وانەوتنەوە بردووەتە سەر تا لە ساڵی ١٠٦٤ی کۆچیدا دنیای بەجێ هێشتووە.

سۆفی عەلی، یەکێ لە زانایان و هۆنەرانی کوردە و ئەو لەوێژەی عەرەب و ڕێزماندا پسپۆڕ بووە و لە هۆنینەوەی هۆنراویشدا دەستێکی باڵای هەبووە و گەلێ هۆنراوی لە شوێن بەجێ ماون کە لە بەیاز و کەشکۆڵەکاندا تۆمار کراون.

ئەمەش چەند هۆنراوێکی ئەم هۆنەرە کە دەڵێ:

ئوجاغ قەدیم، قایم مەقامات
ساحێب ئیعجاز کەشف و کرامات
واعێز گوفتار حەدیس و ئایەت
خەبەردار نەزم ڕاوی ڕوایەت

شـــەریف پڕ شـــەوق ڕەهبـــەر ڕای دین
ســـتـوون ســـەیوان کـوردســـتـــان زەمین
چەند هەزار مەخلووق گومڕا و بێ خەبەر
ئاوەردی وە دین پاک پێـــغـــەمـــبـــەر
پەند و نەســـیـــحـــەت بەتۆ لایقـــەن
گـــوفـــتـــارت وێنەی شـــەهد فـــایقـــەن
جـــانشین جـــای پێـــغـــەمـــبـــەرانی
نەســـیـــحـــەت نمای بێ خـــەبەرانی

واتە: ئەی وەجـــاغی کـــۆن، ئەی خـــاوەنی پەرچـــۆ و پشـکنین و ڕێز و گـــەورەیی، ئەی ئامـۆژگـاری کەری فـەرمـایشت و نیشـانە ئەی هـەواڵدەری ڕێکخسـتن و گێڕانەوەی ڕووداو، ئەی گەورەی پڕ چێژ و ڕێبەری ڕێی دین و ئاین ئەی کۆڵەکەی سەیوانی کوردسـتـان زەوی چەند هەزار کـەس گـومڕای بێ هەواڵت، هێنایە سـەر ڕێی دینـی پاکی پێـغـەمـبـەر، پەند و ئامـۆژگـاری دان هـەر شـیـاوی تۆیە وتارت وەکـو هـەنگوێن شـیـرینە تۆ جێ نشـیـنی جـێی پێغەمبەرانی پەند دەری پیاوانی بێ ئاگای.

سەرچاوەکان:

١- نوسخەی دەستنووسی کەشکۆڵەکەی شێخ عەبدولمۆمنی مەردۆخی

٢- بەیازێکی کۆن.

٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەسۆفی عەلی کەوانی.

## یۆسۆ یاسکە

### ٩٩٥ - ١٠٤٢ی کۆچی

یۆسـۆ یا یۆسف کوڕی یاسکەی تەختـەیی لە سـاڵی ٩٩٥ی کۆچی لە دێی تەختـەی سـەر بەشاری سنەدا لەدایک بووە و دەوری منداڵیەتیی لەگەڵ باوکیا بەکاری کشـتوکاڵ بردووەتە سـەر و لە تافـی جـوانیـدا خـەریکی خـوێندن بووە و ئەوسـا چـووەتە سنە و لەلای زانـایانی ئاینی فـێـری ڕێزمـان و قـورئانی پیـرۆز بـووە و لە پاشـا لەبەرئەوەی لاوچاک و هـۆنەر و گۆرانیبێژێکی باش بووە، خـان ئەحـمەد خـانی ئەردەڵان (١٠١٤ - ١٠٤٦ی کۆچی) خـۆشی لێی هـاتووە و بردوویەتـە لای خـۆی و مـووچە و بـەراتی بۆ دابین کـردووە، بـەڵام لەپاش مـاوەیەک کـڵاوزەڕ خـانمی ژنی خـان کـە ژنێکی نەشـمـیل و باڵابەرزی چاوڕەش بووە دڵی دەچێ لە یۆسۆ و یۆسۆش گیرۆدەی دەبێ و کاتێ ئەم ڕازە ئاشکرا دەبێ خان تووڕە دەبێ و

یۆسۆ یاسکە دەخاتە زیندان و بەڵام ئاگری خۆشەویستیی ئەو دووانە زیاتر کڵپە دەسێنێ و یۆسۆ بەگوڕتر و بەسۆزتر گۆرانی دەچڕێ و هۆنراوی پیا دەهۆنێتەوە و هەروەک دەگێڕنەوە ئێشکگرەکانی زیندان بێ تاقەتیی خۆیان بەگۆرانییەکانی ئەو دەرکردووە و ڕۆژێکیان خان گوێی لە یەکێ لە گۆرانییەکانی دەبێ کە هۆنراوەکانی بریتی بوون لە تەنیایی و بێ کەسی و بێ بەزەیی و کۆیلەیەتی و خان دڵی پێی دەسووتێ و بەڕەڵای دەکات، بەڵام کە ناوەڕۆکی گۆرانییەکە بۆ خان دەگێڕنەوە خان دیسانەوە فەرمان دەدا کە بیگرنە چوار دیوار لە قسڵ تا مردن و لە زەڵمدا لە ژوور ئەحمەد ئاواوە لە ساڵی ١٠٤٢ی کۆچیدا لە دیواری دەگرن و لەگەڵ دانانی هەر بەردێک و تۆپەڵە قسڵێکدا، هۆنراویەک دەهۆنێتەوە و بەئاوازی سیاچەمانە دەیچڕێ کە هەموو بریتی بووە لە دەرخستنی بێ گوناهی و بێ تاوانیی خۆی، جا ئەم گۆرانییە دیارە لەناو جەرگەی کۆمەڵی ڕەنجدەر هەڵقوڵاوە و گۆرانییەکەش ئێستا لەناو خەڵکدا باوە و هۆرەچڕان بەهۆرە دەیچڕن کە ئەویش هۆرەی: یۆسۆ و کڵاوزەڕ خانم و ئێستاش پیرەپیاوان و پیرەژنان ئەو هۆنراوانەیان هەر لەبیر ماوە و بەسۆزەوە دەیگێڕنەوە. ئەمەش چەند هۆنراوێکی ئەو گۆرانییە کە دەڵێ:

هەر چەندە کەروو خەیاڵانی تۆ

گەرمە شینمەن دوبارە جەنۆ

ئا سەر زەمینە تۆ کەردەن بەبەر

تازیە بار بێ ئاد جە من بەتەر

دەردێو من گرتەن باشقەی دەردانا

لوقمانی حەکیم جێش سەرگەردانا

بازە سەر بنیەو بەمەمانتەوە

با گیانم بەرشۆ وەرجە گیانتەوە

نە گیان شیرینتەر من شک نەبەردم

دام نە رای خودا نەزر تۆ کەردم

کافر هەی کافر، زاڵم هەی زاڵم

دەردەدار تۆم تاکەی بناڵم؟

ڕەنگ زەردیی خەزان خەتای پایزەن

ڕەنگ زەردییەکەی من دووریی ئازیزەن

جەوساوە سەودای تۆ کەفتەن نە سەر

منیچ لێوەنا جە مەجنوون بەتەر

ئانا خـــەیلێـــوەن دیدەم لێت دوورەن
فـرمـێـسکە چەمـەی هانەی بلوورەن
ئـەر ئـیـنـە نـەبـۆ وە بـۆنـەی تـۆوە
من چێش مـەکـەرۆ بەی کـەش و کـۆوە؟

واتە: هەرچەندە بیری تۆ دەکەمەوە، دیسـان شین و شیوەنم گەرم دەبێ سـەرلەنوێ ئەم سـەر زەوییـە تۆ بەبەرت هێناوە تازیەبار بوو ئای لە من خـراپتـر دەردێ کـە من گـرتوومـە لەسـەر ڕووی هەمـوو دەردەکانە، لوقمـانی حـەکیم لێی سـەرگەردانە با سـەر بنێمـە بان مەمانتەوە با گیانم دەرچێ بەبەر گیانتەوە لە گیان شـیرینتر شتێ ترم شک نەبرد لە ڕێی خوادام و کردمـە قوربانی تۆ گـاور هەی گـاور، سـتەمکار هەی سـتـەمکار، دەردەداری تۆم تاکـەی بنـاڵێنم؟ ڕەنگ زەردی خـەزان تاوانی پایزە ڕەنگ زەردییـەکـەی من هـۆی دووریی خۆشەویستـەکـەمە، لەوکاتەوە سـەودای تۆ کەوتووەتە سـەرم منیش لێوە بووم لە مـەجنوون خراپتر ئەمە مـاوەیەکە کە دیدەم لێت دوورە فرمێسکی چاوم وەکو کانییە. ئەگەر ئەمە نەبێ بەهۆی تۆوە من چی دەکەم بەم کەژ و کێوەوە.

سەرچاوەکان:

١- نوسخەی دەستنووسی کەشکۆڵەکەی شیخ عەبدولمۆئمنی مەردۆخی.
٢- بەیازێکی کۆن.
٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بە یۆسۆ یاسکە.

## مەلا حافز فەرهاد هەشەمێزی

### ١٠١٠ - ١٠٩٦ی کۆچی

مـەلا حـافز فەرهـاد، کوڕی مـەلا ئەحـمـەدی هەشـەمـێزی لە سـاڵی ١٠١٠ی کۆچی لە دێی هەشـەمـێـزی سـەر بـەژاوەرۆدا لە دایک بووە و لە منداڵیدا لەلای بـاوکی خـوێنـدوویەتی و لە تافی جوانیدا چووەتە بەغدا و لەلای زانایانی ئاینیدا ڕێزمـان و شـەریعەتی ئیسلام و ڕاڤەی قـورئان و ڕەوانبـێـژیی خـوێندووە و لەپاش وەرگـرتنی ودمی مـەلایەتـی، گـەڕاوەتەوە زێد و مەڵبەندەکەی خۆی و لە پاش ماوەیەک چووەتە خزمەت خان ئەحمەد خانی ئەردەڵان (١٠٢٦ - ١٠٤٨ی کۆچی) و بووەتە نووسـەری تایبەتی و خـان هـەموودەم لەگـەڵیدا ڕاوێژی کردووە و سەرئەنجام لە ساڵی ١٠٩٦ی کۆچیدا گیانی بەگیان ئافەرین سپاردووە.

مـەلا حـافز فەرهـاد لە ڕاڤـەی قورئان و ڕەوانبێژی و وێژەی فـارسیدا مامۆستـا بووە و لە

هۆنینەوەی هۆنراویشدا دەستێکی باڵای هەبووە و گەلێ هۆنراوی لە شوێن بەجێ ماون کە لە بەیاز و کەشکۆڵەکاندا تۆمار کراون.

ئەمەش چەند هۆنراوێکی ئەم هۆنەرە کە دەڵێ:

شەماڵ جەو جێوە، شەماڵ جەو جێوە
شەماڵ هەواڵێ جەو ماوا و جێوە
جەو بارگەی بڵند سەربەند نشێوە
نمەز نەمامان زەردی هەن پێوە
ئەوسا من ئامام جە زامن لەیل
نەدیم خەزانێ ڕەشتە بۆش سووەیل
بەڵێ ئەو جەمین چون مای زولاڵێ
جە سوب سەحەردا پێش دان هەواڵێ
ئانە کە خەزان گەر نەبۆش بەدەست
کێ بۆ وە زێد ئەو لەیل ئاوات وەست؟
ئەگەر وای شەماڵ نەیاونۆ گەردم
زەرد مەبۆ خەزان هەناسەی سەردم

واتە:

شەماڵ لەو جێگاوە، شەماڵ هەواڵێ لەو مەڵبەند و جێگاوە لەو بارگە بەرزە سەر بەند نشێوە نازانم نەمامەکان بۆ زەردییان پێوەیە؟ئەوسا من هاتم لە مەڵبەندی یار، پایزێکم نەدی کە گەلاوێژی لێ کەوتبێ بەڵێ ئەو تەوێڵە وەکو مانگی ڕوون، لە بەرەبەیاندا هەواڵێکیان پێ دا، ئەوە ئەگەر پایزی نەیێتە دەست کێ بوو کە بەزێدی ئەو یارە ئاواتی خواست؟

ئەگەر بای شەماڵ تۆزەکەم نەگەینێ بەیار
پایز زەرد دەبێ بەهەناسەی ساردم

سەرچاوەکان:


١- نوسخەی دەستنووسی کەشکۆڵەکەی شێخ عەبدولوئمنی مەردۆخی
٢- بەیازێکی کۆن.
٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەمەلا حافز فەرهاد هەشەمێزی

ئەر بولبـوڵ نە ڕووش نەغـمـێـو بوانۆ

دین دینداران باتڵ مـــــەمـــــانۆ

ئانە گـوڵێـوەن نەشکوفـتـەی ســاوا

داخـۆ یانەی کـێش پـێ مـەبۆ ئاوا؟

قبلەم دووریی تۆ یەکجار منش کوشت

ئەگەر بەی تەور بۆ بێزارم جـە گشت

واتە: ئەی سـەرۆکم، گوڵغونچـەی کۆرپەی نەپشکاو، چەند بولبـوڵ شـەیدای بووە، هێـشتـا ناوی بەگوڵێک دەرنەچووە، بە گوێ ناڵەی بولبولێکیـان نەبیـستووە، بەنێو نیگای خـۆی هیـچ نازانێ، لە شێخی سـەنعان بڕوا دەستێنێ، ئەگەر بولبوڵ لەسـەری بچریکێنێ و نەوایێ بلێ، دینی دینداران لەناو دەچێ، ئەوە گـوڵێکی تازە پێگەیشـتـووە، داخـۆ مـاڵی کـێـی پێ ئاوا دەبێـتـەوە؟، ئـەی ڕووگـەم دووریی تۆ بەجـارێ منـی کـوشـت، ئەگـەر بەوجـۆرە بم بێـزارم لە هەمووان.

سەرچاوەکان

١- نوسخەی دەستنووسی کەشکۆڵەکەی شێخ عەبدولمۆمنی مەردۆخی.

٢- بەیازێکی کۆن.

٣- یاداشتەکانی خۆم سەبارەت بە وەستا میکایلی زەنانی.

## شێخ عەبدولمۆمنی مەردۆخی

١١٥٢-١٢١١ی کۆچی

شێخ عـەبدولمۆمن کوڕی شـێخ جەمالەدینی یەکـەمی مەردۆخی لە سـاڵی ١١٥٢ی کۆچی لە سنەدا لە دایک بووە و هـەر لە منداڵییەوە لە لای باوکی خـەریکی خوێندن بووە و لە پـاشا لە لای زانایانـی ئاینی فـێـری ڕێزمـان و ڕاڤـەی قـورئان و شـەریعـەتـی ئیـسـلام و پیـتـۆڵی و ڕەوانبـێـژی بووە تا ودمـی مـەلایەتیی وەرگرتووە و ئەوسـا خـەریکی وانەوتنەوە و ڕێنـوێنیی خەڵک بووە تا لە ساڵی ١٢١١ی کۆچی هەر لە سنەدا کۆچی دوایی دەکا.

شـێخ عـەبدولمۆمین یەکـێ لە زانایان و هۆنـەرانی هـەرەبەرزی کـوردە و ئەو لە لێکدانەوەی قورئان و پیتۆڵی و ڕەوانـبێژی و وێژەی فـارسـی و عەرەبیـدا مامـۆستـا بووە و لە هۆنینەوەی هۆنراویشـدا دەسـتـێکی باڵای هەبووە و گـەلێ هۆنراوی بەزمـانـەکانی کـوردی و فـارسـی و عـەرەبی هۆنیـیـوەتەوە کـە لە دیوانێکدا کـۆکـراونەتەوە، بەڵام لە چاپ نەدراون. ئـەو چەند

پەڕتووكیشی نووسیون كە بریتین لە: (دُرّ النظیم و كەشكۆڵی شێخ عەبدولمؤمن) كە هەردووكیان لەم دواییانەدا لە چاپ دراون. ئەمەش پارچە هەڵبەستێكی ئەم هۆنەرە كە دەڵێ:

شەو و ڕۆ دایم تاقەت لێم سەندەن
هەرَ نیمە نایمم بە زۆر پێ مەندەن
ئەویچ هەم جە تاو دەرد فیراقەت
زەڕێ نیم لەحزە نییەن فیراغەت
هەر نە پەژارەن شەوان و ڕۆوان
بێ خورد و بێ خاو بێ تاو و تووان
وێڵ وێڵ مەگێلۆ بێدی بە بێدی
بێزار جاوایی هەی نائومێدی
ئاوارەی زامن دوور کەفتەی وڵات
کەس ئەی عەرز و حاڵ باوەرۆ وەلات
بەی گشت دەردەوە منەتبارەنان
بڵا بەی مەینەت گرفتارەنان

واتە: شەو و ڕۆژ هەموو دەم تاو و توانم لێ دەستێنێ، هەر نیوە هەناسەیەکم بە زۆر پێ ماوە، ئەویش لە تاوی دەردی دوورییەکەت، تۆزقاڵێ دەرفەتم نییە، من هەر لە پەژارەم لە شەو و ڕۆژدا، بێ خورد و بێ خەو بێ تاو و بێ توان، وێڵ وێڵ دەگەڕێم دەشت بەدەشت، بێزارم لە خۆم و هام لە ناو نائومێدیدا، ئاوارەی نیشتمانم و لە وڵات دوور کەوتوومەتەوە، کەسم نییە کە سکاڵای دەروونم بهێنێتە لات، بەم هەموو دەردەوە من سپاسی چاکەت دەکەم، دەسا با هەر بەم دەردەوە گرفتار بم.

سەرچاوەکان

١- نوسخەی دەستنووسی کەشکۆڵەکەی شێخ عەبدولمؤمنی مەردۆخی.
٢- بەیازێکی کۆن.
٣- یادداشتەکانی خۆم سەبارەت بەشێخ عەبدولمؤمنی مەردۆخی.

# فەرهەنگۆک

ئا

ئابات: ئاوا، ئاوەدان.

ئاتاو: شیاو.

ئاخێز: هەڵسان، ڕاپەڕین.

ئاڕاستەی: ڕازاندنەوە.

ئارۆ: ئەمڕۆ، ئیمڕۆ.

ئەرەبەستەی: دابەستنی ئاژەڵ بۆ قەڵەوبوون.

ئارەزوو: هیوا، ئاوات.

ئازا: نەترس، نەبەز.

ئازار: نەخۆشی، ڕەنج.

ئازمای: تاقیکردنەوە.

ئازمایشت: ئازموون، ئەزموون.

ئازموور: تاقیکردنەوە.

ئازەرم: شەرم.

ئاس: بەرد، ئاش.

ئاسارە: ئەستێرە.

ئاساو: ئاش.

ئاستەی: بەجێ هێشتن، ڕێگەدان، ڕاگرتن، هێشتنەوە.

ئاسیاو: ئاش.

ئافتاو: هەتاو.

ئافتاوپەڕ: خۆرئاوا.

ئاقاب: گەوهەر.

ئاکام: ئاویلکە، گیانەلا، ئەنجام.

ئالا: بەیداخ، پێنووس.

ئالان: پێچان.

ئالۆس: تووڕە.

ئالوودە: گیرۆدە.

ئامای: هاتن.

ئامێتە: ئاوێتە.

ئامیار: هاوکار.

ئانە: ئەوە

ئانەشا: ئەوەتانێ.

ئانی: تەوێڵ، ناوچەوان.

ئاواج: ئاواز.

ئاوایی: دێ، گوند.

ئاودێر: ئاویار.

ئاورا: برسی.

ئاورگ: ئاگردان، وەجاخ.

ئاوەز: هۆش، ژیری.

ئاوسا: ئەوسا.

ئاونگ: شەونم.

ئاوەردەی: هێنان.

ئاوەکی: ئاوارە، دەربەدەر.

ئاوەڵ: هاوەڵ، دۆست.

ئاویار: ئاودێر.
ئاوێزان: هەڵواسراو.
ئاویلکە: سەرەمەرگ، گیانەڵا.
ئاهەنگ: هەوای گۆرانی.
ئاهێر: ئاور، ئاگر.
ئایر: ئاگر.
ئایندە: داهاتوو
ئۆژ: هێز.
ئوشتر: وشتر
ئۆگە: ئەوێ.
ئۆڵکە: وڵات.
ئەختەر: ئەستێرە.
ئەخشام: مۆسیقا.
ئەدەم: ئەز، من.
ئەراگێڵ: ئاوارە، دەربەدەر.
ئەرامەندە: داماو
ئەرەب: بێگانە.
ئەژی: ماری گەورە.
ئەسپی: سپی.
ئەسر: فرمێسک، ئەسرین.
ئەسەر: بەرین، پێشین.
ئەندێش: ترس، بیر.
ئەوراک: برسیەتی.
ئەوزار: هێز.
ئەهریمەن: مەرگ، شەیتان.
ئی: ئەم.
ئینە: ئەمە
ئێوار: ئێوارە.

ب

بابە: باوک
باداوەر: گەنجی باهێنەر.
بارگا: خێوەت.
بارگە: باروبنە.
باری: بەش، بەهرە.
بازوو: قۆڵ.
بازی: یاری، کایە، گەمە.
باژێڕ: شار.
باک: سام، ترس.
بام: بان، سەربان.
باوەڕ: بڕوا.
بڵا: با.
بڵێزە: بڵێسە، هاڵاوی ئاگر.
بۆز: زیرەک، چالاک.
بووڵ: خۆڵەمێش
بەد: خراپ.
بەدکێش: بەدکردار، بەدکار.
بەغە: گەورە.
بەڵگ: گەڵا.
بەندەن: کێو، چیا.
بەیاخ: ئاڵا.
بێد: دەشت، بیاوان.
بێش: ئێش.
بێگەرد: پاک، خاوێن.
بیەی: بوون

پ

پا: پێ.
پاتەرم: خەڵک، مەردوم.
پاداشت: پاداش.
پادەشت: داوێنی کێو.
پاراو: تێراو.
پارە: پووڵ. بەرتیل.
پاسە: وا، ئاوا.
پاماڵ: پێشێل.
پای: داوێن.
پڕداڵ: پڕ دڕک.
پۆس: پێست.
پۆسە: بەوجۆرە، ئاوا.
پۆشەنگ: پشیلە. تەنگ.
پۆل: دەستە، تاقم.
پوور: کوڕ.
پەتمان: پەیمان.
پەرەنگ: کـۆت، دارێک کـە ئەیخـەنە پێی زیندانی. سکڵ. تیشک.
پەرێ: بۆ.
پەسین: ڕۆژی پەسلان.
پەوکە: بۆیە.
پێسە: وەها، وا.
پێشواز: بەرەو پیری.
پێوار: نادیار.

ت

تا: تاڵ، هەودا.
تات: عەرەب.
تار: تاریک.
تاراج: چەپاو، تالان.
تاژی: تانجی، تاجی.
تاش: کێو، چیا.
تۆشە: توێشوو.
تووخشن: هێز.
تەخش: تیر.
تەمە: تەم
تەوەن: بەرد
تەویر: هێز.

ج

جا: جێ، جێگە.
جاف: نەبەز، ئازا. چندە.
جاگە: جێگا.
جام: جلوبەرگ. ئاوێنە.
جامە: جلوبەرگ.
جان: گیان.
جۆیای: بەدوای شتێکدا گەڕان.
جە: لە
جەرگە: تاقم، دەستە.
جەمشت: بزووتنەوە.

چ

چا: لە.
چابوک: چوَست، چالاک
چار: چارە.
چاشت: چێشتەنگاو.
چاگە: لەوێ.

چاوەڕۆ: سەرچاوە.

چلێ: چلە.

چەوگا: لەوکاتەدا.

چەپاو: تالآن.

چەموور: سپی.

چەرەنگ: قسەی قۆڕ و بێ مانا.

چەڵەنگ: جوان، نەشمیل.

چەم: چاو.

چەنی: لەگەڵ.

چێگە: لێرە.

چین: ڕەگەز، بەرەباب.

## خ

خار: دڕک.

خارە: هاوسەر، خێزان.

خاس: چاک، باش.

خاسپ: سێو.

خامۆش: بێدەنگ

خاوەندکار: پەروەردگار.

خجڵ: خەریک.

خرۆش: هاوار

خواجا: خواجە، سەرۆک.

خوندکار: پاشا.

خوەر: خۆر.

خەجڵ: داماو.

خەرەنگ: تیر.

خەرگا: خێوەت.

خەدەنگ: سپۆن.

خەشم: ڕق، قین

خەیلێ: زۆر، فرە.

## د

داد: داد، یاسا.

دارا: دەوڵەمەند.

دارایی: سامان.

دارۆ: هەیەتی. دەرمان.

دام: داو.

ڕامیار: ئەوکەسەی کە داو دەنێتەوە، ڕاوچی.

دڕن: بۆنی خراپ، وەکو بۆنی تەگە لەکاتی تێ بەرداندا.

دگان: ددان.

دڵسەرد: دڵسارد.

دلێ: ناو.

دما: دوا.

دوساخ: بەندی، زیندانی.

دوشمن: دوژمن، نەیار.

دەبەنگ: گێل، گەوج.

دەگا: دێ، گوند.

دێر: درەنگ.

## ر

ڕا: ڕێگە.

ڕاز: چیرۆک. نهێنی.

ڕاس: ڕاست.

ڕاگە: ڕێگە.

ڕاویار: ڕێبوار

ڕبک: ئاماژە، دیاردی.
ڕدا: بەخشش
ڕستار: ڕزگار.
ڕۆ: ڕۆژ.
ڕۆچن: ڕۆشن.
ڕۆزگار: ڕۆژگار.
ڕۆزە: ڕۆژوو.
ڕواس: ڕێوی.
ڕەز: مێو.
ڕەند: جوان.
ڕەنگ: فڕوفێڵ
ڕێش: زام، برین.
ڕیو: فڕوفێڵ.

ز

زار: زویر.
زام: برین.
زامن: نیشتمان.
زانای: زانین.
زایلە: هاوار و شیوەن.
زرانی: ئەژنۆ.
زریە: دەریا.
زگار: زویر.
زم: زستان.
زۆ: زۆڵ.
زوان: زمان.
زەخم: برین.
زەڕ: زێڕ.
زەڕگەر: زێڕنگەر.
زۆرهان: پیر.
زەریا: دەریا
زەڕین: زێڕین.
زەلان: زریان، ڕەشەبا.
زەما: زاوا.
زەمین: زەوی.
زەهر: ژار.
زێد: شوێنی لەدایکبوون.
زێڵ: بەدڵ.

ژ

ژ: لە.
ژار: هەژار. زەهر
ژالە: دڵۆپی شەونم
ژە: هیوا.
ژەن: ژن.

س

سا: ئیتر.
ساتێ: کاتێ.
سالار: سەرۆک.
ساوا: کۆرپە.
سپەر: مەتاڵ.
ستار: ئەستێرە.
سرۆش: فریشتەی پەیامهێنەر.
سفتە: سووتاو.
سۆک: پەژارە.
سەرسپەردەی: سەرسپاردن.

سەرگەرد: بەلاگەردان.
سەنگ: بەرد.
سەوگەند: سوێند.
سیا: ڕەش.
سیموور: سیمرخ.
سێوەنگ: ڕەش.

ش

شا: پاشا.
شالیار: ڕێبەر و سەرۆکی شار.
شکار: ڕاو.
شمە: ئێوە.
شنەفتەی: بیستن.
شۆخی: گاڵتە.
شۆن: شوێن.
شەوەزەنگ: شەوی تاریک.
شیەی: چوون، ڕۆیشتن.

ف

فرە: زۆر.
فەڕ: شکۆ.
فەرد: هۆنراو.
فەرزەن: منداڵ.
فەرمای: فەرمان دان.
فەند: فێڵ.
فەنەر: چرا.
فێشتەر: زیاتر.

ق

قا: کات.
قار: ڕق، کین.
قاڵب. لەش.
قام: هەنگاو.
قەترانی: ڕەش
قەراڵ: پاشا.
قەوەران: هەرا، هەنگامە.

ک

کات: سات، وەخت
کام: هیوا، ئارەزوو.
کاو: ئەشکەوت، کێو- چیا
کناچە: کچ.
کۆ: کێو.
کۆتا: کورت.
کۆچ: قسە.
کۆداکۆ: ڕۆژی پەسڵان.
کۆسار: کوێستان.
کۆن: کێو.
کەردەی: کردن.
کەست: درێو، خراپ.
کێش: دین، ئاین.

گ

گا: کات. جار.
گاس: سروود.
گام: هەنگاو.
گران: بەنرخ، باییدار.
گردین: هەموویان.

گرەوای: گریان.
گلّکۆ: گۆڕ.
گنا: دێ.
گۆ: گێتی، جیهان.
گۆش: گوێ.
گۆشلێ: دێزە.
گونا: دێ، گوند.
گەدا: سواڵکەر.
گەرز: گورز.
گەزاف: قسەی پڕ و پووچ.
گێسوو: پەلکە.

ل

لاقۆزی: ناشیرین.
لامی: منداڵ.
لەنگ: لار، گێڕ.
لێوە: فێ لێ هاتوو.

م

ما: مانگ.
ماتاک: ماک، کەرەستە.
ماس: مانگ.
مانسر: فەرمانی خوایی.
مزگانی: مزگێنی.
مۆنگ: مانگ.
مەڕ: ئەشکەوت.
مەرز: سنوور.
مێرد: پیاو.
مێمان: مێوان.

ن

نادان: نەزان، گێل.
نام: ناو.
نامی: بەناوبانگ.
نما: نوێژ.
نمەز: نازانم
نۆ: نوێ
نە: لە.
نەخچیر: نەچیر.
نەووەهار: بەهاری نوێ.
نێوەک: چاک.

و

وا: با.
واتەی: وتن.
واران: باران.
وارگە: هەوارگە.
واس: گوڵە گەنم.
وانای: خوێندن.
وستەی: خستن
وەر: خۆر.
وەرب: بەفر.
وەرد: گوڵ.
وەرین: بەرین.
وەشی: خۆشی.
وەڵگ: گەڵا.
وەهار: بەهار.
ویر: بیر.

هـ

هاز: هێز.

هامتا: هاوتا.

هامڕا: هاوڕێ.

هامن: هاوین.

هانا: هاوار.

هۆشیار: وشیار.

هوون: خوێن.

هەرس: فرمێسک.

هەنگام: هەنگاو

هێمان: هێشتا.

ی

یاگە: جێ، جێگە.

یانە: ماڵ

یەرێ: سێ.

یەند: ئەوەندە.

# پێڕست